# كۆمەڵێك پەند و ئیدیۆمی كوردی

زەكیە رەشید محەمەد ئەمین

یۆمی كوردی
پەند و ئیدیۆمی ك

حکومەتی هەرێمی کوردستان

وەزارەتی رۆشنبیریی و لاوان

بەڕێوەبەرێتیی گشتیی رۆژنامەنووسیی و چاپ و بڵاوکردنەوە

بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

بەڕێوەبەرێتیی

چاپ و بڵاوکردنەوەی

سلێمانی

# کۆمەڵێک پەند و ئیدیۆمی کوردی


- ❖ نووسەر: زەکیە رەشید محەمەد ئەمین
- ❖ بابەت: کەلەپوور
- ❖ پیتچنی: سۆران عوسمان و رووپاک مەحمود
- ❖ هەڵەچنی: سۆران عوسمان
- ❖ نەخشەسازیی بەرگ: جەبار سابیر
- ❖ نەخشەسازیی ناوەوە: رووپاک مەحمود
- ❖ سەرپەرشتیاری چاپ: کارزان عەبدوڵلا
- ❖ قەبارەی کتێب: ٢/١ A٤
- ❖ زنجیرەی گشتیی کتێب: ( ٨١٣ )
- ❖ تیراژ : (٥٠٠) دانە
- ❖ [illegible] چاپخانەی لەریا
- ❖ [illegible]
- ❖ [illegible] 2000 (٢١٨٢)ی ساڵی ٢٠١١ی وەزارەتی رۆشـنبیریی و لاوانی دراوەتی.

**بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی**
**گردی ئەندازیاران- بەرامبەر کوردستانی نوێ**
**ژمارەی تەلەفۆن: ٣٣٠١٩٤٩**

گوڵ لەسەر لق ڕەنگینە
بەرد لە جێی خۆی سەنگینە

پەندی پێشینان دەگێڕێتەوە
گیا لەسەر بنجی خۆی دەڕوێتەوە

# پێشەکی

پەندو قسەی پێشینان لەقسەی بەهێزو ڕەوای بلیمەتانی هەموو میللەتێك سەرچاوەی گرتووە، لەڕووی فەلسەفەو ناوەڕۆکی زمانەوەو ئاسایی‌و ڕاستی‌و سروشتی گەلانەوە پێك هاتووە...
پەند کورتکردنەوەی چەندەها بیرۆکەیە کە مرۆڤ بلیمەتانە کورتیکردۆتەوە لەچەند ووشەیەکدا کاریگەری هەبێت بۆ تێگەیشتنێکی فراوانترو دووربینتر، یان جاروبار بەمانای چیرۆکێك دەوترێت دەربارەی ژیان لەڕووی کەوتن‌و سەرکەوتنەوەو گورجکردنەوەی مرۆڤ‌و ووریا بوونەوەی. باڵندەیان ئاژەڵ یان منداڵێك یان پیرێك یان ئەوانەی لەسروشتدان کراون بەنمونە.
پەندەکانی کورد بیروباوەڕو ناوەڕۆکی ڕوخساری کوردی تیایدا دیارە. پەندی پێشینان لەنەوەکانی زۆر کۆنەوە گواستراونەتەوە بۆ نەوەکانی داهاتووی نوێ بەهەمان ماناو دەق‌و سەنگ.... پەیوەندە بەڕاستی ژیانی کوردەواری‌و باو باپیرانەوە لەڕووی قسەی خۆش‌و نەستەق‌و ئامۆژگاری زانستیانەوەو هەندێکی تریشی سەرزەنشت‌و ڕێنماییە پڕە لەوانەی بەسود. هەندێکیشی شێوازی مەتەڵ‌و گاڵتەو گەپ‌و خۆشی‌و پێکەنینی وەرگرتووە.
بەڵام هەندێ لەشاعیرو پەندناسەکانی کورد، بۆ ئەوەی تامێك‌و لەزەتێك زیاتر بەدەن بە پەندەکان‌و زیاتر بە خۆشی‌و ئاوازی گۆرانییەوە بوترێتەوە، تێکەڵ بەهۆنراوەی جوانیان کردووە. بۆتە هۆی شێواندن‌و ڕاستی کۆنی پەندەکە. یان تێکەڵ بەقسەی سەر تەنوورو پەنا ئاگردنیان کردووە. ئەمەش کەمێك لەنرخ‌و هێزو هاوسەنگی بیرۆکە بنەڕەتیەکەی کەمکردۆتەوەو وونیکردووە. لەکۆندا ڕەنگە بەشاراوەیی تامیان لێ چێشت بێت و بەشەرمەوە لەبەینی خۆیاندا وترابێتەوە. بەڵام بۆ ئەم سەردەمە ناشێت‌و کەمتر دەگونجێت.
بەهۆی تەکنالۆجیای تازەوە هەمووشتێك ڕوو لەئاشکرابوونە بەڵام لەڕووی مانەوەی نەریتی نەتەوەیی‌و کلتوری‌و فولکلۆرەوەو زمانەوانیەوە پێویستە

ئەم هێزە فەلسەفیە ڕێکخراوە ناسراوە بمێنێتەوە هەتا هەتایە... لەبەر ئەوەی بەرهەمی هەزاران ساڵەو جێی شانازیو بوونی میللەتی کوردە لە کوردستاندا.

پەند بەزمانێکی سادەو پاراو پتەو ڕازێنراوەتەوە. شێوەی فراوانی ڕاستەقینەو ڕاستو دروستی گەلی وەرگرتووە لەهەموو زاراوەکانی کوردیدا.

پەندەکان بەپێی ژیانی ڕۆژانەوە هاتونەتە کایەوە، بەپێی ئەوەی مرۆڤ لەچاکەوخراپە دیتە بەردەمیان. بەپێی هونەری ڕۆژ دارێژراون، ئەمانە هەمووی ڕوخساری پەندەکان دەڕازێنێتەوە، زوربەی ئاڕاستەیەو زۆر کەمیان ناڕاستەوخۆیە.

پەندی پێشینان ئاوێنەیەکە بۆ دەرخستنو ڕوونکردنەوەی نەریتی نەتەوایەتیو ژیانی کۆمەڵایەتیو ڕووداوی مێژووییو ئابوورییو زۆرداری تاکەکانی خێزانو چینایەتی....و هەرپەندێك چیرۆکێكو وانەیەکی ڕاستە بۆ داهاتوومان.

پەندی پێشینان پێویستە وەکو پارچەگەوهەرێك بپارێزدرێتو وەکو ئامانەتێکیش بگوێزرێتەوە بۆ نەوەکانی داهاتووی نوێ وەکو خۆی، هەرچەندە هەندێ ووشە نامۆیە بەلای نەوەی تازەوە.

هەندێ پەندیش هەر لەناوچەی کوردوستانی گەورەدا ووتراوەو سەرچاوەی گرتووە بەڵام بەپێی زمانەوانی بەهەمان مانا ووتراوەتەوە بەپێی شوێنێکی تر.

# پیتی (ئا)

**ئاخوری خۆی لێ گۆڕاوە.**[1]
**ئاخوری پیری جۆ بە تیری.**[2]
**ئارامگرتن کلیلی دەرگای خۆشییە.**[3]
**ئارامگرتن چاکە هەرچەندە تاڵە.**[4]
**ئاردی بن درك کۆ نابێتەوە.**[5]
**ئادەم بە ئادەم دەگات، کێو بە کێو ناگات.**[6]
**ئاسمان کۆڵەکەی دەوێت.**[7]

---

(١) وا دەگەیەنێت پێشتر کەم دەست و نەدار بووە، کاتێك بۆتە خاوەنی دەوڵەت ڕۆژانی پێشووتری بیرچۆتەوە و کەشوفشی بەسەر خەڵکدا کردووە.
(٢) لە گەنجیما نەبوو نانی تیری و ناسك بیخۆم. ئێستاش جۆ ناکرێت بە نانی تیری و بیخۆم.
(٣) ئەو کەسانەی تەنگانە دەکێشێت زۆر ئارامگرن، خوا پاداشتیان دەداتەوە بە خۆشیەکی هەتا هەتایی. وەکو لە قورئاندا دەفەرمووێت: (ئارامگرن خوا لەگەڵ ئارامگرانە).
(٤) ئارامگرتن نیشانەی متمانە بە خۆ و پەنابردن بۆ خوایە. ئەوەی تاڵیی ئارامگرتن دەچێژێت. لە ناخی خۆیدا بەرگریی دەکات، سەرکەوتوو دەبێت.
(٥) واتە قسەی باش بکە، با پادداشتەکەی هەڵگریتەوە و بە با نەچێت.
(٦) مرۆڤ پێویستە ئاگاداری زمانی خۆی و کردەوەکانی بێت، مرۆڤ نەمرێت بەیەك دەگەنەوە. قسەکە دەدەنەوە بە ڕووی یەکتردا.
(٧) بەو کەسانە وتراوە کە بە درێژایی تەمەنیان نەیان توانیوە چاکە بکەن و ئەگەر بۆ جارێك چاکەیەکیان کردبێت جێی سەرسووڕمان بووە.

**ئاسمان دووره و زەوی سەخت.**[٨]
**ئاسمان لەبەر چاوم تاریك دەنوێنێت.**[٩]
**ئاسنی سارد دەكوتێت.**[١٠]
**ئاسنی سارد بە فوو نەرم نابێت.**[١١]
**ئاسنی سارد مەكوتە.**[١٢]
**ئاش لە خەیاڵێك و ئاشەوان لە خەیاڵێك.**[١٣]
**ئاشێك لە میز بێت هەر دەمیزێت.**[١٤]
**ئاشی نەزان خوا دەیگێڕێت.**[١٥]
**ئاشكە لە خۆی بە شكە.**[١٦]

---

(٨) بەو كەسانە دەوترێت لە گرفت و قورسایی ژیان ڕزگاریان نابێت نە، زەوی قووتیان دەدات نە، ئاسمان هەڵیان دەگرێت.
(٩) واتە هیچ هیوایەكی نییە بە ژیان.
(١٠) ڕەنجی بێ هودە و بێ بەها دەدات كەس حیسابی بۆ نەكردووە.
(١١) هەموو كارێك بەبێ ڕەنج و بەرنامە ئەنجامی نییە.
(١٢) بە خۆڕایی خۆت هیلاك مەكە.
(١٣) واتە ئەو بەرنامەیەی ئاشەوان بۆی داناوە. ئاشەكەی بۆی هەڵناسوورێنێت.
(١٤) كەسێك نیازی كارێكی خراپی هەبێت بیكات، هەزار بەربەست ڕێی پێ ناگرێت.
(١٥) بەو كەسانە دەوترێت شوێن و كاری باشیان هەیە هیچ نازانن و كەم شارەزان و چاكیش كاریان ڕۆیشتووە.
(١٦) كاتێك لە هەر شوێنێك باشی ئاشك بكرێت هەست بەوە دەكات تەنها باسی ئەوە.

**ئاشتیی دوای شەڕ خۆشە.** (١٧)
**ئاغا رۆ و خوا شوکر.** (١٨)
**ئافرەت کۆڵەکەی ماڵە.** (١٩)
**ئاگر لە کای کۆن بەر نەبێت.** (٢٠)
**ئاگر کەوتەوە، تەڕ و وشك دەسووتێت.** (٢١)
**ئاگر لە چاوی دەبارێت.** (٢٢)
**ئاگر لەسەر پشتی گا دەکاتەوە.** (٢٣)
**ئاگای لە خشەی مار و مێرووە.** (٢٤)
**ئاگای لە مەحموی بێزەوا نییە.** (٢٥)
**ئاگری پێوەنێیت بۆسۆی لێ هەڵناسێت** (٢٦)

---

(١٧) دوای شەڕ و تێکچوون ئاشتبوونەوە و تەبایی تامی خۆشی هەیە.
(١٨) واتە ئاغا کە زۆردار بوو، بۆیە دەست و پێوەندەکەی بە مردنی سوپاسی خوایان کردووە.
(١٩) واتە ژن ڕاگری ڕاستەقینەی ماڵە.
(٢٠) ئەمە بە عاشقێك یان کەسێك تامەزرۆ بێت بە ئاواتێکەوە بەخۆشی و بە گورجی بە پیریەوە بچێت.
(٢١) شەڕ و ئاژاوە کەوتەوە لە هەر شوێنێکەوە چاك و خراپ تێوە دەگلێن.
(٢٢) بەو کەسانە دەوترێت کە زۆر توورە و شەڕانین بە کەس دابین نابن.
(٢٣) بەو کەسانە دەوترێت شەڕەنگێز و دەمارگیرن گوێ لە کەس ناگرن.
(٢٤) بەو کەسانە دەوترێت زۆر وریا و هەستیار و تاقیبکەرن.
(٢٥) واتە ئەوانەن خۆیان لاخستووە لە شەڕ و ئاشتیی و چاك و خراپ.
(٢٦) واتە ئەوەندە جلەکانی چڵکن و پیس و شڕە بسووتێت بۆسۆی لێهەڵناسێت.

ئاگرە سووریّ لە خۆم دووریّ.[27]
ئاگرو ئاو ئامانیان نییە.[28]
ئالیاوەی لێوە دیارە.[29]
ئاڵتون لە قورا دیارە.[30]
ئاو لە لێژیدا ناوەستێت.[31]
ئاو بێنە و دەست بشۆ.[32]
ئاو کرا بە ئاگرا.[33]
ئاو بە بێژنگ دەهێنێت.[34]
ئا و و ئاوەدانیان وتووە.[35]

---

(٢٧) واتە هەرچی ئاژاوە و شەڕێك ڕوو بدات خۆی لێ دوور دەگرێت.
(٢٨) مرۆڤ پێویستە لە ئاگر و ئاو بترسێت و خۆی بپارێزێت.
(٢٩) بە کەسێك دەوترێت برسی و هەژار و بێکارە بێت، (تێبینیی ئالیاوە دێیە).
(٣٠) شتی بەنرخ و مرۆڤی چاك و ئیشکەر لەناو قوڕیشا نرخی دانابەزێت.
(٣١) بە کەسێك دەوترێت بە درێژایی تەمەنی ڕێچکەی خۆی گرتبێت بە هیچ کەس نەگۆڕێت.
(٣٢) واتە زەرەرمەندێکی هەتا هەتاییە. هیچی لە دەستا نەماوە.
(٣٣) چارە سەر و نەهێشتنی گرفتێکی گەورە.
(٣٤) واتە کارێکی ناپەسند و نەشیاو دەکات.
(٣٥) واتە ئەوەی خواردنی چەور و چاك بخوات. دەبێت ئاوی بەسەردا کات یان شوێنێك ئاوی لیّ بێت دەبێت ئاوەدانیشی تێدا بێت.

**ئاو بتبات لە پردی نامەرد مەپەڕەوە.**(٣٦)
**ئاو لە سەرچاوەوە لیڵە.**(٣٧)
**ئاوی بێلغاو دەخواتەوە.**(٣٨)
**ئاوی ڕژاو گرد ناکرێتەوە.**(٣٩)
**ئاوی سوێر تونیێتیی ناشکێنێت.**(٤٠)
**ئاوی کردە ژێر.**(٤١)
**ئاوێکی خراپ ڕێژراوە.**(٤٢)
**ئاوی شیرین لە گلی سوێر دەرناچێت.**(٤٣)
**ئاو بە دەستی خۆت نەخۆیتەوە تینوێتیت ناشکێت.**(٤٤)

---

(٣٦) مردن هەر جارێکە با مرۆڤ بە مەردیی بمرێت، نەك پەنا بەرێت بۆ نامەرد هەموو ڕۆژێکی مردنێك بێت.
(٣٧) بەکارێك یان کەسێك دەوترێت لە سەرەتایەوە چاك نەبووبێت.
(٣٨) بە کەسێك دەوترێت کارێکی سەربەخۆ بەبێ ترس و پرسیار بکات.
(٣٩) بەکارێك دەوترێت پێشتر ڕووی دابێت و لەدەست دەرچووبێت و بەسەر چووبێت، لە توانای کەسدا نەمابێت چارەسەری بکات.
(٤٠) واتە کەسی خراپ سوودی بۆ کەس نابێت و خێرناداتەوە.
(٤١) واتە جێی پێ لەق کرد و سەری لێشێواند.
(٤٢) واتە کار و کردەوەیەکی ناپەسەند بۆتە باو.
(٤٣) نەوە و وەچەی چاك لە دایك و باوکی خراپ بەرهەم نایەت.
(٤٤) هەموو کەس ئەگەر ڕەنج بە دەستی خۆی نەدات سوودمەند نابێت و قەدری نازانێت.

ئاوی خوڕ، زەوی دڕ.[٤٥]
ئاوی زاڵم سەرەو ژوور دەڕوات.[٤٦]
ئاوی ئامون و توونی بابا چێت.[٤٧]
ئەزم هەڵدەبەزم.[٤٨]
ئەسپێکی لەڕ، نەک تەویلەیەکی پڕ لە کەڕ.[٤٩]
ئەسپی چاك خۆی ئالیك بۆ خۆی زیاد دەكات.[٥٠]
ئەسل بێنە و لەسەر حەسیر بینوێنە.[٥١]

---

(٤٥) ئەگەر ڕەنجێك بە متمانە و ئازایانە بکرێت ئەنجامی دیارە و دیاریکراو دەبێت.
(٤٦) واتە کاری مرۆڤی خراپ و دژ بە سروشتی مرۆڤایەتی نەنگە و سەر ناگرێت.
(٤٧) بە کەسێك دەوترێت بڕوات و نەگەڕێتەوە و بمرێت یان سەردەرنەکاتەوە لە پێچەکانی (توونی بابا و ئاوی ئامون، کە کەوتۆتە لای دەربەندیخانەوە).
(٤٨) بەو کەسە دەوترێت بە جۆرێك بۆی هاتووە لە ژیانیدا و بۆی ڕەخساوە، جێی سەرسوورمانە بۆ خۆشی.
(٤٩) واتە شتێکی باش و بەسوود زۆر باشترە لە کۆمەڵێك شتی خراپ و بێ کەڵك. یان هاوڕێیەکی باش چاکترە لە سەد هاوڕێی بەدخۆ
(٥٠) مرۆڤی چاك خۆی شانس و بەخت بۆ خۆی پەیدا دەكات کە هەموو کەس خزمەتی بکات و بەتەنگ دڵیەوە بێت.
(٥١) واتەکچی ماڵی ئەسڵزادە ئەوەندە تێر و پڕ بووە لە ماڵی باوکی، ڕازییە بەو بەشەی لە ماڵە مێردا هەیەتی.

ئەسپێ لە باخەڵیا سەوزەڵە گیانم دەڵێت.[٥٢]
ئەڵقە لە گوێیە.[٥٣]
ئەمرۆ بە حازر، سبەینێ بە قەرز.[٥٤]
ئەم هەویرە ئاو زۆر دەکێشێت.[٥٥]
ئەم نانە بەو رۆنە.[٥٦]
ئەم کەرە لەو قوڕە دەربێنە.[٥٧]
ئەم قسەیە بەم گڵا بچێتە خوارەوە.[٥٨]
ئەم قسەیە بەینی خۆمان بێت.[٥٩]
ئەم لای داوە بەولایا، گووی دا بە هەردوولایا.[٦٠]

---

(٥٢) بەو کەسانە دەوترێت ددست سپین و ئیش ناکەن ژیانیان پێشخەن بەڵام خۆهەڵکێشن و داوای زۆر دەکەن.
(٥٣) بەو کەسانە دەوترێت هونەری خۆیان بەکار ناهێنن بۆ کارەکانیان قسەکانی راسپاردەکەیان بەکار دێنن.
(٥٤) ئەمرۆ فرۆشتنەکە بە حازر بێت. ئیتر بۆچییەتی قەرز بۆ سبەینێ.
(٥٥) واتە ئەم قسانە پێویستی بە بیرکردنەوە هەیە و ئاسان نییە.
(٥٦) کە وا بێ هەموو شتێك بەرامبەر و حەق بە حەق باشە.
(٥٧) کەواتە ئەم کارە بۆتە گرفت و ئاسان نییە و پێویستی بە بیرکردنەوە و هیلاکییە بۆ چارەسەرکردنی.
(٥٨) واتە دوو کەس بە متمانە قسە بۆ یەك دەکەن. نایانەوێت دەرچێت لە بەینیانا، وا دیارە خەتەرناکیی نیشان دەدات.
(٥٩) واتە ئەو قسەیە پەیوەندیی تەنها بە هەردووکیانەوە هەیە بۆ چارەسەرکردنی گومانێك یارمەتیی یەکتر بدەن.
(٦٠) گوایە کارو کردەوەکانی هیچی بە کەڵك نایەت و سوودبەخش نییە بۆ هیچ لایەك.

ئەم کاسەیە بێ ژێر کاسە نییە.[٦١]
ئەم ترەکەڵە کێیە سەر ناگرێت.[٦٢]
ئەمە ئەرز و ئەوە گەز.[٦٣]
ئەمە ملی من و چەقۆی تۆ.[٦٤]
ئەمە ترێکی هەر پێیە.[٦٥]
ئەم دەست و ئەو دەستم پێ مەکە.[٦٦]
ئەمڕۆ دنیایە و سبەینێ قیامەت.[٦٧]
ئەمە برای خاسە، دە هەر مەیناسە.[٦٨]

---

(٦١) بەو مانایە دەوترێت کە ئەم قسەیە لە خۆیەوە نەهاتۆتەکایەوە و بێ بنەما نییە. دەبێت پێشتر شتی دیکە هەبوو بێت و رووی دابێت.
(٦٢) هەموو شتێکی بێ بەرنامە و هەڵەشە و پەڵەشە سەر ناگرێت.
(٦٣) بە مانای ئەو کەسە بابێتە پێشەوە بە ڕاشکاویی بەرەو ڕوویان بەرامبەر و ڕووبەڕوو قسە بکات.
(٦٤) بە مانای تاوانبار یان خەتاکار هاتووە بۆ لێبوردن لە بەرامبەرەکەی کە بە هەموو شت و بڕیارێك ڕازییە بەو مەرجەی لێی خۆش بێت.
(٦٥) واتە ئەو کەسەی هاتووە بۆ لای کەسێك، کردەوەی سروشتی نییە، دیارە شتێکی لە دڵدایە و دەیەوێت بیلێت بەڵام بەبێ دەنگ خۆی نیشان دەدات.
(٦٦) واتە بەرامبەرم ڕاشکاو بەو کارەکە مەکە بەگرێکوێرە و دووری مەخەرەوە.
(٦٧) واتە ئەمڕۆ لە دنیادا زمان پاراوە و فڕان فڕانە بەڵام بێ سوودە چونکە مردن هەیە.
(٦٨) واتە لەو کۆمەڵە برایە ئەوەیان باش خۆی دەردەخات. ئینجا لە هەموویان خراپترە.

**ئەمە خوێی چێشتە لە چاویدا(٦٩)**
**ئەمجارەش تەنگە گرتی.(٧٠)**
**ئۆخەی، ئۆخەی، هەر کەس بۆ خۆی.(٧١)**
**ئۆخەی لە خۆم بەیانیی جەژنە و تێر پلاو دەخۆم.(٧٢)**
**ئەگەر بە ماڵی بە مام و خاڵی.(٧٣)**
**ئەگەر موو بە بەخت دەبوو، بزن لەسەر تەخت دەبوو.(٧٤)**
**ئەگەر کەرین سەربەسەرین، ئەگەر ئێسترین بەرامبەرین.(٧٥)**
**ئەگەر سەگ نەبێت گورگ، گورگ دەتخوات.(٧٦)**

---

(٦٩) واتە ئەو کار و مامەڵە و ئازارە زۆر لەمەش زیاترە. زوو دەستی لێ هەڵگرێت باشترە.
(٧٠) واتە ئەمجارەش کارەکەی پێخۆش نەبوو مانگرتن و بێدەنگیی گرتی.
(٧١) بەو کەسانە دەوترێت کە خێر و خۆشیان بۆ کەس ناوێت تەنها بۆ خۆیان دەوێت. ڕەنجیشیان دەرخواردی کەس نادەن.
(٧٢) بەو کەسانە دەوترێت زۆر نەدارن چاوەڕوانیی ڕۆژێك دەکەن بە ئاواتی خۆیان بگەن، هەژارن لە ماڵانەوە چێشتی باشیان بۆ دێت. لە جەژندا.
(٧٣) وا دەگەیەنێت ئەگەر مرۆڤ ماڵ و حاڵی خۆش و سامانی هەبێت هەموو کەسێك سەردانی دەکات و خۆی بە کەسی ئەو دەزانێت و شانازیی پێوە دەکات.
(٧٤)مرۆڤ بەکارو کردەوەکانی دەناسرێت نەك بە جلو بەرگ و ڕووکەش.
(٧٥) ئەگەر کار و کردەوە و کەسایەتیمان هاوسەنگە وەکو یەك قورسین. ئەگەر نا ئەسڵ و بێ بنەماین ئەوا وەك یەکین.
(٧٦) واتە ئەگەر ئازا و بە جەرگ نەبێت، زاڵم دەتگورێت و پێستت لێ دەکاتەوە

**ئەگەر باپە و ئەگەر بۆرانە، بۆ بەفر زریانە.(٧٧)**
**ئەگەر گولنیت، درکیش مەبە.(٧٨)**
**ئەگەر شەڕ دەرگام پێ بگرێت، ئەگەر نەیکەم خوا دەمگرێت.(٧٩)**
**ئەگەر جەسوورین دەبا ببورین.(٨٠)**
**ئەگەر درۆ ناکەیت بۆ سوێند دەخۆیت.(٨١)**
**ئەگەر قسەکردن زیو بێت، بێدەنگیی ئاڵتونە.(٨٢)**
**ئەگەر بە دوعا دەبوو، پشقل بە خورما دەبوو.(٨٣)**
**ئەگەریان چاند سەوز نەبوو.(٨٤)**

---

(٧٧) کەسێك دەیڵێت لە هەموو لایەنێکەوە و لە هەموو سەرێکەوە سوودمەند نەبێت هەر زەرەری بەربکەوێت.
(٧٨) واتە ئەگەر وەکو گوڵ بۆن و جوانیت نییە و سوود بەخشنیت مەبە بە زەرەر و درك بۆ هەنگاو و پێی خەڵکیی.
(٧٩) بۆ ئەو کەسانەیە حەز و نیازیان لەگەڵ شەڕدا نییە. بەڵام جاروبار دەرگاشیان دەگرێت و دەبێت بە تووشیانەوە و دەبێت بیکەن.
(٨٠) لێبوردن لە ئازایەتی و دڵ گەورەیی و متمانە بەخۆوەیە.
(٨١) واتە پێویست ناکات کەس سوێند بخوات ئەگەر ڕاستگۆ و بێ خەتابێت کەواتە بۆ ئەوەی بڕوای پێ بکەن بەو سوێندە بەرگریی لە خۆی دەکات.
(٨٢) کەواتە بێدەنگیی سەروەری ڕەوشتە. لە ئاڵتون بە نرخترە.
(٨٣) بەبێ کارکردن و هیلاکیی، بە دانیشتن و دوعا کەس کاری مەیسەر نابێ.
(٨٤) مرۆڤ چوار مشقی دانیشت بە ئەگەر هیچ شتێك سەر ناگرێت.

ئەگەر نەمدیایە باوکی، دەمردم لە عەزرەت دایکی.[٨٥]
ئەگەر بەخت بە مووی دەبوو کەچەڵ بەد بەخت دەبوو.[٨٦]
ئەگەر بتەوێت خەڵکیی بشکێنیت، تۆش لە حورمەتی خۆتا نامێنیت.[٨٧]
ئەگەر پیاوەتی بەڕیش بووایە، بزن لە هەموو کەس پیاوتر دەبوو.[٨٨]
ئەگەر دڵۆپێك ئاو دەوام بکات، بەردەمی تەواو کون دەکات.[٨٩]
ئەگەر نانت جۆ بێت، با خوڵقت گەنم بێت.[٩٠]
ئەگەر زانی ئەزم ئەگەر نەیزانی دزم.[٩١]

---

(٨٥) واتە خۆهەڵکێشان بە باوکەوە زۆر پەسەند نییە با ئەو کەسە خۆی هەموو خەسڵەتێکی چاکی تیابێت، بە کردەوە خەڵکیی بیبینێت و بیناسێت.
(٨٦) کە خوا بەختی دا، بەرگ و موو ڕووکەش و عەقڵ دەور نابینێت.
(٨٧) واتە پێویستە بە چاوی ڕێزەوە دەستی خێرت هەبێت بۆ هەموو کەس. بۆ ئەوەی بەرامبەرەکەشت وابێت بۆ تۆ (هەموو کەس بەشی خۆی ڕێز و حورمەتی هەیە).
(٨٨) واتە پیاوەتی کار و کردەوەی باشە، نەك ڕیش و عەبا و چەفتە.
(٨٩) ئەگەر هەموو کەس بەردەوام بێت لە کارەکەیدا بە ئامانجی خۆی دەگات و ئەنجامی باشی دەبێت.
(٩٠) واتە با زۆر دەوڵەمەند نەبیت بەڵام خوڵق و هاوڕێیەتیت ڕاست و گەرموگوڕ بێت، بەرامبەرەکەت ڕازیی بکە.
(٩١) ئەگەر کەسێك ویستی کارێکی خراپ بە دزییەوە ئەنجام بدات، تیایدا سەرکەوتوو بوو خۆی بە ئازا دەزانێت. ئەگەر زانرا تیادەچێت و دەشکێت.

**ئەگەر زاڵ نەبیت، بەسەزمان دەبیت.[٩٢]**
**ئەگەر خەوچاك دەبوو كەرویشك بە گا دەبوو.[٩٣]**
**ئەگەر لە جافان یەكێك بمێنێت، مافی بەر و دوا لە گشت دەسێنێت.[٩٤]**
**ئەگەر دەمزانی كەی دەمردم، خانەی ئاوەدان وێران دەكردم.[٩٥]**
**ئەگەر شا بێت یان شالیار، لای خوایە بەختی نادیار.[٩٦]**
**ئەگەر بڵێیت هەمووی دەخۆم، دواییش دەڵێیت چیم كرد بە خۆم.(٩٧)**
**ئەو كەسە كەسە، ئەلفێكی بەسە.[٩٨]**
**ئەو كانییەی ئاوی لێ دەخۆیتەوە، بەردی تێ فڕێ مەدە.[٩٩]**

---

(٩٢) من دەڵێم نەزاڵ و زاڵم نە، ژێردەستە و بەسەزمان.

(٩٣) واتە خەوی زۆر و تەمەڵیی پەسەند نییە، چونكە مرۆڤ قەڵەو و تەپلۆس دەكات.

(٩٤) واتە ماف هەر مافە و موقەدەسە، كۆن دەبێت نافەوتێت.

(٩٥) واتە مردن لای خوایە ئەگەر هەركەسێك بیزانیایە كەی دەمرێت ئەوەندە خۆی هیلاك نەدەكرد و ڕەنجی نەدەدا... هتد.

(٩٦) مرۆڤ ئەگەر پایەی بەرز بێت یان نزم، بەخت و شانسی لای خوایە نادیارە.

(٩٧) كە وا بێ مرۆڤ ئەوەندە بە تەماع نەبێت هەموو شتێكی بۆ خۆی بووێت چونكە دوایی پێی هەڵ ناگیرێت. دەبێتە خەم و پەژارە و هیلاكیی.

(٩٨) بۆ ئەو كەسانە دەوترێت بە هێمایەك بە ئیشارەتێك تێ بگەن لە چاكە و خراپە.

(٩٩) بە كەسێك دەوترێت كە سوودمەند بوو لە شتێك با كەسێك نرخی ئەو شتە بزانێت یان بەوەفا بێت بۆ ئەو كەسە قەدری بزانێت و لەملاولا قسەی پێ نەڵێت.

**ئەو خورمایەی تۆ خواردووتە، دەنکەکەی لە گیرفانی مندایە.**[١٠٠]
**ئەو ژن و پیاوە گلیان لە یەك گلێنجە هەلگیراوە.**[١٠١]
**ئەو چاوە کوێر بێت خەنیمی خۆی نەناسێت**[١٠٢]
**ئەو ماستە موویەکی تیایە**[١٠٣]
**ئەو ژنە ژنە شلقەی نان و چزەی تاوەی بێت**[١٠٤]
**ئەو شوێنەی زەوی لێیە، ئاوی لێ نییە.**[١٠٥]

---

(١٠٠) واتە ئەو کارەی تۆ کردووتە، من دەمێکە کردوومە و لێ بوومەتەوە یان ئەو زانیارییە زیاتر لای منە.
(١٠١) واتە ژن و پیاو کە دەبنە نسیبی یەکتر لە رووی سروشتیانەوە خوا وەك یەك دروستی کردوون. بۆ یەکی دروست کردوون.
(١٠٢) ئەمە بۆ ئەو کەسانەیە هاورێیەتی و دۆستایەتی و خزمایەتیان لەگەل دەبەستن، هیچ شارەزایشیان لێوەی نییە، دوایش زەرەرمەند دەبن.
(١٠٣) بۆ کارێك دەوترێت بە مەرامێك بکرێت و بۆ مەبەستێکی شاراوە کە بەرامبەرەکەی هەستی پێ نەکات
(١٠٤) لە کۆندا هیچ ئامێرێکی سارد کەرەوە نەبوو (سەلاجە) هەموو مالێك بەشی خۆی مەرو بزنی هەبووە سوودیان لە شیر و کەرکە وەرگرتووە رۆژانە دەبوایە ئەو کەرەیە بکرایە بەنار ساجی. ئینجا ژنی ئازا رۆژانە کردویەتی و دەرخواردی دەور و دراوسێی داوە یا هەژاری پێ تێر کردووە.
(١٠٥) زەوی بێ ئاو و بەیارە بەبێ سوود وازیان لێ هێناوە، ئاویش لە شوێنی بەرد و سەختا بە فیرۆ دەروات. وەکو دووکەسی باش واتە کە یەکنەکەون یان دوو کەس یەکێکیان باش و یەکێکیان خراپ ئەو کاری چاکەی تەواوی تیادا مەیسەر نابێت.

**ئەو زاوایەی خەسوو خۆشی بویێت بەختەوەرە.[106]**
**ئەو دەستەی نەتوانیت بیبریت، دەبێت ماچی بکەیت.[107]**
**ئەو جێیە خۆشە دڵ لێی خۆشبێت.[108]**
**ئەو نانە نانە، ئەمرۆ لە خوانە.[109]**
**ئەو سوارە و من پیادە.[110]**
**ئەو چاوە کوێر بێت، دوژمنی خۆی ناناسێت.[111]**
**ئەو کاروانچی و من خانجی[112]**
**ئەو خەوەی دیت، نایبینیتەوە.[113]**

---

(١٠٦) واتە ئەو زاوایە خەسووی هیچ ئاژاوە ناخاتە ماڵی.
(١٠٧) بۆ ئەو کەسانەیە کەس دەسەڵاتی نییە بەسەریاندا، دەبێت بیانپەرستی و دەستەوئەژنۆ کڕنووشیان بۆ بەریت.
(١٠٨) مرۆڤ لە جێی خۆشدا دڵخۆش دەبێت و گوزەران دەکات و نیشتەجێ دەبێت.
(١٠٩) واتە هەموو کەسێك ئەو ڕۆژ برازێنێتەوە خۆشی بکات و ڕەنجی بۆ بدات کە تیایدا دەژی، نەك باسی بوونی کۆن بکات.
(١١٠) بە دوو کەس دەوترێت پێویستیان بەیەکە و بەیەك ناگەن.
(١١١) واتە ئەوەی دۆست و دوژمنی خۆی لەیەك جیانەکاتەوە چاوی بۆ چییە.
(١١٢) من خانەخوێم و تۆ میوان دەبێت بە قسەم بکەیت و ڕازیی بیت بە خواردنەکەم.
(١١٣) بەو کەسانە دەوترێت شتێکی چاکیان پێشتر بۆ ڕەخسا بوو و قەدریان نەزانیوە جارێکی دیکە ڕێ ناکەوێتەوە بۆیان.

**ئەو دەستە بخەرە ژێر سەرت.**[١١٤]
**ئەوە گۆرت بێت.**[١١٥]
**ئەوەی بچێتە شاری کوێران، دەبێت دەست بە چاویەوە بگرێت.**[١١٦]
**ئەوەی لە تۆ دوورە رەنگی سوورە.**[١١٧]
**ئەوەی بکات بێگانە پەرستیی، هەر دەهێنێت نوشستیی.**[١١٨]
**ئەوەی لای بەندە خەیالە، لای خوا بە تالە.**[١١٩]
**ئەوەی غافلە کافرە.**[١٢٠]
**ئەوەی لەبەر چاوانە، لەبەر دڵانە.**[١٢١]

---

(١١٤) واتە دڵنیا بە ئەوەی دەتەوێت نایبینیتەوە.
(١١٥) بە کەسێك دەوترێت هەڵەیەکی گەورەی کرد بێت تێکەوت بێت بواری دەرهێنانەوەی نەما بێت.
(١١٦) کەواتە بچیتە هەرچی شوێن و شارێك دەبێت وەکو ئەوان مامەڵە بکەیت.
(١١٧) واتە ئەوەی لە خراپەکار دوورە. دڵنیایە و خۆش دەژی.
(١١٨) مرۆڤ نابێت لە هاودەم و هاوڵاتی خۆی لابدات، بێگانە بۆ مەرامە تا سەر نییە و کە پچڕان لە یەکتر هیچیان لە هیچ.
(١١٩) بەندە بە خەیاڵ زۆر شت دەکات، بەڵام هەموو کار و نسیبێك لای خوایە.
(١٢٠) ئەوەی بیر لە کاری خوا نەکاتەوە کافرە.
(١٢١) واتە ئەوەی زیاتر مامەڵەی لەگەڵ دەکەیت، زیاتر لێی تێ دەگەیت و زۆرتر رادێیت لەگەڵیا بەتەنگ یەکەوە دێن و خۆشەویستترە.

**ئەوەی دۆست دەیکات، برا بۆت ناکات.** (۱۲۲)
**ئەوەی بە خۆیا هەڵ بات درۆزنە.** (۱۲۳)
**ئەوەی بە کەم رازی نەبێت، بە زۆریش لالووتە.** (۱۲٤)
**ئەوەی چل رۆژ تێکەڵاوی قەومێکی کرد، دەبێتە یەکێك لەوان.** (۱۲۵)
**ئەوەی هاورێیەتی بگرێت، رەنگی نەگرێت خوی دەگرێت.** (۱۲٦)
**ئەوەی یاری بە ئاگر بکات، پریشکی بەردەکەوێت.** (۱۲۷)
**ئەوەی لە دەست چوو، ناگەڕێتەوە.** (۱۲۸)
**ئەوەی بە دەعیە بەرز دەبێتەوە، وەکو شۆڕەبی دەنەوێتەوە.** (۱۲۹)
**ئەوەی دوورە رەنگی سوورە.** (۱۳۰)

---

(۱۲۲) جاروبار لە رێگای متمانە و دۆستایەتییەوە زۆر خێرت دێتە دەست وەك لە رێگای کەسایەتی و برایەتی.
(۱۲۳) واتە ئەوەی بە خۆیا هەڵ بدات هەست بە کەموکورتیی و هیچ لە دەست نەهاتووی دەکات، بە خۆهەڵکێشان خەڵکیی رادەکێشێت بە لای خۆیدا.
(۱۲٤) ئەوەی کەم قەناعەت بێت. مەگەر خۆڵ چاوی پڕ بکاتەوە.
(۱۲۵) ئەوەی چل رۆژ تێکەڵ بە هەر کۆمەڵێك بێت وەکو ئەوانی لێ دێت.
(۱۲٦) بەو کەسە دەوترێت بۆ ماوەیەکی زۆر هاورێی کەسێك بێت رەنگی ناگرێت بەڵام خۆی دەگرێت.
(۱۲۷) ئەوەی تێکەڵ بە خراپەکاران بێت. زەرەرمەند دەبێت.
(۱۲۸) واتە ئەوەی لە دەستت دەچێت لە کیست دەچێت و ناگەڕێتەوە.
(۱۲۹) ئەوەی خۆی بە زیاتر بزانێت و شانازیی بە خۆیەوە بکات دوایی ملشۆڕ و چاوشۆڕ دەبێت لە ئاستی هەموو کەسێك.
(۱۳۰) ئەوەی خۆی دوور دەگرێت سەری سووکە و بێ بەڵایە.

**ئەوەی بە نرخە لیّم مەکەن لۆمە! شەراب و ژن و حەمامی کۆنە.**(١٣١)
**ئەوەی کراسێك بدرێت بە پیسیی، هەزار بدرێت بە پاکیی هەر پیسە.**(١٣٢)
**ئەوەی لە مشك بێت جەواڵ دەدرێت.**(١٣٣)
**ئەوەی بەخت نەهێنێت، شێر بە گوێ بگرێت نانوێنێت.**(١٣٤)
**ئەوەی بترسێ ناخەلسێ.**(١٣٥)
**ئەوەی من پێم دەکرد خێر، لێم بووە بە گورگ و شێر.**(١٣٦)

---

(١٣١) لە کۆنەوە سێ شتیان داناوە و لێی حەساونەتەوە شەرابی کۆن. حەمامی کۆن. یەکەم ژنی پیاو.
(١٣٢) مرۆڤ ئەگەر لە هەموو ژیانیا یەکجار کارێکی خراپ بکات، بەسەریا دەسەپێت و ناوی ناشیرینی پێ دەردەکات. با هەزار جاریش کاری باش بکات بە هیچ ناچێت بە خراپەکەوە ناو دەردەکات.
(١٣٣) کە وا بێ هیچ کەس ئەسڵی خۆی ون ناکات لەسەر کار و کردەوەی باو و باپیرانی دەڕوات. ئەگەر زەرەرمەند بووین یان خێر.
(١٣٤) کە وا بێ شانس و بەخت نادیارە لای خوای گەورەیە. ئەگەر خوا دیاری نەکات بۆت. کار و هیلاکیت بەهەند ناگیرێت لای کەس.
(١٣٥) واتە ئەوەی لە کارێك بترسێت و ڕاڕا بێت و ئازایانە نەچێتە پێشەوە سەرکەوتوو نابێت و دەنەوێت.
(١٣٦) واتە ئەو کەسەی دڵم بۆی دەسووتا و یارمەتیم دەدا. ئەمڕۆ دەسەڵاتی هەیە و دەمترسێنێت و سنگم لێ دەردەپەڕێنێت

**ئەوەی زۆر بخوات زۆر ناژیت.**(١٣٧)
**ئەوەی بەرز بفریێت، نزم دەنیشێتەوە.**(١٣٨)
**ئەوەی بە بێوەژنیی دەیکەیت، بە کچێتیی بتکردایە.**(١٣٩)
**ئەوەی دەیدەی بە کرێ، بیدە بە ترێ.**(١٤٠)
**ئەوەی نەبینیێت ماڵم، نازانیێت بە حاڵم.**(١٤١)
**ئەوەی بۆ ئەو لوواوە، بۆ بزنی دیلێژە نەلواوە.**(١٤٢)
**ئەوەی مێرد نەیکات خەرۆ، بەکەس نابێت ترۆ.**(١٤٣)
**ئەوەی چاوەڕوانی دراوسێ بێت، دەبێت بەبێ شێو سەربنێتەوە.**(١٤٤)

---

(١٣٧) ئەو کەسەی زۆر خۆر بێت زەرەرمەند دەبێت و نەخۆش دەکەوێت و زۆر ناژی، کە وابێ کەمخۆری دایم خۆربە.
(١٣٨) واتە بەرزفڕین و خۆبەشتزانین نەنگە لە مرۆڤدا، چونکە هەموومان مردنمان لە ناوچەوان نووسراوە.
(١٣٩) کەواتە زۆر کار و کردەوە هەیە، زووتر لە خاڵی هێزەوە بکرێت، نەك دوای کەوتن و بەسەرچوونی کات و تەمەن.
(١٤٠) واتە ئەو ڕەنجەی بۆ خەڵکە و بە فیڕۆ دەڕوات با سوودی بۆ خۆت بێت.
(١٤١) ئەو کەسەی لە نزیکەوە شارەزا نەبێت بە حاڵی کەس نازانێت.
(١٤٢) واتە هەندێك کەس کار و ژیانی زۆر ئاسان بۆ ڕەخساوە. کارەکەی زۆر بە ئاسانیی دەڕوات و لێژ دەبێتەوە، پێویستیی بە هەنگاو و هیلاکیی نییە.
(١٤٣) واتە مێرد جێی متمانە و نزیکترین کەسە لە ژنەوە و شارەزاترە بۆی، ئەگەر درۆ و بوختانیش بۆ ژنەکەی بکات. بڕوای پێ کراوە.
(١٤٤) کەوابێ پێویستە هەموو کەس بەشی خۆی ڕەنج بدات. بە تەمای نزیکترین کەس نەبێت و چاوەڕوانی دەسنگە و پیاوەتی و خێری کەس نەبێت.

**ئەوەی چاڵ بۆ یەکێك هەڵکەنێت، خۆی تێی دەکەوێت.[١٤٥]**
**ئەوەی بۆ گووکەر هەڵ دەکەوێت، بۆ ڕاوکەر هەڵ ناکەوێت.[١٤٦]**
**ئەوەی بەوی کردووە، با بە دەواری شڕی نەکردووە.[١٤٧]**
**ئەوەی خزم بە خزمی دەکات، دوژمن بە دوژمنی ناکات.[١٤٨]**
**ئەوەی پیشەی ئازاردان بێت، دەبێت تووشی ملشکاندن بێت.[١٤٩]**
**ئەوەی تۆراوە، بەشی خوراوە.[١٥٠]**
**ئەوەی تۆ پێی پەستی، من پێی مەستم.[١٥١]**

---

(١٤٥) بە کەسێك دەوترێت حەزی بە کەوتن و زەرەر و قۆرتی خەڵك بێت بەڵام خۆی بەبێ ئاگا تێی دەکەوێت.
(١٤٦) هەندێك کەس هەوڵ و تەقەلا و هیلاکیی دنیا دەچێژێت بە دوای ئامانجێکدا پێی ناگات. بەڵام هەندێکیش بەبێ ئامانج. بە ڕێکەوت دێتە بەردەمی.
(١٤٧) واتە زۆر خراپی بە بەرامبەرەکەی کردووە، بەشی ئاشتیی و دوای تیایدا نەهێشتۆتەوە.
(١٤٨) واتە خزم و کەسی نزیك لە یەك ڕادەبینن یەکتر زیر بکەن. چونکە دەزانن لە یەکتر دادەبڕێن، بەڵام لە یەکتر نابن. هەر کەسی یەکن.
(١٤٩) ئەو کەسانەی دەبنە هۆی ئازار و ئەشکەنجەی خەڵکیی. ڕۆژانی خۆیان ڕەشترە.
(١٥٠) واتە هەموو کەس پێویستە بەبەشی خۆی رازی بێت، لالووت نەبێت، با ئەوەشی لەدەست نەچێت.
(١٥١) واتە ئەوەی بەرامبەرەکەی پێی ناخۆشە، ئەم زۆر پێی خۆش و ئاسوودەیە،

**ئەوەی تۆوی درك بچێنێت، تا ماوە گوڵ نابینێت.**[152]
**ئەوەی نەبێت لە دەرپێی شرم، نابێت بە کورم.**[153]
**ئەوەی هەڵگرت شمشێر، نابێت گوێ بداتە شێر.**[154]
**ئەوەی دشی لەگەڵدایە، درەوشێکی لە پێدایە.**[155]
**ئەوەی لە ژێر بەرەدایە، دەیخەمە سەر بەرە.**[156]
**ئەوەندە شیرینە، بە قوزەڵقەرتەوە دەخورێت.**[157]
**ئەوەندە گەڕاوە دڕاوە.**[158]
**ئەوەندە دڵی پاکە، قولە پێی بسمیت دەنگ ناکات.**[159]
**ئەوەندە لەڕبووە، گەڕبووە.**[160]

---

(١٥٢) ئەوەی کاری خراپ و ناهەموار و نابەجێ دەکات. هەر ئەوەش لە بەرامبەرەکەی خۆی دەبینێت. کەسیش چاکەی بۆ ئەو ناوێت.
(١٥٣) واتە ئەگەر ئەو منداڵە دایك بە داماویش گەورە بکات، هەر کوڕی ئەو دایکەیە و بۆ ئەو دایکە دەبێت.
(١٥٤) کەوابێ ئەوەی هێمای ئازایەتی کردە دروشمی نابێت بترسێت.
(١٥٥) واتە (دش) خوشکی مێرد بۆ ژنی براکەی وەکو سوژن وایە لە ژێرپێیدا.
(١٥٦) کەوابێ ئەوەی شاردومەتەوە ئاشکرای دەکەم.
(١٥٧) واتە ئەوەندە مرۆڤێکی چاك و خۆشمەشرەف و ڕێزدارە. خراپیشی پێ بڵێین هەر پەسەندە و لە پێشە.
(١٥٨) واتە لە ئەنجامی گەڕان و خەڵك بینین و تێکەڵاویدا مرۆڤ زۆر شت وەردەگرێت و فێر دەبێت.
(١٥٩) واتە ئەوەندە دڵپاك و سنگفراوانە. کەس بە خراپ و دوژمن نازانێت بۆیە وەڵامی نییە.
(١٦٠) واتە ئەوەندە لاواز بووە، خەڵکیی بە نەخۆشی دەزانێت.

**ئەوەندە بچۆرە مالان، دۆشەکەلەیەکت لەژێر نین.**(١٦١)
**ئەوەندە کەرە باری لێ نریت.**(١٦٢)
**ئەوەندە دزە کل لە چاو دەفرێنێت.**(١٦٣)
**ئەوەندە دەجوولێت، دەلێیت جیوەی تێدایە.**(١٦٤)
**ئەوەندە جامبازە، جۆ بە دیواردا هەلدەگێرێت.**(١٦٥)
**ئەوەندەی پێناچێت، وەك شێر هەلدەچێت.**(١٦٦)
**ئەوەندەی دەم هیلاك دەبێت، با قاچ هیلاك بێت.**(١٦٧)

---

(١٦١) ئەوەندە خۆت مەکە بە مالاندا، رێزت لێ نەگیرێت. لە مالی خۆت دانیشە.
(١٦٢) هزری لە دەستداوە و هەستی پێ ناکات. بۆتە گالتەچی.
(١٦٣) ئەوەندە بزێو و چاپوکە، هەست بە گورزەکانی ناکرێت کە دەیوەشێنێت.
(١٦٤) جموجولی زیاد لە سنووری خۆی دەلێن وەکو جیوەی تێدا بێت وایە.
(١٦٥) واتە راستی لە دەوروبەری دەشارێتەوە و فێلبازێکی ساختەچییە.
(١٦٦) واتە زۆر دەمارگیر و شەرەنگێزە زوو هەلدەچێت قسەی لەگەل ناکرێت.
(١٦٧) با مرۆڤ ئەوەندە ئەمر نەکات و کار نەسپێرێت بەم و بەو خۆی هەستێت بە جێبەجێکردنی کاری خۆی.

# پیتی ( ب )

**بابه گورگور هاتووم بۆ کور.[١٦٨]**
**با بێ و باران بێت کاری دەگەڕێت.[١٦٩]**
**با جارێك فەلەك ڕوو بکاتە من، بە خۆشیی دۆست و بە کوێریی دوژمن.[١٧٠]**
**باخەوانی باشترە لە باخەوانی.[١٧١]**
**با خەجێ نەبێت خازە بێت، بووکێکی تەڕ و تازە بێت.[١٧٢]**

---

(١٦٨) پێش شارەزا بوون لە نەوت خەڵکیی وایان زانیوە گڕ و ئاگری بابە گوڕگوڕ لە کەرکوك نوری گۆڕی مەشایەخ و پیاو چاکە. چوونەتە سەری و حەوت جار بە دەوریدا هاتوون و داوای کوڕیان لێ کردووە و وتویانە (بابە گوڕگوڕ هاتووم بۆ کوڕ کوڕم دەوێ).

(١٦٩) واتە هەندێك کەس. دنیا خۆش بێت و ناخۆش بێت کار ناکاتە سەر ژیانی و کارەکانی، بە هەموو جۆرێك بۆی لەبارە.

(١٧٠) واتە هەموو کەس خواستی خۆی هەیە لە کۆڕی دۆست و خۆشەویستانا شاد بێت و ناحەزُ و دوژمن کوێرکەرە.

(١٧١) ڕەنج و هیلاکیی چاکترە لەوەی کۆش بگریتەوە و دەستپان بکەیتەوە.

(١٧٢) خەجێ خوشکی گەورەیە و خازە خوشکی بچووك. داوای خازە دەکات و خۆشی دەوێت. دایکی خازە دەیەوێت کچە گەورەکەی ناو خەجێیە بەپێی نەریتی هەندێك خێزان پێش بچووکەکە شوو بکات کوڕەکەش پێی داگرتووە لەسەر خازە. بێ سوودە ئەمجارە دایکی دەبات بۆ خوازبێنی و دەڵێت: (باخەجێ نەبێت خازە بێت بووکێکی تەڕ و تازە بێت.

**با دیزە بەدەرخۆ نەبێت.**(١٧٣)
**باران بباریت ئاشم دەگەڕێت، باران نەباریت جووتم دەگەڕێت.**(١٧٤)
**بارە گوێزی لێ بنرێت خڕەی نایەت.**(١٧٥)
**بار کەوتەیە.**(١٧٦)
**باری گلاوە.**(١٧٧)
**باراشێکی پێ لە ئاش ناکرێت.**(١٧٨)
**بازاری گەرمە و زاری بە شەرمە.**(١٧٩)
**بازنی ئاڵتوونی لە دەستدایە.**(١٨٠)

---

(١٧٣) واتە ئەو قسەیە بشارێتەوە ناو نەبرێت.
(١٧٤) هەندێك كەس هەر لەبرەودان. دنیا خۆش بێت و ناخۆش بێت كاریان نەوەستاوە.
(١٧٥) ئەوەندە ڕادەی خۆشیەكەی زۆرە، هەست بە قورسایی باری سەرشانی ناكات.
(١٧٦) واتە كارەكانی بە هوودە چووە و بۆی نایەت لە ژیانیدا، لە تواناشیا نییە ڕەوشی ژیانی خۆی چاك بكات.
(١٧٧) واتە تیاچووە و ناتوانێت هەستێتەوە و خۆی دروست كاتەوە.
(١٧٨) واتە تەمەڵ و بێ دەسەڵات و بێغیرەت و كەم جەوهەرە.
(١٧٩) بەو كچانە دەڵێن كە خوازبێنی كەریان زۆرە و شەرم دەكەن وەڵام بدەنەوە.
(١٨٠) بەوانە دەوترێت كار و سنعەتێك بزانن بتوانن بژێوی ژیانی پێ بەرز بكەنەوە.

**باش بۆی هاتووه و لەقەی لێ دەدات.**(١٨١)
**باڵندەیەك ساڵی جارێك دەیخوێند، دەیوت گوو.**(١٨٢)
**بانگی محەمەد بە ئاشکرا خۆشە.**(١٨٣)
**با نۆش لەسەر دە بێت.**(١٨٤)
**بانێکە و دوو هەوا.**(١٨٥)
**با نە شیش بسووتێت نە کەباب.**(١٨٦)
**با هەر سیر بخوات و زورنا لێ بدات.**(١٨٧)

---

(١٨١) واتە خوای بۆی ڕەخساندووە و پێی ڕازی نییە بەو بەشە. سوپاسی خوای لەسەر ناکات.
(١٨٢) بەوانە دەوترێت زۆر کپ و بێدەنگن، کاتێك قسەیان کرد بە دڵی کەس نییە و ناخۆش و ناسازە.
(١٨٣) مرۆڤ هەرچی قسەیەکی بەڕاست و بەحەقزانیی با بە ئاشکرا بیڵێت نەیشارێتەوە.
(١٨٤) ئەگەر مرۆڤ زەرەرمەند بوو لە شتێکدا چەندجارێك ڕادێت.
بەتەنگەوە نایەت لە جارەکانی داهاتوودا.
(١٨٥) لەوەوە وتراوە، خەسوویەك لەسەر یەك سەربان نوستووە بە کچەکەی و زاواکەی وتووە (خۆتان داپۆشت با سەرماتان نەبێت) بە کوڕەکەی و بووکەکەی وتووە (ئەمشەو گەرمە خۆتان دامەپۆشن) بووکەکەی وتوویەتی بۆچی بانێکە و دوو هەوایە.
(١٨٦) بە دوو کەسی زەرەرمەند وتراوە، کە زەرەرەکە بەش بکەن وەك یەك بە یەکسانیی.
(١٨٧) واتە بەها بە قسەکانی نەدرێت.

باویله باویکی بەسە.[١٨٨]
باوك رابەرە، بەخێوکەرە، تاجی سەرە.[١٨٩]
باوك بەڵایە، دایك قەزایە، ژن نیعمەتی خوایە.[١٩٠]
بایدایەوە سەر بای بەرە بۆر.[١٩١]
بای باڵی خۆی دەدات.[١٩٢]
بایە و بەلای گوێیدا دەروات.[١٩٣]
باخەوان لە وەختی تریدا گوێی گرانە.[١٩٤]
با دیزە بە دەرخۆنە نەبێت.[١٩٥]
بە ئارامبە و بە مەرامبە.[١٩٦]

---

(١٨٨) بەو کەسانە دەوترێت زۆر دڵیان ناسکە و مان دەگرن. قسەی کەسیان بە دڵ نییە، یان کەمێك ڕوویان بدەیتێ لە سنووری خۆیان دەردەچن.
(١٨٩) باوك ئەگەر بە ڕاستی باوك بێت بۆ منداڵ هەموو شتێکە.
(١٩٠) کوڕی لاواز و بێ دەسەڵات بە دەست ژنەوە هەر ئەوە دەڵێت.
(١٩١) کەواتە ئەوەی کۆنتر وتوێتی ویستویەتی هەر ئەوەی دەوێت.
(١٩٢) بەوانە دەڵێن کەمێك سەربەست دەبن و دەجووڵێنەوە دوای دانیشتن لە کونی ژوورەوە.
(١٩٣) بەوانە دەوترێت کە نرخ و بەها نادەن بە کەس، گوێ دەگرن و بە قسەی کەس ناکەن.
(١٩٤) بەو کەسانە دەوترێت کە کارێکیان بە دەستە و وەڵامیان نییە، حەز ناکەن خێر بگەیێنە کەسانێك کە پێویستیان پێیانە.
(١٩٥) بە مانای نە شاردنەوەی ئەوەی کە ڕوو دەدات سەرقاپی بۆ نەکرێت.
(١٩٦) هەموو کەسێك ئارام بگرێت دەگاتە مەرامی خۆی.

به باڵای براوه.[197]
به پێکەنینی زاڵم باوەر مەکە.[198]
به پرسیار بەغداد دەدۆزیتەوە.[199]
به پەتی خەڵك خۆت مەخنکێنە.[200]
به پەلەپیتکە خۆی دەتەکێنێت.[201]
به پێی بەرەی خۆت پێ راکێشە.[202]
به پەنجەی دەست دەژمێرێت.[203]
به تەمای دراوسێ بیت، بێشێو سەر دەنێیتەوە.[204]
به تیرێك دوو نیشانی شکاند.[205]
به تر حەمام گەرم نابێت.[206]

---

(197) واته له ئەزەل و دروستبوونیا به سروشت هەر وابووه، ئەگەر چاکه ئەگەر خراپ.

(198) کەسێك حەز له کەسێك نەکات، پێکەنینەکەی هەڵخەڵەتاندنه.

(199) پرسیار مەبەستی هەموو کەسێك بێت تا دەگاته ئەنجام هیچ شتێك لەبەردەمی مرۆڤدا نامۆ نییه.

(200) ئەوەنده متمانەت بەخۆت بێت، قسەی خەڵکیی کارت تێ نەکات و خەمت بداتێ.

(201) بۆ ئەوانه زۆر پاك خاوێنن.

(202) هەموو شتێك بەپێی رەنج و توانای خۆت بکه با گیرەوەی قەرز نەبیت.

(203) کەواته ئەگەر چاکه یان خراپه شازه و ژمارەی یان وێنەی کەمه.

(204) ئەوەی دڵنیا نەبێت له رەنج و توانای خۆی کەس دایبی نادات.

(205) واته به یەك هەنگاو دوو شتی دەستکەوتووه.

(206) هیچ شتێك بێ رەنج بەرهەم نایەت و دەستت ناکەوێت.

**به تری گوێژه دەکێلێت.**(٢٠٧)
**به تەڕی خواردی و به وشکی دایینایەوە.**(٢٠٨)
**به تەمایه ماسی بگرێت و قوله پێی تەر نەبێت.**(٢٠٩)
**به توێشووی کەس برسێتیی ناشکێت.**(٢١٠)
**به جوانیت مەستم، به کردارت پەستم.**(٢١١)
**به چاوه ساغەکەی دەمداتێ و به چاوه کوێرەکەی لێم دەسەنێتەوە.**(٢١٢)
**به حوشتریان وت مژده کوڕت بوو! وتی باری خۆم لەسەر پشتی خۆمه.**(٢١٣)
**به حەوت ئاو شۆراوەتەوە.**(٢١٤)
**به حەوت تەور ملی نابڕێتەوە.**(٢١٥)

---

(٢٠٧) واته هیچ له دەستنەهاتوو کارنەزانه، تەنها فشوهوڕی هەیه.
(٢٠٨) واته زەرەرێکی سەرانسەری کردووه بەبێ ئاگا تێیوشیوه و هیچی به دەستەوه نەماوه.
(٢٠٩) دەیەوێت قازانج بکات و شتی باش بەدەست بێنێت بەبێ هیلاکیی.
(٢١٠) دیاری و توویشوو خێر کەس تێر ناکات و رازی ناکات.
(٢١١) کەوابێ جوانی مەرج نییه بۆ مرۆڤ بەڵکو کرداری جوان بێت چاکتره.
(٢١٢) کەواتەهیچی دەست ناکەوێت و سوودمەند نابێت هەر هیلاکییه.
(٢١٣) کەوابێ هەتا مردن، کردن. کەس به تەمای کوڕی خۆشی نەبێت.
(٢١٤) کەواته جیاوازی زۆره لەگەڵ پێشووتریدا یا لەگەڵ کەسێکی دیکەدا.
(٢١٥) واته بەهێزه و بێ پێزه، خێر له دەستی نابێتەوه

**به خۆشی خۆشی چوومه قه‌ڵاوه، به دڵه‌ی شکست گه‌رامه دواوه.**[٢١٦]
**به خاسه خاسه ریایه کاسه.**[٢١٧]
**به خاڵۆ خاڵۆ خۆی خسته ماڵۆ.**[٢١٨]
**به خاڵه خاڵه هات به‌لامه‌وه، وه‌کو هه‌ژدیها دای به پامه‌وه.**[٢١٩]
**به‌ختی دایك جیازی کچه**[٢٢٠]
**به خۆشی زستان زه‌رده‌خه‌نه‌ی دوژمن باوه‌ر مه‌که.**[٢٢١]
**به خوێنی سه‌ری تینووه.**[٢٢٢]
**به خه‌لکیی سه‌گ ده‌وه‌ڕێت، به من پشیله‌ی ناته‌واو.( ٢٢٣ )**
**به خه‌نده‌ی دوژمن مه‌خه‌ڵه‌تێ.**[٢٢٤]
**به‌خت ساڵی یه‌ك جار له ده‌رگات ده‌دات، ئه‌ویش له ماڵه‌وه**

---

(٢١٦) هه‌ندێك که‌س زۆر دڵی خۆشه به هه‌موو شتێك قه‌دده‌ری خوای بیر نییه.
(٢١٧) ئه‌وه‌نده مه‌دحکراوه و باشیان پێ وتووه، خۆی بیرچۆته‌وه و تێکه‌وتووه.
(٢١٨) به مه‌رایی و زمانی نه‌رم و شیرین خۆی خسته ناو خێزانه‌که‌وه.
(٢١٩) به زمانی نه‌رم و فێڵ نزیك که‌وته‌وه. تا زه‌ره‌ر و به‌سه‌رهاتێکی گه‌وره‌ی تووشکردن.
(٢٢٠) که‌وابێ دایکی بێبه‌خت کچیشی بێبه‌خت ده‌بێت.
(٢٢١) که‌وابێ زستان هه‌ر زستانه و ده‌بێت سارد بێت و دوژمنیش نابێت به دۆست به زه‌رده‌خه‌نه‌یه‌ك.
(٢٢٢) واته زۆر ناحه‌زیه‌تی قینی لێیه‌تی.
(٢٢٣) واته دوژمنه‌که‌ی ئه‌و زۆر که‌م و گێله و به هیچی نازانێت.
(٢٢٤) دوژمن هه‌ر دوژمنه، دوژمن چاکه‌ی پێ ناکرێت، ته‌نها بۆ نزیکخستنه‌وه فێڵ و ته‌ڵه‌که به‌کارده‌هێنێت بۆ ئه‌وه‌ی زه‌فه‌رت پێبه‌رێت.

**نیت.**[٢٢٥]
**بەدرێژایی خۆتا بڕوانە، ئینجا بە پانیی خەڵکا بڕوانە.**[٢٢٦]
**بە دوو فیشاڵی هەڵدراو، ناڵە پێپانمان لێ دەکەن بە پیاو.**[٢٢٧]
**بەدکار هەوێنی حەوت قازان شیرە.**[٢٢٨]
**بە دەگمەن دەست دەکەوێت.**[٢٢٩]
**بە دەرزی بیر هەڵدەکەنێت.**[٢٣٠]
**بەدتر لە بەدترین چاکترە.**[٢٣١]
**بەدوای کەری تۆپیودا دەگەڕێت ناڵەکەی بکێشێتەوە.**[٢٣٢]
**بە دۆش دەژەنێت.**(٢٣٣)

---

(٢٢٥) واتە بەخت نادیارە،، هەموو ڕۆژێك دیار نییە، یان لە بەختی خۆت ڕازی نیت.

(٢٢٧) واتە لای ئێمە ناخ و کردەوە و پێشووی کەس ناخوێنرێتەوە. تەنیا قەڵافەت خۆ هەڵکێشان و جلوبەرگ نەبێت.
(٢٢٨) پیاو خراپ و خراپەکار. هەوێنن بۆ هەموو ئاژاوەیەك و تێکدانێك.
(٢٢٩) واتە زۆر تاك و شاز و نامۆیە، ئەو شتە یا ئەو کەسە دەستکەوتنی زەحمەتە.
(٢٣٠) واتە پەلەی لە کارەکەیدا نییە گرنگ ئەوەیە بە دەستی بێنێت و پێی بگات.
(٢٣١) هاوڕێیەتی کەسێکت کرد لێی ڕازی نەبوویت، لە هاوڕێیەتی کەسێکی تردا هاوڕێی یەکەم بە باشتر دەزانیت، چونکە دووەم خراپتر بوو لە یەکەم.
(٢٣٢) بەو کەسانە دەوترێت زۆر چروك و ڕەزیلن جلی مردووش لەبەر دەکەن.
(٢٣٣) واتە بە هەموو شتێك ڕازییە دوای زەرەرمەندی و لووت بەرزی.

به دەستی خۆم چیم کرد بە خۆم.[٢٣٤]
بە دەستی خۆی ئاگری بەرداوەتە ماڵی خۆی.[٢٣٥]
بە دەستێك چەپڵە لێ نادرێت.[٢٣٦]
بە دەستێك دوو کاڵەك هەڵناگیرێت.[٢٣٧]
بە دەم دۆستە، بە دڵ کۆستە.[٢٣٨]
بە دەنگی مەلا باوەڕی نییە، بە زەڕەی کەری باوەڕە.[٢٣٩]
بە دەم و دەست تێی وشیوە.[٢٤٠]
بە دەمێك دەخۆن و بە قنگێك دەڕین.[٢٤١]

---

(٢٣٤) واتە بە دەستی خۆی و هزری خۆی زەرەرێکی ئەوتۆی لە خۆی داوە زۆر پەشیمانە و چارەسەریشی نەماوە.
(٢٣٥) واتە بە دەستی خۆی گرفتێکی ئاگرینی لە ماڵی خۆیدا دروستکردووە.
(٢٣٦) بە تاکە کەسێك چاکە ناکرێت، دەبێت بەرامبەرەکەشی چاك بێت واتە چاکە لە چاکەیە.
(٢٣٧) واتە هەموو شتێك بە پێی توانا، دەبێت عەقڵ بیبڕێت ئینجا بەوکارە هەستێت.
(٢٣٨) بە دەم و قسەی تاس و لووس خۆی بە دۆست دەردەخات، بەڵام لە دڵا پیسە و کۆسپ و کۆستی بەرامبەرەکەی دەوێت
(٢٣٩) واتە باوەڕ ناکات بە قسەی ڕاشکاو و ڕاستیی. دوای درۆ و دەلەسە و ناڕاستیی کەوتووە..
(٢٤٠) بەوەی کە لە دەستیایەتی و بەخۆ هەڵکێشان زیادەڕۆیی کردووە.
(٢٤١) واتە زۆر یەکن و تەبان لە هەموو ڕوویەکەوە بە دڵی یەکن.

**بەردێکم تێ گرە و بە سەرم کەرەوە.**(٢٤٢)
**بەرد لە جێگای خۆیا سەنگینە.**(٢٤٣)
**بەرماڵی بەسەر ئاوەوە دەگەڕێت.**(٢٤٤)
**بەرد لەقی جێی خۆی ناگرێتەوە.**(٢٤٥)
**بەردێك نادانا بیخانە گۆمەوە، بە سەد دانا دەرنایەت.**(٢٤٦)
**بەرچاو تەنگیی ڕیسوایی دەهێنێت.**(٢٤٧)
**بە ڕەنج دەگەیتە گەنج.**(٢٤٨)
**بەڕێویان وت... کێ شایەتە...؟ وتی کلکم.**(٢٤٩)
**بە ڕیش نییە و بە ئیشە.**(٢٥٠)

---

(٢٤٢) واتە پشت گوێم مەخە، ئەگەر قسەیەکی ناخۆشیشم پێ بڵێیت.
(٢٤٣) هەموو کەس لە ناوماڵ و کەسوکار و نیشتمانی خۆیدا بەنرخە و بەسەنگە و پەسەندە.
(٢٤٤) واتە خواپەرستە و بەویژدانە خراپیی و زەرەری کەسی ناوێت.
(٢٤٥) مرۆڤ کە شکا ناچێتەوە بارودۆخی جارانی لە ڕێز و حورمەتدا.
(٢٤٦) واتە بارودۆخێك نەزان تێکی بدات، چارەسەرکردنی گرانە.
(٢٤٧) ئەوانەی بەرچاو تەنگن لە کار و کردەوە و خێرکردندا سووك و ڕیسوان کەس هیوای پێیان نییە.
(٢٤٨) ئەوەی کار بکات و ڕەنج بدات دەگات بە هەموو ئامانجەکانی .
(٢٤٩) بە کەسێك دەوترێت کە تاوانێك دەکات. هاوڕێیەکی نزیکی یا کەسێکی خۆی کە ئەشتی نادات لە ئەرز دەیکات بە شایەت.
(٢٥٠) واتە بە دیمەن تێ مەگە تا کردەوەی دەبینیت.

**بەرە لای تەنکەوە دەدرێت.**[٢٥١]
**بەرد بە با دەکات.**[٢٥٢]
**بەرد مەگرە خەڵکیی،ماڵەکەت لە شووشە بێت.**[٢٥٣]
**بەرخی نێر بۆ سەربرین باشە.**[٢٥٤]
**بەردی گەورە نیشانەی هەڵنەدانە.**[٢٥٥]
**بەرد و ئاسنم بە شان گواستەوە، لە قەرز قورستر نەبوو.**[٢٥٦]
**بەری رۆژ بە بێژنگ ناگیرێت.**[٢٥٧]
**بەرتیل بەرد نەرم دەکات**[٢٥٨]

---

(٢٥١) واتە هەموو کارەسات و داماوی و ناخۆشیی و قوڕبەسەریەك لە هەژاریی و بێ بژێوی و زەبوونیەوەیە.
(٢٥٢) واتە زۆر بێزارە و توانای قسەکردن و رێکەوتنی تێدا نەماوە.
(٢٥٣) واتە توانج و بوختان و خراپیت نەبێت بەرامبەر کەس. کە خۆت خاوەنی خێزان و کچ و کوڕ و کەسوکار بیت.
(٢٥٤) واتە نێرینە (کوڕ) دەگونجێت و دەشێت بۆ هەندێك کار، کە کچ لە توانایدا نییە.
(٢٥٥) واتە پەڵپو داوای بێزادە نیشانەی سەر نەگرتنە.
(٢٥٦)لە کاتی نەبوونیدا قەرز دەکرێت. بەڵام نایزانێت چۆن و کەی دەیدەیتەوە قورساییەکەی دەکەوێتە سەر مێشك و بیرکردنەوە.
(٢٥٧) واتە ڕاستی و حەق هەردیارە و لەسەرو هەموو شتێکەوەیە درۆ و فرا و فێڵ نایشارێتەوە.
(٢٥٨) بەرتیل لە دەرەوەی سنووری هاوڕێیەتییە حەرامە لەعنەتلێکراوە بە هەردوو سەر، ئەوەی قبووڵیەتی و بە فرسەتی دەزانێت بە دەستکەوتنی شتێك کە ئیشەکەی خۆی بکاتە هۆ.

**بە زمانی شیرین مار لە کون دێتە دەر.[٢٥٩]**

**بە زستان پینەوپەڕۆ، هاوینان ورد ورد بڕۆ.[٢٦٠]**

**بە زستان جارێك دەڵێن سارد.[٢٦١]**

**بەز بە پشیلە دەسپێرێت.[٢٦٢]**

**بە ژاڵەیان وت بۆ وا تاڵیت؟ وتی لەبەر برا مردن. ئەی گوڵت بۆ وا جوانە؟ لەبەر دۆست و دوژمن.[٢٦٣]**

**بە ژەم و دەم دەژی.[٢٦٤]**

**بە سکێك تێر و بە دەسك برسی.[٢٦٥]**

**بەسەر ئاوی حەمامەوە پیاوەتی دەکات.[٢٦٦]**

**بەسمە، کوڕە کەچەڵە، بەسمە.[٢٦٧]**

---

(٢٥٩) بە زمان و گفتوگۆی شیرین دەتوانیت هەموو کەسێك بخەیتە سەر ڕێی ڕاست و زەرەری نەبێت بۆ دەوروبەرەکەی.

(٢٦٠) جلی زستانە با تازە نەبێت چونکە بەفر و باران و قوڕ پیسی دەکات هاوینان بە جلی تازەوە هەموو کەس فریای ئەوە دەکەوێت سەیرت بکات.

(٢٦١) کە توانج یان قسەت بە کەسێکی خراپ وت. پێویست ناکات دووبارەی بکەیتەوە.

(٢٦٢) کەواتە کەسی خوار و ناڕاست ئامانەتی پێ ناسپێرێت.

(٢٦٣) زۆر کەس نایەوێت ناخی خۆی بۆ کەس دەرخات و باس بکات، بەڵام حەز دەکات بە ڕووکەش جوان و ڕووخۆش و پۆشتە خۆی دەرخات.

(٢٦٤) واتە ژەمێك خواردن پەیدا نەکات ناخوات. زیادەڕۆیی ناکات.

(٢٦٥) کەواتە ژیانی پڕ لە ناهەمواریی و بێ دەرامەتیی و برسێتییە.

(٢٦٦) واتە هیچ نەکەوتووە لەسەر ئەو.

(٢٦٧) واتە کەچەڵ بەشانسە و بەختی هەیە.

**بە سەریا بێت دۆ و دۆشاو تێکەڵ دەکات.[٢٦٨]**
**بە سێ برا کڵاوێکیان هەیە.[٢٦٩]**
**بە سەبەتەش ناگوێزرێتەوە.[٢٧٠]**
**بە شەماڵە چارەنووس دیاری دەکات.[٢٧١]**
**بەشی ئاشتیی تێدا بهێڵەرەوە.[٢٧٢]**
**بە شەو جەردە، بە ڕۆژ مەردە.[٢٧٣]**
**بە عەرەب بڵێت مەرحەبا، هەم دەخوات و هەم دەبا.[٢٧٤]**
**بە فیکە مار لە کون دێتە دەرەوە.( ٢٧٥ )**

---

(٢٦٨) هەندێك کەس بەسەریا بێت چاك و خراپ و تەڕو وشك پێکەوە دەسووتێنێت و جیاوازیی ناکات.
(٢٦٩) واتە هەر سێ براکە زۆر گونجاون و ڕەچاوی یەك دەکەن.
(٢٧٠) بە کەسێك دەوترێت زۆر پیر یان زۆر نەخۆش یان قەڵەو بێت لە توانای کەسدا نەبێت خزمەتکردن و گواستنەوەی.
(٢٧١) (شەماڵە) ئەمە نەریت و بیرۆکەیەکی کۆنی کوردییە (ئەوەی گرفتێکی هەبوو بێت. شەو لەنێوان بانگی ئێوارە و خەوتنان لە شوێنێکا دەوەستن سێ ڕێگای لەسەر بێت. سێ بەرد بۆ هەر سێ ڕێگاکە هەڵدەدەن لە نیازی دڵی خۆی. هەر کەسێك هات قسەیەکی کرد ڕاستە بۆ گرفتەکە.
(٢٧٢) شەڕ خۆش نییە. بەڵام بەشی ئاشتیی بهێڵرێتەوە.
(٢٧٣) لە ڕووناکیدا لەبەر چاوی خەڵکیی زۆر پیاوانە خۆی دەردەخات، بەڵام لە تاریکیدا یان کەس لێی دیار نەبێت پیاو خراپی دەکات.
(٢٧٤) واتە هاوڕێیەتی و دۆستایەتی لەگەڵ عەرەبدا مەحاڵە.
(٢٧٥) هەموو کەس مامەڵەی گونجاوی لەگەڵدا بکرێت ڕێك دەکەوێت لەگەڵیدا.

به قنگەوە خستیە کەندەڵانەوە.[٢٧٦]
بە کونی هەتیتەوە دەچێت.[٢٧٧]
بە کەر ناوێرێت، بە کورتان ڕەتە ڕەتێتی.[٢٧٨]
بە گوڵیان وت: بۆ وا جوانی؟ وتی باخەوانەکەم مەردە.[٢٧٩]
بە گوڵێك بەهار نایەت.[٢٨٠]
بە گورگان خواردووی دا.[٢٨١]
بە گیای بەهاردا ناتورێنێت.[٢٨٢]
بەلای ماردا بڕوات کلکی دەقرتێنێت.[٢٨٣]
بە مێردی نییە بە خوڵایە.[٢٨٤]
بە نان هاتوو بە ئاو خورا.[٢٨٥]
بەندە بێعەیب نابێت.[٢٨٦]

---

(٢٧٦) تەریقی کردەوە و ڕێگای نەدایە بەرگریی لەگەڵ خۆی بکات.

(٢٧٧) واتە زۆر فێڵباز و وریایە بۆ گونجاندن.

(٢٧٨) واتە بە ڕۆحدارەکە ناوێرێت، بەبێ ڕۆحەکە داخی دڵی خۆی دەڕێژێت.

(٢٧٩) هەموو مرۆڤێکی مەرد و ئازا کار و کردەوەی جوان و پەسەندە.

(٢٨٠) بەیەکجار ڕەنج و چاکە بەس نییە بۆ ژیان و تەمەن و بەردەوامیی.

(٢٨١) زەرەرمەندی کرد و لە ناوی برد.

(٢٨٢) واتە ناگاتە بەهار دەمرێت.

(٢٨٣) واتە ئەوەندە چاوچنۆك و تەماعکارە.

(٢٨٤) هەژار عەقڵی و نەخوێندەواری و کەم زانیاری خەڵکیی گێل کردبوو لە زەمانی کۆندا.

(٢٨٥) واتە شتەکە زوو لە دەستچوو و کەس نەیزانی کێ بوو؟

(٢٨٦) واتە هەموو مرۆڤێك عەیبێکی هەیە خۆی نایبینێت.

**بە نینۆکی خۆت نەبێت خروت ناشکێت.**[287]
**بەندە عەیبی خۆی نابینێت.**[288]
**بە هۆی گەلە گەنمێکەوە. سەد گوڵە مرۆر ئاو دەخواتەوە.**[289]
**بە هەزاران دەرزی سوژنێکی تیا نابێت.**[290]
**بە هەزار حەکیم دەردەدارێکیان تێدا نابێت.**[291]
**بە هاران ئاژەل و پەز، هاوینان ناوباخ و ڕەز.**[292]
**بە هەزار وێر قەرزێك پڕ ناکاتەوە.**[293]
**بە هەموو دوعایەك نالێم ئامین.**[294]
**بەینمان ئەرز و ئاسمانە، وەکو شوان و گاوانە.**[295]

---

(٢٨٧) واتە هەموو مرۆڤێك خۆی دەزانێت چۆن چارەسەری خۆی بکات.
(٢٨٨) هەموو کەس خۆی زۆر بە جوان و عاقڵ دەزانێت. کەموکورتیی خۆی نازانێت.
(٢٨٩) بە هۆی دەوڵەمەندێکەوە. هەزاران هەژار سوودمەند دەبێت.
(٢٩٠) بە هەزاران پیاوی بێ عەقڵ و بچووك پیاوێکی زانا و گەورەیان تێدا نابێت.
(٢٩١) هەموو کەس خودی خۆی تووشی دەرد و گرفتێك بێت شارەزا دەبێت لە چارەسەرکردنی.
(٢٩٢) بەهاران مرۆڤ سوودمەند دەبێت، لە بەروبوومی ئاژەڵ. هاوینان خۆشنوود دەبێت بە بەروبوومی باخ و ڕەز.
(٢٩٣) هەموو قەرز و فەرزێك لە شوێنی خۆیدا جێ دەگرێت، بەڵام وێر نەبری قەرزدانەوە دەکەوێت نە بۆ خێر.
(٢٩٤) واتە بە هەموو قسەیەك باوەڕ ناکەم.
(٢٩٥) واتە جیاوازیی زۆر لە بەینماندا هەیە و لە یەکتر ناگەن.

**بچیته سەر سیروان وشکی دەکات.**[٢٩٦]
**بچێ و نەچێ لە خۆی دەچێ.**[٢٩٧]
**بچیته شاری کوێران، دەبێت دەست بە چاوەوە بگریت.**[٢٩٨]
**بدە ڕەنج و بخۆ گەنج.**[٢٩٩]
**بدە ڵە هەرد، مەدە لە پردی نامەرد.**[٣٠٠]
**برا لە پشت برا بێت، مەگەر قەزا لای خوا بێت.**[٣٠١]
**برا بوو بە برازا کار لە کار ترازا.**[٣٠٢]
**برایەتی بە زۆر ناگیرێت.**[٣٠٣]
**برامان برایەتی و کیسەمان جیایی.**[٣٠٤]
**برسێتیی ڕەگی هاری پێوەیە.**[٣٠٥]

---

(٢٩٦) واتە زۆر بێ بەختە و شانس لەگەڵیدا نییە بۆ هەر شوێنێك بچێت.
(٢٩٧) کاری ناپەسەندی منداڵ هەر دەچێتەوە سەر کەسی خۆی.
(٢٩٨) هەموو کەسێك بێچتە ناو هەر... هۆز و میللەتێکەوە دەبێت وەکو ئەوان هەڵسوکەوت بکات.
(٢٩٩) پێویستە هەموو مرۆڤێك ئەوەندە ڕەنج بدات کە بەروبوومی بخوات.
(٣٠٠) واتە خۆت هیلاك بیت باشترە، نەك پەنا بۆ ناپیاو بەریت.
(٣٠١) یەکگرتوویی براو خێزان و هۆز، هەموو بەڵاو گرفتێك بە دوور دەکات.
(٣٠٢) واتە کەسوکار بەهۆی نەوەوە یەکگرتن و خۆشەویستیی و بەرپرسیاریان کەم دەبێتەوە لەگەڵ یەکتردا.
(٣٠٣) واتە بە زۆر هیچ پەیوەندییەك سەر ناگرێت.
(٣٠٤) واتە بە هێما و کەسایەتی برا بن بەڵام هەریەك ڕەنجی خۆی بخوات.
(٣٠٥) واتە کەس بە برسێتی ئیدارە ناکات، ڕەنج پێویستیی ژیانە.

**برسیتیی لە باوك مردن خراپترە.[٣٠٦]**
**بزن بۆ شەویك جێی خۆی خۆش دەکات.[٣٠٧]**
**بزن بە پێی خۆی و مەڕیش بە پێی خۆی دەکرێت بە دارا.[٣٠٨]**
**بزن شیری دا بە داپیر، داپیر کلکە قولیم باتەوە.[٣٠٩]**
**بزن نەگبەتیی بێت نانی شوان دەخوات.[٣١٠]**
**بکەویتە شەو، دەکەویتە خەو.[٣١١]**
**بلێت ماست سپییە باوەڕی پێ مەکە.[٣١٢]**
**بمنوێنن بە جلی تانجی، پێم بلێن ژنی حاجی.[٣١٣]**
**بنموێنن بە جلە گایە، پێم بلێن ژنە ئاغایە.[٣١٤]**

---

(٣٠٦) باوك بمرێت خۆی دەڕوات. بەلام کە برسی بوویت خۆت دەمریت.
(٣٠٧) پێویستە هەموو کەسێك ڕەنجی شانی خۆی حەساوەی کات، زۆر زوو هەوڵ بدات لە گەنجیدا فریای خۆی کەوێت.
(٣٠٨) هەموو تاوانبارێك بە پێی تاوانەکەی پێویستە حوکم بدرێت.
(٣٠٩) ئەمە چیرۆکی کۆنە واتە هەر کەسێك کاری چاك بکات یا خراپ ئەوەی زەرەری خەڵکی دەوێت دوای دزین و ماف خواردن دەبێت باجەکەشی بدات دەڵێن: (دارگەلا دات بە بزن، بزن شیر دات بە داپیر، داپیر کلکە قوڵم باتەوە).
(٣١٠) کەسێك نەگبەت بوو. زەرەر لە خاوەنەکەی دەدات.
(٣١١) واتە هەموو کارێکی مرۆڤ لە ڕۆژدا تەواو بکرێت چاکترە، نەك بکەوێتە شەو و تەگەرەی تێکەوێت.
(٣١٢) واتە جێی متمانە نییە، ئەوەندە درۆی کردووە.
(٣١٣) جاران ژنان زۆر شانازییان بە لەقەبی مێردەوە کردووە پێیان بلێن مەلاژن یا شێخ ژن یان حاجی ژن.
(٣١٤) ئەم لەقەبانە هەر ڕووکەش زل بوون. هەندێك کەس حەزی لەوە بووە.

**بن کلکی بۆی دەخورێت.**[٣١٥]
**بیانوی تر نانی جۆیە.**[٣١٦]
**بیسکەی سمێڵی دێت.**[٣١٧]
**بینێرن بۆ مازوان، بە دارا هەڵدەروانێت.**[٣١٨]
**بێعاریان خستە دەریاوە، وتی باش تەڕ نەبووم.**[٣١٩]
**بێژنگێك بگرە بە رووتەوە.**[٣٢٠]
**بێکەسیی هەر بۆ خوا هاتووە.**[٣٢١]
**بێ رەنج ناگەیت بە گەنج.**[٣٢٢]
**بێدەنگیی نیشانەی رازیبوونە.**[٣٢٣]
**بێدەنگیی نیشانەی رەوشت بەرزییە.**[٣٢٤]

---

(٣١٥) بە ئاواتی شتێکەوەیە بیکات و ئارەزووی لێیەتی.
(٣١٦) بە هیوای شتێکە و شتێکی دیکەی کردووە بە بیانو و هۆ و پاساو.
(٣١٧) کەوتووە بەخۆشیی خۆیدا و دنیا بە دڵێتی.
(٣١٨) بەوانە دەوترێت بە زۆر کارێکیان پێ بکەن و حەز بەو کارە نەکەن.
(٣١٩) بە کەسێك دەوترێت ئەوەندە ئاوەسوو بێعار بێت هیچ شتێك کاری تێ نەکات.
(٣٢٠) بە کەسێك دەوترێت بەرە و رووی کارێك بکرێتەوە شەرم بکات.
(٣٢١) کەسێك دەڵێت تەنیایی زۆر پێوە دیار بێت و بێزار بێت لە تەنیایی.
(٣٢٢) هیچ کەسێك ناگاتە ئامانجەکانی ئەگەر رەنج و کۆشش نەکات.
(٣٢٣) زیاتر بۆ ئەو کچانە وتراوە کە خوازبێنی کراون بە ئاشکرا رازیبوونی خۆیان دەرنەبریوە.
(٣٢٤) واتە گوێگرتن و کەم وتن، نیشانەی زۆر وەرگرتنی و عاقڵی و رەوشت بەرزییە.

**بووە بە گیسکەکەی هەیاسی خاس.**[٣٢٥]
**بووە بە میزی حوشتر بۆ دواوە دەگەڕێتەوە.**[٣٢٦]
**بوو بە ئاردی ناو درکان.**[٣٢٧]
**بوو بە شاییەکەی بناویلە.**[٣٢٨]
**بوو بە کورتانەکەی جەجاڵ.**[٣٢٩]
**بوو بە کوردەکەی لە هەردوو جەژنە بوو.**[٣٣٠]
**بوو بە مووی لووت.**[٣٣١]
**بوو بە هاتهاتەکەی ڕۆم.**[٣٣٢]

---

(٣٢٥) بۆ کەسێك دەوترێت کە پێی درێژ دەکات لە کارێکدا لە ڕادەی خۆی دەرچێت بیگەڕێنێتەوە بۆ سنووره ئاساییەکەی خۆی (ئەمە چیرۆکی گورگ و بزنە).

(٣٢٦) واتە ئەو کەسە لەبری ئەوەی بۆ پێشەوە هەنگاو بنێت هەر بۆ دوواوە دەگەڕێتەوە..

(٣٢٧) بە شتێك دەوترێت کە بلاوبووەوە (وەکو قسەیەك) لە توانای کەسدا نەبێت کۆکردنەوەی.

(٣٢٨) هەموو کارێك و قسەیەك زۆر دووبارە و دەبارە بێتەوە، پێی دەڵێن شایی بناویلە کە ئەم شاییە هەرچی پەیوەندیشی پێوە نەبووە سەرچۆپی گرتووە و هەڵپەڕیووە.

(٣٢٩) هەموو کارێك سەری داوەکەی دیار نەما و ئاڵۆز بوو وای پێ دەڵێن. دەبێت هەمووی تێك بدەیتەوە.

(٣٣٠) بە کەسێك دەوترێت لە دوو سەرەوە بێ بەش و نائومێد بێت.

(٣٣١) واتە کەسێك بەرلووتی گرتووە و جیا نابێتەوە و بواری نادات.

(٣٣٢) بە شتێك دەوترێت. هەر قسە و هیوا بێت و چاوەڕوان بیت هەر نەگات

**بوو بە مارەکەی شێخ ئۆمەر لە ملی ئالا.[٣٣٣]**
**بوو بەو ڕۆژەی قەرەوەیسی تێدا کوژرا.[٣٣٤]**
**بووە بە ڕەگی گولیی.[٣٣٥]**
**بووە بە کەرێ ناو جۆگا لە هەر دوولا دەخوات.[٣٣٦]**
**بووە بە کەوڵ سووری بەر لەشکر.[٣٣٧]**
**بووە بە فاتەی سوورەبان.[٣٣٨]**
**بووە بە داردەست.[٣٣٩]**
**بووکێ لەگەڵ تۆمە و خەسوو تۆ گوێت لێ بێت.[٣٤٠]**
**بووکەکەمان زۆر جوانە، بالوکەی لە لێوانە.[٣٤١]**

---

(٣٣٣) واتە بەڵایەك بئاڵێتە ملی مرۆڤ و بیترسێنێت و هەڕەشە بێت.
(٣٣٤) بوو بە ئاژاوە و شەڕ و قەڵەباڵغیی و دەرگای گرتن و شەڕی ئەوان نەبوو.
(٣٣٥) واتە بۆتە دەردێك و ناخی گرتووە، زوو زوو سەرهەڵدەداتەوە.
(٣٣٦) بەو کەسانە دەوترێت خۆیان بە لایەنگیری هیچ کەس نازانن بەڵام سوودمەندن و لە هەردوولا دەخۆن.
(٣٣٧) واتە ئەو کەسە ئەو لێهاتووە نییە تەنها سنگ دەردەپەڕێنێت، خۆی گرنگ دەردەخات.
(٣٣٨) واتە ئافرەتێك بە شیڕ و هوڕ دەستپێشکەری هەموو شتێك بکات.
(٣٣٩) واتە هزر و کەسایەتی خۆی بەکارناهێنێت بۆتە پیاوی خەڵکیی.
(٣٤٠) بۆ ئەو کەسانەیە ناوێرن ڕاستەوخۆ بەرامبەر بە کەسێك بدوێن بە ناراستەوخۆ دەیدرکێنن.
(٣٤١) بە کەسێك دەڵێن وەکو لێهاتوو نییە و خاوەنی هەڵەکردنیشە.

**بووك و خەسوو ڕێ ناكەویت، كەر بە پەیژەدا سەر ناكەویت.**[٣٤٢]

**بووكە بە بارانێ، سەعاتی جارانێ، ئاوی بن دەغلانێ، دەمی بووكێ شیرین كەن بە تەماتە سووری كەن.**[٣٤٣]

**بووكان بۆیان گەند و گۆ، كچی من دوواكەوت لە شوو، دووایش جوانی جوانانی بوو**[٣٤٤]

**بووك لەسەر زین دەگەڕێتەوە.**[٣٤٥]

**بۆ هەر دەردێك دەوایەك.**[٣٤٦]

**بۆ یەكێك بمرە بۆت بمرێت.**[٣٤٧]

**بۆ دۆستێك هەزار كەمە، بۆ دوژمنێك یەكێك زۆرە.**[٣٤٨]

---

(٣٤٢) واتە ئەمە دوو شتی موستەحیلە.

(٣٤٣) ئەمە نەریتێكی كوردەوارییە، كاتێك مەترسی بێ بارانی هەستی پێ دەكرێت هەندێك ژن نەزر دەكەن جوانترین جلی كوردی خۆیان لە بەری دارێك بكەن و بیدەنە دەست مندالان و بیخەنە بەردەمی مالان و بووكە بە بارانێ بلێین و خاوەن مالەكان ئاو و گەنم و نوقل هەلدەن بەسەریانا.

(٣٤٤) هەندێك خەسوو جیاوازیی دەكەن لە بەینی بووك و كچ و مندالەكانیان. ناز نادەن بە منالی بووك و كورەكانیان. زیاتر خۆشییان بۆ كچ و زاوا دەوێت.

(٣٤٥) لە كوردەواریدا گرفتی خێلەكی ئەوەندە زۆرە. بووك لە كاتی گواستنەوەدا دەگەڕێنەوە یان شایەكەیان لێ دەكەن بە شین.

(٣٤٦) خوای گەورە بۆ هەر دەردێك دەرمانی خۆی بۆ داناوە. هیچ دەردێك بێ دەرمان نییە.

(٣٤٧) واتە بۆ كەسێك دلسۆز بەو خزمەتی بكە ئەویش وابێت بۆت.

(٣٤٨) دۆست تا زۆر بێت باشترە، مرۆڤ زیاتر دلنیاتر دەبێت لە ژیاندا بەلام

**بۆ ریش چوو، سمێلی نایە بانی.**(٣٤٩)
**بۆ نانێك ماڵی خۆی جیا دەكاتەوە.**(٣٥٠)
**بۆسۆی لیهەڵناستێت.**(٣٥١)
**بۆیە پێت دەڵێم كاكە چۆلەكەم بۆ بگریت.**(٣٥٢)
**بۆتە مووروی غەیبی.**(٣٥٣)
**بۆ نەفسێم نییە بۆ قەیریمە.**(٣٥٤)
**بۆ سۆرە نیسكێك زۆرە.**(٣٥٥)
**بۆ تاریكیی، مۆمێك زۆرە.**(٣٥٦)

---

دوژمن واتە دژایەتیی و دوژمنایەتیی و بێ ئارامیی.
(٣٤٩) بە كەسێك دەوترێت بۆ كارێكی خێر و قازانج بچێت. بە زەرەر و كەوتنێكی گەورەوە بگەڕێتەوە.
(٣٥٠) بە یەكێك دەوترێت لای خۆی ئاسایی بێت لەسەر نان و سفرەی تۆ بخوات، بەڵام ڕێگرە لە ئاستی كەسانێك نانی ئەو بخۆن.
(٣٥١) واتە زۆر شڕ و ڕەزیل و پیسە.
(٣٥٢) واتە بۆیە بە گەورە سەیرت دەكەم و دەستی ڕێزم هەیە بۆت. تۆش بچووك سەیرم كەیت و یارمەتیم بەیت و ئاگات لێمبێت.
(٣٥٣) بە كَسێك دەوترێت كەم دەركەوێت و شوێنی دیاریكراوی نەبێت.
(٣٥٤) مرۆڤ بە ژەمێكی خەڵكیی تێر ناخوات. بەڵام شتی باش و خواردنی جوان دەرخواردی میوان بدرێت بۆ ڕێزگرتنی.
(٣٥٥) كەواتە ئەگەر كەموكورتییەك، نەنگێك، عەیبێك یان خەتایەك بوو مەیەڵە بێگانە بیزانێت.
(٣٥٦) بۆ تەنگانە و نەبوونی یارمەتیی كەمیش بێت هەر باشترە لە پشت تێ كردن.

**بۆت نەسازا، مەیخوازە.**[٣٥٧]
**بۆتە چەرمی چۆلەکە.**[٣٥٨]
**بۆتە کۆلەوژی ناو تەنوور.**[٣٥٩]
**بۆتە ئەسپێی کراسە کۆن.**[٣٦٠]
**بۆتە رەسمی دیوار.**[٣٦١]
**بۆتە بەردی بن گۆم.**[٣٦٢]
**بۆ شقارتەیەك مزگەوتێك دەسووتێنێت.**[٣٦٣]
**بۆنی شیری خاو لە دەمی دێت.**[٣٦٤]

---

(٣٥٧) ئەو کارەی بۆت نەگونجا، زۆرە ملیٚ مەکە و وازی لیٚ بێنە.
(٣٥٨) واتە بە دەست هەموو کەسێکەوە ئاسانە.
(٣٥٩) واتە کەوتۆتە دەست ئاگرباز و ئاگری پێخۆش دەکەن
(٣٦٠) بە کەسێك دەوترێت کە کەسێکی گرت بەرۆکی بەرنەدات و بێزاری بکات.
(٣٦١) بە یەکێك دەوترێت هیچ هەستی تێدا نەبێت.
(٣٦٢) بە کەسێك دەوترێت خۆی شاردبێتەوە و خۆی بێدنگ کردبێت و جوولەی لە خۆی بڕیبێت بۆ ئەوەی نەبینرێت.
(٣٦٣) کەواتە کەسێکی خۆپەرست لە پێناوی شتێکی کەمی خۆیدا بەتەنگەوە نایەت زەرەرێکی گەورە بەرپا بکات.
(٣٦٤) بە کوڕێکی تازە پێگەیشتوو دەوترێت کاری پیاوێکی گەورە بکات.

# پیتی ( پ )

**پا پۆرەکەی نووقم بووە.** (٣٦٥)
**پاروو تا نەیجویت قووت نادرێت.** (٣٦٦)
**پاروو لە دەم داکەوێت بۆ کۆش باشە.** (٣٦٧)
**پارە بۆ نامەرد رووزەردیی دێنێت.** (٣٦٨)
**پارە پارە پەیدا دەکات.** (٣٦٩)
**پارە بدەیت، مەلا لە مزگەوت دەردەکەیت.** (٣٧٠)
**پارە چڵکی دەستە.** (٣٧١)
**پارەی حەرام کیسە دەدڕێنێت.** ( ٣٧٢ )
**پارەی سپی بۆ ڕۆژی ڕەش.** (٣٧٣)

---

(٣٦٥) خەمێکی زۆر دایگرتووە لە ئەنجامی زیانێکدا.
(٣٦٦) قسە تا بیری لیّ نەکەیتەوە فڕێی نەدەیتە دەرەوە.
(٣٦٧) خێر و چاکیی و سوودت بۆ کەسوکار و دراوسیّ و ناسیاوت چاکترە.
(٣٦٨) پیاوی نامەرد پارەدار بێت دەکەوێتە کاری خراپ.
(٣٦٩) کە پارەت زۆر بوو کاسبی و بازرگانی پێوە دەکەیت سەروەتت زیاد دەکات و دەوڵەمەند دەبیت.
(٣٧٠) مرۆڤ خاوەنی پارە بوو هەموو شتێکی پێ دەکرێت.
(٣٧١) واتە بە پارەوە مەنازە، چونکە پەیا دەکرێت و لە دەستیش دەچێت
(٣٧٢) کەوابێ ڕەنج بۆ رزق و پارەی حەڵاڵ بدرێت چاکە، پارەی حەرام زوو لە دەست دەچێت و بێ بەرەکەتە.
(٣٧٣) پاشەکەوتکردن پێویستە بۆ ڕۆژانی تەنگانە و پیری.

پاروو لە دەم دەفرێنێت.[٣٧٤]
پەتی درۆ کورتە.[٣٧٥]
پەرژینی پیاو ڕەوشتە.[٣٧٦]
پەردەی بە ڕووەوە نەماوە.[٣٧٧]
پەڕۆیەك لە من دادرە.[٣٧٨]
پەڕۆی بە دەمەوە نییە.[٣٧٩]
پەڵە پیتکەی لێدەی شەق دەبات.[٣٨٠]
پەلولەش دەم دەسووتێنێت.[٣٨١]
پەمووش لە شارەزوور زۆرە.[٣٨٢]
پەنجەی خۆی گەست.[٣٨٣]

---

(٣٧٤) واتە تەماعکار و جەردەیە لە نان پەیداکردندا.
(٣٧٥) واتە درۆ سەر ناگرێت، ڕاستیی هەر دەردەکەوێت.
(٣٧٦) سنووردانان بۆ پیاو ڕەوشتی بەرزە دەبێتە پەرژینی.
(٣٧٧) واتە شەرمی خروری نییە و سنووری بەزاندووە لە بێ ڕەوشتیدا.
(٣٧٨) واتە کەسێك دەیڵێت: زۆری بەسەر هاتووە، بەرامبەرەکەی ئارام بگرێت.
(٣٧٩) دەمشڕ و جنێوفرۆشە و ڕێز لە کەس ناگرێت.
(٣٨٠) بە کەسێك دەوترێت زۆری بۆ هاتووە و ناتوانێت ئیتر ئارام بگرێت.
(٣٨١) بە کەسێکی بێ بەها دەوترێت توانجی گرتبێت یا کارێکی ناپەسەندی کردبێت.
(٣٨٢) واتە شتێك دەگمەن بێت لە جوانیی و چاکیی نرخدا چاکترە.
(٣٨٣) بە یەکێك دەوترێت دوای کارێکی ناپەسەند ناشرین زۆر پەشیمان بێت.

**پەنا هەر پەنای خوایە.**(٣٨٤)
**پەنا بەریت بۆ بیگانە، دەتکات بە پەندی زەمانە.**(٣٨٥)
**پەتپەتێتی دنیای پێ کراوە.**(٣٨٦)
**پرسا بەو زانابە، پرسا بەو دانابە.**(٣٨٧)
**پشت کۆڵی پشت دەرگامە.**(٣٨٨)
**پشت بە نامەرد مەبەستە.**(٣٨٩)
**پشتی دەستی خۆی داخ کرد.**(٣٩٠)
**پشتی یەکتر نادەن لە زەوی.**(٣٩١)
**پشیلە لە ماڵی ناشتا ناکات.**(٣٩٢)

---

(٣٨٤) واتە ژیان و مردن و خۆشیی و ناخۆشیمان بە دەست خوایە. پێویستە پەنا بەرین بۆ خوا و بەرنامە گەورەکەمان قورئانی پیرۆز بێت.
(٣٨٥) وامان تێ دەگەیێنێت خزم و کەسوکار هەرچۆنێك بن لە بێگانە چاکترن.
(٣٨٦) واتە زۆر ئازار و ئەشکەنجەی دیوە لە ژیانیدا.
(٣٨٧) ئەگەر کەسێك بیەوێت زانا و دانا و بەتوانا بێت پێویستە بۆ هەموو شتێك ڕێنمایی لە خۆی چاکتر وەرگرێت. سەربەخۆ سەری بێ دەلاك نەتاشێت.
(٣٨٨) واتە ڕابەر و ئەمینداریتی لە ماڵەکەیدا و پاسەوان و دڵسۆزیتی.
(٣٨٩) ئەوەی پشت بە نامەرد ببەستێ کاری دەوەستێ.
(٣٩٠) واتە دوای ئەو هەڵەیە جارێکی دیکە دووبارەی ناکاتەوە.
(٣٩١) بە کەسانێك دەوترێت زۆر یەکگرتوو خۆشەویست بن و بەرژەوەندی یەکتر بپارێزن تا خاڵی مردن.
(٣٩٢) واتە زۆر ڕەزیل و چروکن تێر بە سکی خۆیان ناخۆن.

**پشیله دەمی نەگەیشتە دووگ، دەیوت سوێرە.**[393]
**پشیله لە ماڵ نییە مشکان تلیلیانە.**[394]
**پشیلەی کوێر خێر لە دەستیان نابێتەوە.**[395]
**پشیلە گووی بە دەرمان بوو دەیشاردەوە.**[396]
**پیاما بکەن سووژن، بانگم بکەن ئاغاژن.**[397]
**پیاو قوتابییە و رۆژگار وانەیە**[398]
**پیاو قوتابی ژنە. ژن مامۆستای شەیتانە.**[399]
**پیاو بوخچەی نەکراوەیە.**[400]
**پیاو کە زۆری وت چاکیش دەڵێت و خراپیش دەڵێت.**[401]

---

(٣٩٣) بە کەسێك دەوترێت بێ توانا و بێ دەست و دەرامەت بێت شتێکی باشی بۆ نەبێت لە بێ دەسەڵاتی خۆی وا دەڵێت.
(٣٩٤) بەو خێزانانە دەڵێن کە گەورەکانیان زۆر دیکتاتۆرن، بچووکەکان سەربەست نین لە ماڵی خۆشیان بجوڵێنەوە.
(٣٩٥) واتە میهرەبان نین بۆ هەژار و لێقەوماوان.
(٣٩٦) بە کەسێك دەوترێت کارێکی بە دەست بێت خۆی بشارێتەوە خێر نەداتەوە بۆ کەس.
(٣٩٧) ئەو کەسانەی بە رووکەش حەز بە ناوبانگ و لەقەب دەکەن گوێ نادەنە راستی ژیانیان و ناخیان بۆ دوژمن کوێرکەری.
(٣٩٨) هەموو کەس لە رۆژگارەوە وانە فێر دەبێت وەکو تاقیگەیەك.
(٣٩٩) کەوابێ پێویستە پیاو گوێ لە ژن بگرێت و عەقڵی لێ وەرگرێت.
(٤٠٠) پیاو تا ژن نەهێنێت و خێزان دروست نەکات. بە زگوردێتی ناتوانێت بچێتە هەموو شوێنێك و ماڵێك.
(٤٠١) هەموو کەس دەبێت بەپێی پێویست قسە بکات هەڵەوەر نەبێت.

**پیاو ناچار بوو، بە نامەرد دەڵێت بەڕیشی مەردانەت قەسەم.**(٤٠٢)

**پیاو نەمرێت بە هەموو ئاواتێك دەگات.**(٤٠٣)

**پیاو چەترە بۆ ژن چادرە بۆ خێزان.**(٤٠٤)

**پیاو قسەیەکیش بۆ خوا بکات.**(٤٠٥)

**پیاو مێرووڵەیەکیش دوژمنی نەبێت.**(٤٠٦)

**پیاو و پیاوەتیان وتووە.**(٤٠٧)

**پیاوخراپ خۆزگە وەکو هەنگ دەبوو، لە دوای پێوەدان ڕۆحی دەردەچوو.**(٤٠٨)

**پیاوەتی بە ئیشە، نەك بە ڕیشە.**(٤٠٩)

**پیاوەتی بەسەر ئاوی حەمامەوە دەکات.**(٤١٠)

---

(٤٠٢) جاروبار کارت دەکەوێتە لای کەسانێك چاك دەیان ناسیت ناهێنن بەڵام ناچاریت سوێند بە سەریان بخۆیت و ڕێزیان لێ بگریت.

(٤٠٣) ئەگەر خوا تەمەن بدات هەموو شتێك بە دڵی خۆت دەبینیت.

(٤٠٤) پیاوی بە حەیا و ڕەنجدەر هەموو شتێکە بۆ دوارۆژی ژن و منداڵ.

(٤٠٥) واتە هەموو جارێك ناهەق نەڵێن خوا ئاگای لێمانە.

(٤٠٦) واتە دوژمن بچووکیش بێت زەرەری زۆرە .

(٤٠٧) کەوابێ وشەی پیاو هێمای کار و کردەوەی جوانە.

(٤٠٨) واتە ئەوەی بیەوێت خراپەکار بێت تووشی ئازاری ویژدان ببوایە و پێی بمردایە.

(٤٠٩) کەوابێ شێوە و ڕووکەش گرنگ نییە، بەڵکو کار و کردەوە شەرتە.

(٤١٠) بە کەسێك دەوترێت خۆی پیاوەتی و چاکە لە دەست نایەت چاکە بەسەر ماڵی خەڵکییەوە دەکات.

**پیاوێ خوێری بوو، ژنی دەدەن بە شوو.[٤١١]**
**پیاوی چاك چەتری سەرە. گەر شریش بێت ئاو دادەرە.[٤١٢]**
**پیاوی سەرڕاست شەریکی دەوڵەمەنّدە.[٤١٣]**
**پیاوی نابووت خەمی دوور و قەرزی کۆن بە یاد دەکات.[٤١٤]**
**پیاو بە گەورەیی فێری پلاوخواردن بێت، دەست بۆ لووتی دەبات.[٤١٥]**
**پیاوێك ژنی مرد بۆی راکە، تەلاقیدا لێی ڕاکە.[٤١٦]**
**پیاوی دوو ژنە جەرگی کون کونە.[٤١٧]**
**پیاوی پەشیمان شاخی لێ دەڕوێت.[٤١٨]**

---

(٤١١) کەوابێ پیاوی خوێری ئاگای لە ماڵ و منداڵی نییە، خەڵکیی دەست دەخاتە کاری ماڵیەوە.
(٤١٢) واتە سەرۆکی خێزان دەبێت زۆر چاك بێت خراپیی و زەرەری بۆ خێزانی خۆی نەوێت.
(٤١٣) لەبەر ئەوەی جێی متمانەیە بۆ دەوڵەمەند قەرزی دەداتێ.
(٤١٤)پیاوی نابووت وەرەسەی باوکی و خزمی دوور و قەرزی کۆن بە یاد دەکات.
(٤١٥) بۆ گاڵتەوگەپ ئەمە دەوترێت کە کەسێك بە نەشارەزایی کارێك بکات و هەڵەی تیادا کردبێت.
(٤١٦) کەوابێ پیاوی ژن مردە قەدری ژنی دووەم زیاتر دەگرێت. بەڵام پیاوێك ژن تەڵاق بدات قەت ژن ڕاگر نییە.
(٤١٧) کەوابێت پیاوێك دوو ژنی هەبێت. هەردوو ژنەکە ڕقی دڵیان بە پیاوەکە دەڕێژن.
(٤١٨) واتە پیاو دەبێت عاقڵانە دەستباتە کارەکانی پەشیمانیی لەدوا نەبێت.

پیاوی شیاو بۆ جێی شیاو، پیاوی نەشیاو بۆ کورسی شکاو.[٤١٩]
پیری و سەد عەیب.[٤٢٠]
پیری لە پیری مەروانە، لە هەوڵ و داوی بروانە.[٤٢١]
پیر بۆت نەکات تەگبیر، نابێت بە میر.[٤٢٢]
پیرە، بە ڕاو و تەکبیرە.[٤٢٣]
پێی پیادا چزاوە.[٤٢٤]
پێی زل نەگبەتە، سەری زل دەوڵەتە.[٤٢٥]
پێ بە قەد بەرەکەی خۆت ڕاکێشە.[٤٢٦]
پێکەوە ناچینە جەوالێکەوە.[٤٢٧]
پێکەوە لە مەنجەڵێکدا ناکوڵێن.[٤٢٨]

---

(٤١٩) کەواتە کەسی لێهاتوو دەشێت لە جێگای چاکدا کار بکات. بەڵام نەشیاو و لێنەهاتوو کار نەکات چاکترە.
(٤٢٠) مرۆڤ پیری و سستی ڕێگرە بۆ هەموو کارەکانی ئەوەش کاری یەزدانە هەموو گەنجێك پیر دەبێت و دەمرێت و لە پیریدا ئەوە دەڵێتەوە.
(٤٢١) هەندێك پیر پیریی پێوە دیار نییە لەبەر ئەوەی تەندروستیی باشە.
(٤٢٢) واتە پیر بە ئەزموونە.
(٤٢٣) پیریی زۆر شتت لە دەست دەدات و زۆر شتت فێر دەکات.
(٤٢٤) واتە زەرەرمەند بووە. وانەی لێ وەرگرتووە.
(٤٢٥) دەبێت ئەزموون بوو بێت لای کۆنەکان و تاقیان کردبێتەوە قاچ زلەکان نەگبەت بوون و سەر زلەکان بە دەوڵەت بوون.
(٤٢٦) بە پێی بوون و گیرفانی خۆت خەرج بکە و زیادڕەویی مەکە.
(٤٢٧) لەگەڵ یەکتردا ناتوانن بژین.
(٤٢٨) واتە سروشت و بیرکردنەوەیان جیاوازە.

پێکەنینی زۆر گریانی بە دوادا دێت.[٤٢٩]
پێبکەنە لەگەڵ دنیا، بۆخۆت بگری بە تەنیا.[٤٣٠]
پێشکەوتووی دواکەوتووە.[٤٣١]
پێنج پەنجەی دەست هەمووی چوونیەك نییە.[٤٣٢]
پێی بەو پشکۆیەدا چزاوە.[٤٣٣]
پیرێك لە خۆشیا و جوانێك لە ناخۆشیا، وەك یەك دەبن.[٤٣٤]
پێم دەڵێت خاڵە، گوایە من پیرم، تاڵاوی نەشتەر دەدات لە بیرم.[٤٣٥]
پێی دەڵێم نێرە، دەڵێت بیدۆشە.[٤٣٦]
پیاز پاکەرە، پڕ بە پێستێتی.[٤٣٧]

---

(٤٢٩) زۆر پێکەنین سروشتی نییە و ناپەسەندە.

(٤٣٠) بە کارێك دەوترێت کە هێشتا سەری نەگرتووە، خاوەنەکەی کەشوفش دەکات.

(٤٣١) لە سەرەتاوە زۆر کۆششی کردووە و سەرکەوتوو بووە. بەڵام بێ ئەنجام بووە.

(٤٣٢) مرۆڤ هەمووی وەك یەك دروست نەبوون، جیاوازیی زۆرە لە بەینیاندا.

(٤٣٣)واتە تووشی هەمان گرفت بووە، ئەمجارە خۆی لێ دەپارێزێت.

(٤٣٤) وا دەگەیەنێت پیر بەخۆشیی گەنج دەبێتەوە و گەنجیش لە ناخۆشیدا پیر دەبێت.

(٤٣٥) هەندێك کەس بە لایەوە ناخۆشە زیاد لە سنووری تەمی بانگ بکرێت.

(٤٣٦) بە دوو کەس دەوترێت هیچ لە یەکتر نەگەن.

(٤٣٧) واتە هەر خەریکی مەرایی و ڕیایی و شان تەکاندنی خەڵکە.

**پیازی عەوالأنە، خواردنی هەیە و بردنی نییە.**[438]

---

(٤٣٨) هەندێك كەس ناچارە لە ماڵی خۆیدا خوڵقی خەڵكیی بكات نان بخوات، بەلأم خێر و خوایشتی ناچێتە ئەودیوو دەرگایەوە، دەڵێت پیازی عەوالأنە.

# پیتی (ت)

**تا ئاش ئاشه، کەچەڵ فەراشه.[٤٣٩]**
**تا ئەم بایە لەم کونەوە بێت، هیچ بە هیچ نابێت.[٤٤٠]**
**تا بەد نەبینیت، بەدخانە بە یاد ناکەیت.[٤٤١]**
**تا بۆ خۆمم سەند قیر سپی بوو.[٤٤٢]**
**تا بۆی تێکەیت نالێت بەسە.[٤٤٣]**
**تا بەخشندە بیت، خوا پێت دەبەخشێت.[٤٤٤]**
**تا گوێرەکە بە گا دەکەیت، خوێنی خۆت بە ئاو دەکەیت.[٤٤٥]**
**تا پیرێك دەمرێت، هەزار جوان دەمرێت.[٤٤٦]**

---

(٤٣٩) تا ئیش و کار و خێر لەو شوێنەدا بمێنێت ئەم بە جێی ناهێڵێت.
(٤٤٠) کەسێك دەیڵێت کارێکی خێری بە دەستەوە بێت کە بەربەست هەبێت لەلایەکی دیکەوە بۆی سەر نەگرت.
(٤٤١) کەسێك دەیڵێت لەوە پێش خراپیی لە یەکێکەوە دیبێت، ئێستا لەو خراپتری لێهەڵکەوتووە، خۆزگە بە یەکەم دەخوازێت.
(٤٤٢) کەواتە ئەو هیلاکییەی بۆ خۆی کردوویەتی. کەس بە تەما نەبێت.
(٤٤٣) واتە کەسێکی تەماعکار و چاو برسییە و چاو و ورگی تێر نابێت.
(٤٤٤) هەموو کەسێکی دڵ و دەستکراوە و بەخشندە، خوای گەورە زیاتری پێ دەبەخشێت.
(٤٤٥) واتە تا منداڵێك گەورە دەکەیت، بە هیلاك دەچیت.
(٤٤٦) ئەو قسەیە باوە هەموو کەس دەیڵێتەوە (لە مردنی گەنجاندا).

**تا چیلکەی تێوە دەیت بۆنی دێت.[٤٤٧]**
**تا تاریك نەبێت کەس چرای ناوێت.[٤٤٨]**
**تا تۆ و نەوەشێنیت، خەرمان هەڵناگیرێت.[٤٤٩]**
**تا جێی رم نەکەیتەوە نەیچەقێنیت.[٤٥٠]**
**تا جی ڕەوشت لەسەرنێ، هەموو جیهان لەبەرنێ.[٤٥١]**
**تا خان دەسازێت، لەشکر دەترازێت.[٤٥٢]**
**تا خاوەن ماڵ دزی گرت، دز خاوەن ماڵی گرت.[٤٥٣]**
**تا دەڵێت ترێ ، بەرسیلە پێدەگات.[٤٥٤]**

---

(٤٤٧) بەو کەسانە دەڵێن تا بیاندوێنیت هەڵە زیاتر دەکەن.
(٤٤٨) تا مرۆڤ نەکەوێتە تەنگانەوە بیر لە چرا و ڕووناکیی ناکاتەوە و فریای خۆی ناکەوێت.
(٤٤٩) واتە تا هەوڵ و تەقەڵ نەدەیت بەرنامە دەست بەکار نەکات.
(٤٥٠) پێویستە هیچ کەس بەبێ بیر و بەرنامە دەست بەکار نەکات.
(٤٥١) مرۆڤێك کە ڕەوشت بەرز و جێی متمانە بوو، دەتوانیت هەموو جیهان بەرێت بەرێوە.
(٤٥٢) بە کەسانێکی تەمەڵ و لێنەهاتوو دەوترێت کە هەر ڕێك نەکەوێت و نەسازێت و ئامادە نەبێت.
(٤٥٣) بە کەسێك دەوترێت ماف بەلای خۆیەوە بێت، بەڵام کەسێکی دیکە هەڵدەکوتێتە سەری و دەسپێشخەری دەکات.
(٤٥٤) بە کەسێك دەوترێت زۆر سست و بێ توانا بێت لە کار و بەرگریکردن لە خۆی.

**تا دەوران چەکوش نەدات بەسەردا، بەرگی تەسلیمی ناکریت بەبەردا.**[٤٥٥]
**تاریکیی مانگ سەر لە ئیوارە دیارە.**[٤٥٦]
**تا ریوی قەوارەی خۆی خویندەوە، پیستیان گروو.**[٤٥٧]
**تا زەوی تیر ئاو نەبیت، گیا ئاو ناخواتەوە.**[٤٥٨]
**تازە هاتە روو، کۆنە پیش کەندوو.**[٤٥٩]
**تازە کورەن، دایم توورەن.**[٤٦٠]
**تازە هات کۆنە خەلاتە.**[٤٦١]
**تا زۆر بژیت، زۆرتر دەبینیت.**[٤٦٢]
**تا ژیر بیری کردەوە، شیت لە ئاو پەرییەوە.**[٤٦٣]

---

(٤٥٥) کەوابێ زەمان و تەمەن و بەسەرهات مرۆڤ فێری هەموو شتێك و ئارامگرتن دەکات.

(٤٥٦) کەوابێ هەموو کارێکی سەرنەکەوتوو لە سەرەتاوە دیارە.

(٤٥٧) دەبێت مرۆڤ کاتێك گرفتێکی هەبوو. پێشوەخت فریای خۆی کەوێت.

(٤٥٨) تا ئاغا لێی زیاد نەبێت، رەنجبەر هیچی بەرناکەوێت.

(٤٥٩) هەموو شتێکی تازە و جوان لە روودا دەنرێت. بەلام شتی کۆن و بێ کەلك دەخرێتە پەناوپاسار دەشاردرێتەوە.

(٤٦٠) ئەوانەی هەرزەکار و لاون خۆراگر بن زۆر زوو هەلدەچن.

(٤٦١) کە خوا تازەی دا با کۆنە بکات بە خێر یان خەلاتی بکات.

(٤٦٢) واتە تا تەمەن درێژتر بێت مرۆڤ زیاتر دانا و بە ئەزموون دەبێت.

(٤٦٣) پێویستە مرۆڤ خۆی گۆشەگیر نەکات بە بیرکردنەوە، ئاژاش بێت لە راپەرینی کارەکانیدا لە کاتی خۆیدا.

تا شوو دەکەیت میریت، کە شووت کرد گزیری، کە سکت کرد پیری.(٤٦٤)
تا شاخێك نەرووخێت، کەندەڵانێك پڕ نابێتەوە.(٤٦٥)
تا فەرز وەستا بێت، سونەت بەتاڵە.(٤٦٦)
تا کەر لە بەغدا نەزەڕێت بەری نادات.(٤٦٧)
تا کچ بمێنێت بەخت دەهێنێت.(٤٦٨)
تاك و تەنیایی تەنها بۆ خوایە.(٤٦٩)
تاکێك کەوش و تاکێك کڵاش، ماندوو نەبی مام تەرەماش.(٤٧٠)
تا کوونێك دەگرێت سەد کوونی تری تێ دەبێت.(٤٧١)

---

(٤٦٤) ئەمە قسەیەکی کۆنە بە کچان دەوترێت.
(٤٦٥) تا کەسێکی چاك و بەرز نەفەوتێت، بچووکێك سەرهەڵ نادات و پێ بگات و دەرکەوێت.
(٤٦٦) کەواتە هەندێك کاری پێویست دەبێت پێش بخرێت و لە کاتی خۆیدا جێبەجێ بکرێت.
(٤٦٧) لە کۆنا وتراوە کە قرژاڵ هەر کەسێکی گەزت تا کەر لە بەغدا نەزەڕێت بەری نادات. بۆ ئەوەی خەڵکیی لە جانەوەری ناو ئاو بترسێت و دەستی بۆ نەبات.
(٤٦٨)بە دووروو لێك دەدرێتەوە. یەکەم: بۆ ڕەچاوکردنی باری دەروونیی. دووەم: کچێك بمێنێتەوە زیاتر شارەزا و قاڵ دەبێت لە بەڕێوەبردنی ماڵ بەخێوکردنی منداڵ.
(٤٦٩) تاك و تەنیایی بۆ خوا هاتووە. بۆ مرۆڤ تەنیایی گرانە.
(٤٧٠) واتە کەموکورتیی ژیانی مرۆڤ، مرۆڤ ماندوو دەکات.
(٤٧١) کەسێك دەیڵێت کە گوزەران و ژیانی لە تەنگانەدا بێت و ئەوەی پەیدا دەکات بەشی بژێوی ژیانی نەکات.

**تا گەنج بووم خزانمی، کە پیربووم ترانمی.**[٤٧٢]
**تا لووت لە بەردی ئەلحەد نەکەوێ، نازانێ جێگای ئەسڵیتە ئەوێ.**[٤٧٣]
**تالیی و سوێریی زۆر چێشتووە.**[٤٧٤]
**تالانکراو بە ماڵ دەبێت، سکەرۆ بە ماڵ نابێت.**[٤٧٥]
**تا ما مراندی، کە مردیش تراندی.**[٤٧٦]
**تا ماڵ وەستا بێت بە مزگەوت حەرامە.**[٤٧٧]
**تا مابووم پێڵاوێك نەبوو لە پام، کە مردیشم هەزار جووت جێما لەدوام.**[٤٧٨]

---

(٤٧٢) کەوابێ تا گەنج بووە نەیهێشووە تامی ژیان بچێژێت کاتێکیش کەوتۆتە تەمەنەوە بۆ مردن دانراوە.
(٤٧٣) پێویستە هەموو مرۆڤێك لە ژیاندا بیر لە مردن بکاتەوە و بەشی ئەو دنیاشی تێدا بهێڵێت.
(٤٧٤)واتە نەهامەتی و داماویی و نەداریی و نەخۆشیی لە ژیانیدا زۆری دیوە بۆیە بۆتە نموونەی مرۆڤ.
(٤٧٥) ماڵی تالانکراو و سووتا و لەسەر تەرزی تازەتر دروست دەکرێتەوە بەڵام زۆرخۆر و سکدرا و موسریف بە ماڵ نابێت.
(٤٧٦) واتە لە ژیاندا بۆی نەبووە و بە کەم مامەڵەی کردووە و کاتێ مردیش بە ڕیزەوە بە ڕێی نەکردووە.
(٤٧٧) واتە هەموو ڕەنجت بۆ خۆت و ماڵەکەت پێویستە پێش مزگەوت.
(٤٧٨) واتە کاتێك هەموو ئاواتی پۆشتەیی و بوون بووە هیچی نەبووە بەڵام کاتێك نزیك کەوتۆتەوە لە مردن و پیریی بۆتە خاوەنی هەموو شتێك.

**تـامی، تـامیی گەنمەشامی.**[٤٧٩]
**تـا نەینایە تەبەق، نەیووت ئەڵڵاهو سەدق.**[٤٨٠]
**تـانەی دۆست لە تـیری دوژمن تیژتـرە.**[٤٨١]
**تـاوانکار وا بەلای یارەوە، بێ تـاوان سەری وا بە دارەوە.**[٤٨٢]
**تـاوێ گەشە و تـاوێ رەشە.**[٤٨٣]
**تـا ووتـم بسم اللە وتـی الحمدوللە.**[٤٨٤]
**تەبەقی پڕ ئـاشتیی ماڵە.**[٤٨٥]

---

(٤٧٩) ئەمە قسەیەکی زۆر کۆنە واتە ئەوەی زۆر بە دەرامەت بووە خۆی دوور و تەرە گرتووە لە نەدارەکانەوە.

(٤٨٠) بە کەسانێکی بێ هۆش و کەشوفشکار دەوترێت. دوای بوونێکی زۆر هیچیان بە دەستەوە نامێنێت دەکەونە سواڵ

(٤٨١) توانج و توانەی کەسی نزیك و دۆست و خزم زۆر گران و تیژترە لە بیر ناچێتەوە، چونکە گشت کات چاوەڕوانی چاکیی لە مانە دەکرێت. بەڵام لە دوژمن چاوەڕوانی هەموو خراپەیەك دەکەیت بەلاتەوە زۆر گرانە نییە. چونکە دەتوانیت تۆش حەقی خۆتی لێ بکەیتەوە.

(٤٨٢) بە کەسێکی بێ گوناهو بێ خەتا دەوترێت لە جیاتی گوناهبارەکە تووشیان گردبێت.

(٤٨٣) بەوکەسانە دەوترێت ئەوەندە مەنگ و بێدەنگن ناخوێنرێنەوە.

(٤٨٤) واتە ئەو کەسانەی بە پەلەن لە خواردن و هەموو شتێکدا کەس پێیان ناگاتەوە.

(٤٨٥) دەوڵەت و بوون و تێروپڕیی و ئاشتیی و خۆشیی و تێریی دەخاتە ماڵەوە.

**تەپڵی بێعاریی کووتاوە.**[٤٨٦]
**تەرازوو شەرمی لە کەس نییە.**[٤٨٧]
**تەڕ و وشك پێکەوە سووتان.**[٤٨٨]
**تەعزییەی دەوڵەمەند شایی هەژارە.**[٤٨٩]
**تەقەی سەری دێت.**[٤٩٠]
**تەقلە بە فیل لێ دەدات.**[٤٩١]
**تەماع سەری نەبڕێت، سەرت دەبڕێت.**[٤٩٢]
**تەمەڵ دەڵێت هەمووی دەخۆم، دواییش دەڵێت چیم کرد بە خۆم.**[٤٩٣]

---

(٤٨٦) بەو کەسانە دەوترێت لە هەموو ڕەوشت ناپەسەندیەك بوونەتەوە قسەو ڕێنمایی کەس کاریان تێ ناکات.
(٤٨٧) کەواتە هاوسەنگیی و ڕاستیی و عەدالەت شەرم ناکات و لە کەس ناترسێت.
(٤٨٨) واتە چاك و خراپ وەکو یەك زەرەرمەند بوون.
(٤٨٩) دەوڵەمەندەکان لە تەعزیەکانیاندا زۆر مەسرەف دەکەن. هەژارەکان تێر دەبن.
(٤٩٠) واتە مێشکی هیچ وەرناگرێت و عەقڵی نییە. کەس خۆی هیلاك نەکات لەگەڵیدا.
(٤٩١) واتە ئەوەندە فرت و فێڵاویە کەس دەرەقەتی نایەت.
(٤٩٢) کەوابێت مرۆڤ تەماعکار بێت و زۆر پارەی بەلاوە گرنگ بێت لەپێناویدا سەری تیا دەچێت.
(٤٩٣) ئەوەی ڕەنج نادات هەر لە پاڵەوە دەخوات. بە هیلاك دەچێت و پەشیمانە.

تەمەن زۆر شتت لە دەست دەدات، زۆر شتیشت فێر دەکات.[٤٩٤]

تەنها بە ناو بەشەرە.[٤٩٥]

تەندروستیی تاجە وابە سەرەوە، هەتا دەتوانیت لێی مەکەرەوە.[٤٩٦]

تەور کلکی خۆی نابڕێتەوە.(٤٩٧)

تەیر هەیە گۆشت دەخوات، تەیر هەیە گۆشتی دەخورێت.[٤٩٨]

تەیری گول عاشق بە داری زەقنەبووتە.[٤٩٩]

تری رۆیشتووە و تسی ماوە.[٥٠٠]

ترِی گوێژە دەکێلێت.[٥٠١]

ترِی بێ و بەردەمی رەشەبا کەوێت.[٥٠٢]

---

(٤٩٤) تەمەن و ژیان ئەزموونی چاکت دەداتێ و لە هەمانکاتیشدا زۆر شتیشت لە دەست دەدات.

(٤٩٥) واتە هیچ خەسڵەتێکی مرۆڤایەتی تێدا نییە.

(٤٩٦) تەندروستیی چاك سەروەتی دنیا و تاجی خۆش بەختییە با زۆر ئاگاداری بین.

(٤٩٧) واتە خزم و کەسوکار نابێت شکستی یەکتریان بوویێت.

(٤٩٨)هەندێك کەس هەن زەرەرمەند و بێ سوودن، هەندێك کەسیش باش و سوودبەخشن.

(٤٩٩) بە کەسێك دەوترێت زۆر حەزی لە شتی هیچ و پووچ بێت.

(٥٠٠) بە شتێك دەوترێت نیوە گیان بووبێت.

(٥٠١) بە کەسێك دەوترێت زۆر خۆی بە توانا و کەشوفش بزانێت و لووتی لە ئاستی هەموو کەسێکدا بەرز بێت.

(٥٠٢) بە کەسێك دەوترێت دەمدڕاو بێت نەتوانێت نەهێنیی کەس بپارێزێت.

**تڕ زلی باوان ویران[٥٠٣]**
**تڕ کێ کەندی؟ بیگانە.[٥٠٤]**
**تف هەڵدەیت رووی خۆت دەگرێتەوە.[٥٠٥]**
**تف هەڵدەیت دەییەسێ.[٥٠٦]**
**تفەنگ دەنێت بە تاریکییەوە.[٥٠٧]**
**تفێك رۆکرا هەڵناگیرێتەوە.[٥٠٨]**
**تلپی تەڕی تیا نەماوە.[٥٠٩]**
**توتکیش بێچووی سەگە.[٥١٠]**
**توول بە تەڕی نەچەمێتەوە، بە وشکی دەشکێت.[٥١١]**

---

(٥٠٣) بە یەکێکی دەعیەچی و فشوهوڕکەر بەڵام باوانی ویران و نەدار بێت.
(٥٠٤) هەندێکجار دوای ناکۆکیەکی زۆر لە بەنێنی خزم و کەس یان ژن و مێرد کاتێك ئاشت دەبنەوە. خەتاکە دەخەنە شانی کەسێکی بێگانە.
(٥٠٥) واتە ئەگەر خزم و خێزان و کەسوکار. باسی عەیبی ناخۆیان بکەن خۆیانی پێ عەیبار دەبن و سووك دەبن.
(٥٠٦) ئەوە بۆ ڕۆژانی زۆر سارد دەوترێت. کەس نەچێتە دەرەوە.
(٥٠٧) بە کەسێك دەوترێت بەبێ شارەزایی و ئاگالێبوونی شێك لە خۆیەوە بە ئارەزووی خۆی قسە بکات.
(٥٠٨) قسە و ژوان بەبێ بنەما مەکە، چونکە بەرپرسیار دەبیت و پەشیمانیش نەنگە.
(٥٠٩) واتە ئەو کەسە کەوتۆتە تەمەنەوە، هیچ کارێکی پێی ناکرێت.
(٥١٠) کەوابێ هەموو جنس و نەوەیەك، کردەوەیان وەکو ئەسڵ خۆیەتی.
(٥١١) مەبەستی پەروەردەی مناڵە. لە سەرەتای تەمەنیەوە گرنگی بدرێتێ.

**تۆ مەیکە و خوا بداتێ.**(٥١٢)

**تۆ کالەك خۆریت یان بیێستانرن.**(٥١٣)

**تۆ بنوو وەستای نەجار، خوا یەکە و دەرگا هەزار.**(٥١٤)

**تۆبەی گورگ مەرگە.**(٥١٥)

**تۆش نەبێت بە یارم، خوا دەیسازێنیت کارم.**(٥١٦)

**تۆپینی خۆی و زەرەری خاوەنەکەی دەوێت.**(٥١٧)

**تیکە فرێنە.**(٥١٨)

**تیر دەردەخات و کەوان دەشارێتەوە.**(٥١٩)

**تیر لە کەوان دەرچوو ناگەڕێتەوە.**(٥٢٠)

---

(٥١٢) جاروبار بە ڕێکەوت خوا دەیرێژێنێت بەسەر مرۆڤدا.

(٥١٣) کەسێك خۆی هەڵقورتێنێت لە شتێك پەیوەندیی پێوە نەبێت.

(٥١٤) بۆ کەسێك شەو پەژارەیەکی هەبێت و نەتوانێت یان نەوێرێت بنووێت. بەیانیی توانای بەرەنگار بوونی ئەو کارەی نەبێت. تێبینیی: ئەمە چیرۆکی دارتاش و پاشاکەیە.

(٥١٥) سروشت و تەبیعەتی مرۆڤ چۆن هەڵکەوت تەنها مردن چارەسەری دەکات.

(٥١٦) واتە لە هەموو کارێکدا پەنا بەرن بۆ خوا و توانا و عەقڵی خۆت.

(٥١٧) بۆ کەسێکە بەرنامەی نەبێت بۆ ژیانی خۆی و گوێ نەداتە زەرەری کەس.

(٥١٨) واتە حەڵاڵ و حەرام و عەیبەی لا نییە، تەنها بیر لە سوودمەندیی خۆی دەکاتەوە.

(٥١٩) بە یەکێك دەوترێت قسەی خراپ بە شاراوەیی بەخەڵکیی بڵێت.

(٥٢٠) ئاگات لە قسەکانت بێت. بیچێژە، بینێژە، ئینجا دەریهاوێژە.

**تیر بێ نیشان مەوەشێنە.**[521]
**تیر و شیر لە یەك دەسوون.**[522]
**تێر ئاگای لە برسی نییە.**[523]
**تێر نەخۆرە بانگی کردووە.**[524]

---

(٥٢١) واتە قسەی بێ ئەنجام مەکە، با جێگیر بێت.
(٥٢٢) بە دوو کەس دەوترێت ناحەز بن بە یەکتری.
(٥٢٣) دەوڵەمەند ئاگای لە هەژار نییە.
(٥٢٤) ئەمە قسەیەکی کۆنە بەو کەسانە دەوترێت زۆر خۆرن.

## پیتی ( ج )

**جارجار بە خەروار، جارجار بە مسقاڵ.**[٥٢٥]
**جام کە پڕ بوو لێی دەڕژێت.**[٥٢٦]
**جام دەڵێت بشکێم نەزڕنگێم.**[٥٢٧]
**جامانە شڕی سەڵتە بابردوو، تۆ لە ژنت چی لە برسا مردوو.**[٥٢٨]
**جامباز جامبازە، کۆنە دەفرۆشێت بە نرخی تازە.**[٥٢٩]
**جەرگ ئازاری هەیە و بێزاری نییە.**[٥٣٠]
**جەرگ یان بۆی دەمریت یان پێی دەمریت.**[٥٣١]
**جەنگ بە کۆنە قین دەکرێت.**[٥٣٢]

---

(٥٢٥) وا دەگەیێنێت کە مامناوەند نییە. یان زۆری لە دەست دەبێتەوە یان زۆر کەمی لە دەست دەبێتەوە.
(٥٢٦) مرۆڤ زۆری بۆ هات لە کارێکی بێ سنووردا، هەڵدەچێت.
(٥٢٧) واتە مرۆڤ مردنی باشترە لە بەدناوی.
(٥٢٨) بە کەسێك دەوترێت ئەگەر ئامادە نەبێت بۆ ژنهێنان و ڕاگرتن و بە خێوکردنی. ئەو کارە تووشی خۆی نەکات.
(٥٢٩) بە کەسێك دەوترێت کەسەر لە عالەم دەشێوێنێت، ڕەشت لێ دەکات بە سپی.
(٥٣٠) منداڵ ئەرك و ئازارە بۆ دایك و باوك بەڵام ئارامگرن لە ئاستیانا.
(٥٣١) منداڵ، دایك و باوك خۆیان دەخەنە پێناوی لە مردن و ژیانیدا.
(٥٣٢) واتە کەسێك ڕق و قین و بێزاری کۆنە بێتەوە تیایدا ناتوانێت شەڕ بکات.

**جریوەی چۆلەکە میوان دەهێنێت.**(٥٢٣)
**جنێو مەدە بە باوکی سەگم، با جنێو نەدەم بە باوکی بەگت.**(٥٢٤)
**جنێوێکم پێ بدە و بەسەرم کەرەوە.**(٥٢٥)
**جنۆکە ڕەنگە کش و بێدەنگە.**(٥٢٦)
**جوانیی ناخرێتە پەرداخەوە بخورێتەوە.**(٥٢٧)
**جوانیی بەد ڕەوشت وەك گولی بێ بۆنە.**(٥٢٨)
**جوولەکەیەکی خواناس، چاکترە لە هەزاری بەد خواست.**(٥٣٩)
**جوابی دوور درۆیە.**(٥٤٠)
**جۆگەلە دەریا لیڵ ناکات.**(٥٤١)

---

(٥٢٣) ئەمە ئەزموونێکی کۆنە کە چۆلەکە بجریوێنێت ئەو ڕۆژە میوان دەهێنێت.

(٥٢٤) کەواتە جنێو ئاسانە هەموو کەس لە توانایەتی جنێو بدات بە سەگ و بەگ.

(٥٢٥) واتە پشت لە یەکتر کردن کارێکی ئاسان نییە، با هاوڕێیەتی بمێنێت ئەگەر چی گرفتیش خۆی تیایدا بنوێنێت.

(٥٢٦) واتە بەزمێکی ناوەتەوە و خۆی کەنارگیر گرتووە.

(٥٢٧) واتە جوانی جوانیی ڕوو نییە جوانیی کردار و ڕەوشتە.

(٥٢٨) ڕەوشت و کردار و مامەڵەی جوان مرۆڤی ناشیرینیش جوان دەکات.

(٥٣٩) واتە جوولەکەیەکی خواپەرست و مافناس، چاکترە لە هەزار بەد خواست.

(٥٤٠) کەواتە وەڵامی دوور دەماودەم دەکەوێت و دەگوازرێتەوە تا دەگاتە ئەنجام شێوە ڕاستەکەی دەشێوێت.

(٥٤١) واتە پیاوی گەورە بە قسەی ئەم و ئەو ناشکێت.

جۆ بە دیواردا هەڵدەگیرێت.[٥٤٢]
جیوەی تێدایە و چاو دەنێتەوە.[٥٤٣]
جێگای برین پڕ دەبێتەوە، جێگای قسە چاك نابێتەوە[٥٤٤]
جێگای بە تاڵەو دڵ بۆی عەواڵە.[٥٤٥]
جێگای مەردان سەر تەنوورە.[٥٤٦]
جێ پێی ببینە ئینجا هەنگاو بنێ.[٥٤٧]
جێگاکەی باشە، خۆی تەڕە ماشە.[٥٤٨]

---

(٥٤٢) ئەوندە کاری گرنگ و گرانیی لە دەست دەبێتەوە لە دەست هەموو کەس نایەت.
(٥٤٣) بەو کەسانە دەوترێت کە بێکار و بێ هۆ زۆر دێن و دەچن.
(٥٤٤) کەواتە برین دوای ماوەیە جێگاکەی پڕ دەبێتەوە بەڵام قسەی ناخۆش و نابەجێ و زبر هەرگیز بیر ناچێتەوە.
(٥٤٥) بۆ کەسێکی زۆر خۆشەویست دەوترێت کە ڕۆڵی گەورەی هەبوو بێت و جێگاکەی بە کەسێکی ئاسایی پڕ نەبێتەوە.
(٥٤٦) واتە ئەوەی سەر دانەنەوێنێت بۆ کەس پلە و پایەی نییە.
(٥٤٧) کەوابێ هەڵە و هەرزە مەبە با نەکەویتە تەنگاوەوە.
(٥٤٨) واتە پلەو پایە و کارەکەی بەرزە بەڵام خۆی ناهێنێت لەو شوێنەدا بێت.

## پیتی ( چ )

**چارەنووس نادیارە.[549]**

**چاکە بکە و بیدە بە دەم ئاوەوە.[550]**

**چاکە لە چاکەیە.[551]**

**چاڵهەڵکەن جێگای هەر چاڵە.[552]**

**چاوێ دوژمنی خۆتی پێ نەناسیت بۆ کوێر بوون باشە.[553]**

**چاوێك گڵی کرد دەریهێنیت باشە.[554]**

**چاوێك گڵی کرد دەبا هەر کوێر بێت، نەك بە ئازار و ئێش و ژان فێر بێت.[555]**

**چاوی مار دەردێنێت.[556]**

---

(٥٤٩) واتە چارەنووسی مرۆڤ خوا بڕیاری بۆ دەدات.

(٥٥٠) وشەی چاکە نرخی نابڕێتەوە، دوای سەد ساڵ ڕێت پێ دەگرێتەوە.

(٥٥١) کەسێك چاکە بکات بەرامبەرەکەشی هەروا دەبێت، خراپەش لە خراپەیە.

(٥٥٢) ئەوەی چاڵ بۆ خەڵك هەڵکەنێت هەتا هەیە بەرزی نابینێت.

(٥٥٣) واتە ئەوەی بە چاو دەیبینیت ڕاستە، عەقڵی پێ تێك مەدە.

(٥٥٤) واتە کەسێك ئازاری دایت خۆتی لێ ڕزگار بکە چەند خۆشەویستیش بێت.

(٥٥٥) کەسێك ئازاری دایت نەبوونی چاکترە، نەك هەموو کات ئێش و ژان بێت بۆ دڵت.

(٥٥٦) بەوانە دەوترێت زۆر وریا و زیرەکن.

چاوی ڕەشی کاڵ بووەوە.(٥٥٧)
چاوی سوور بووە.(٥٥٨)
چاوی چۆتە پشتی سەری.(٥٥٩)
چاویان بۆ بینین داناوە.(٥٦٠)
چاوی کەس نابینێت.(٥٦١)
چاوی لێ پۆشیوە.(٥٦٢)
چاوبازە و ناگیرێت.(٥٦٣)
چاو بەرە ژێرە.(٥٦٤)
چاوبرسی چاوی تێر نابێت.(٥٦٥)
چاوجنۆك تەنها بە خۆڵ چاوی پڕ دەبێتەوە.(٥٦٦)

---

(٥٥٧) واتە ئەوەی بە تەمای بوو بۆی نەبوو نەڕەخسا.
(٥٥٨) واتە هار بووە و کەس دەرەقەتی نایەت.
(٥٥٩) واتە سەری سوڕماوە لەو کارەی بەرامبەری کراوە.
(٥٦٠) واتە ئەوەی بە چاو دەیبینیت بە عەقڵیش بڕوا بکات.
(٥٦١) واتە حەزی لە کەس نییە و کەسی خۆشناوێت.
(٥٦٢) واتە ڕەچاوی کردووە چاوپۆشیی لە هەڵەکەی دەکات.
(٥٦٣) واتە چاو وەکو باڵندەی باز وایە داخستنی کارەساتە بۆ ئەو مرۆڤە چونکە هۆی چاودێریی مرۆڤە.
(٥٦٤) واتە چاکەیەکی لەگەڵدا کراوە. ناتوانێت بە مقابیل بیداتەوە.
(٥٦٥) ئەو کەسانەن هەوڵ زۆر دەدەن دەستیان ناچێتە ڕەنجی خۆیانەوە بیخۆن.
(٥٦٦)واتە ئەوانەن چاویان لە دەستی خەڵکییەوەیە تەنها بە خۆڵی مردن چاویان پڕ دەبێتەوە.

چاو بە چاو دەکەویت و روو بە روو.(٥٦٧)

چاوبرسی بەردەمی خۆی نابینیت.(٥٦٨)

چاو سوورکەرەی دەویت.(٥٦٩)

چاوت نەفری.(٥٧٠)

چاك تووشی گون رەشی خۆی هاتووە.(٥٧١)

چە پلە بەدەستیك لی نادریت.(٥٧٢)

چەرخی لە چەمەر کیشا.(٥٧٣)

چەقۆی لی تیژ کردووە.(٥٧٤)

چەم بی چەقەل نابیت.(٥٧٥)

---

(٥٦٧) واتە روو بە روو و چاو بە چاو دەکەویت. پیویستە زمانمان سەلامەت بیت.

(٥٦٨) چاوبرسی هەلپە زۆر دەکات سنووری نییە تا تی دەکەویت و نایخوات.

(٥٦٩) واتە کەسیك نییە لیی بترسیت و سنووری بۆ دانیت بۆ هەلەکانی.

(٥٧٠) واتە ئەوەی لی دەترسیت دەقەومیت و دەبیت

(٥٧١) واتە بە ژیانی کۆنی خۆی رازی نەبووە. ئیستا تووشی کەسیك بووە، بە ئارەزوو ئەشکەنجەی بۆ داناوە.

(٥٧٢) قەت چاکە بە یەك کەس ناکریت. دەبیت بە دوو لایەنە بیت.

(٥٧٣) واتە وانەیەکی داوەتی تا ماوەیەك بیری نەچیتەوە.

(٥٧٤) بە تەمای شەریکی قورسە.

(٥٧٥) هیچ شوینیك بەبی پیاو خراپ نابیت.

چەند بکەیت بێگانە پەرستیی، هەر دەهێنێت نوشستیی.[٥٧٦]
چەوەندەرێك لەو زەویە دەربێنە.[٥٧٧]
چ باکم هەیە، دراوم هەیە.[٥٧٨]
چ باکمە کورە کەچەڵ کاکمە.[٥٧٩]
چ بڵێیت حەسەن کەچەڵ یان کەچەڵ حەسەن.[٥٨٠]
چرا شەوقی بۆ ژێر خۆی نییە.[٥٨١]
چرا لە پێشەوە رووناکیی بدات، نەك لە پشتەوە.[٥٨٢]
چرای کەس تا رۆژ ناگرێ.[٥٨٣]
چرا هەڵکە و گۆوی تیا ماوە.[٥٨٤]
چل نان و قەرزیان نەوتووە.[٥٨٥]
چل خەم و چل خەیاڵ جا چل واسواسە، سێ چل چۆن دەرکەم

(٥٧٦) کەوابێ پەنا بۆ کەسی خۆت بەریت چاکترە، نەك بێگانە بتکات بە پەندی زەمانە.
(٥٧٧) کەواتە هیچ شتێك بێ ڕەنج و هیلاکیی دەستگیرت نابێت.
(٥٧٨) دراو و پارە چڵکی دەستە، نابێت کەس پێوەی بنازێت.
(٥٧٩) کەچەڵ بە شانسە، واتە برای هەر کەس بێت. ئەو کەسە دەحەسێتەوە.
(٥٨٠) وشەی کەچەڵ پێش حەسەن یان دوای حەسەن بخەیت مانای ناگۆڕێت واتە حەسەن هەر کەچەڵە.
(٥٨١) واتە زۆر مرۆڤ هەیە خێریان بۆ خۆیان نییە و خۆیان لە بیرکردووە.
(٥٨٢) کەواتە چاکە و خێرت بخەرە پێش مردنت.
(٥٨٣) ژیانی کەس تا سەر خۆش نییە، خۆشیی و بۆنیش تا سەر بۆکەی نییە.
(٥٨٤) بە کەسێك دەوترێت نە تەمەن نە هێز بە بەریەوە نەماوە.
(٥٨٥) واتە مرروۆڤ دەبێت ڕۆژانە ڕەنج بدات، نەك هەموو ڕۆژێك قەرز بکات.

بەیەك هەناسە.[586]

چلەی چاوی دیت.[587]

چویتە شاری کوێران، دەبێت دەست بە چاوتەوە بگریت.[588]

چوونت بە دەست خۆتە، هاتنەوە بە دەست خوایە.[589]

چوار پیینەی کەیت ناگاتە بەهار.[590]

چوو بۆ ریش سمێڵی نایە بان.[591]

چوو بە چەقی لەعنەتا.[592]

چووە دوور بوو بە پوور.[593]

چۆلەکەیەکی ناو دەست، چاکترە لە هەزاری سەر دەست.[594]

---

(٥٨٦) واتە مرۆڤ خەم و خەیاڵ و واسواسە، بۆی دەرناکرێ بەیەك هەناسە، پێویستە فریای کەویتی و یەك یەك بە رێی بکات.

(٥٨٧) بە کەسێك دەوترێت شەونخونی بکات تا بەیانیی.

(٥٨٨) بۆ یەکێك کە بچێتە ناو هەر قەوم و شارێك دەبێت دەستووری ئەوان هەڵگرێت وەکو ئەوان هەڵسوکەوت بکات.

(٥٨٩) کەواتە مرۆڤێك ئەگەر سەفەرێکی کرد رۆشتنی لە دەست خۆیایەتی بروات یان نەروات، بەڵام هاتنەوەی بە دەست خوایە.

(٥٩٠) بەو کەسانە دەوترێت کە نەخۆش و بێ کەڵکن ناگەنە بەهار دەمرن.

(٥٩١) واتە بەردو کارێکی خێر چوو، بە زەرەرێکی زۆرەوە گەرایەوە.

(٥٩٢) خۆی کەنارگیر کردووە و تێگەیشتنی تیدا نەماوە.

(٥٩٣) ئەوەی دوور کەویتەوە لە یەکتر دۆستایەتی و برایەتی و خۆشەویستیان کەم دەبێتەوە و بەرەو نەمان دەروات.

(٥٩٤)کەوابێت ئەو پارەیەی لە گیرفانی خۆتدایە چاکترە لە هەزاری قەرز.

**چۆلەکە بجریوێنێت، میوانت بۆ دەهێنێت.**[٥٩٥]
**چۆری لێ بری.**[٥٩٦]
**چۆتە سەرداری و نایە خواری.**[٥٩٧]
**چۆلەکە، گۆشتت چی و گۆشتاوت چی.**[٥٩٨]
**چی بچێنیت ئەوە دەدرویتەوە.**[٥٩٩]
**چی بکەیتە عەمباری، هەر ئەوە دێتە خواری.**[٦٠٠]

---

(٥٩٥) لە کۆنەوە وتراوە جریوەی چۆلەکە هێمایە بۆ میوان هێنان.
(٥٩٦) کەوابێت نایەوێت کەس لەدوای خۆی خێر ببینێت.
(٥٩٧) واتە کەللەرەقە و لە کەس ناگات. هەر لەسەر قسەی خۆیەتی.
(٥٩٨) بە یەکێك دەوترێت زۆر خۆی بە شت دەزانێت، هیچیش نییە.
(٥٩٩) ئەوەی درك بچێنێت گوڵ نادروێتەوە.
(٦٠٠) هەرچییەك پاشەکەوت بکەیت، هەر خاوەنی ئەوەیت. یان چۆن منداڵ پەروەردە دەکەیت، هەر ئەوە دەستگیر دەکەیت.

# پیتی ( ح )

**حازخۆری بەر سێبەر.[٦٠١]**
**حە پە حەپ دەکەم چاوی دوژمن کوێر دەکەم[٦٠٢]**
**حە پۆل مێشخۆرە.[٦٠٣]**
**حەرامخۆر باکی لە گرانیی نییە.[٦٠٤]**
**حەریف حەریفی خۆی دەناسێت.[٦٠٥]**
**حەرامخۆرە، کیسە بۆرە.[٦٠٦]**
**حەزو و ناز دەبێتە نان و پیاز.[٦٠٧]**

---

(٦٠١) بە کەسێك دەوترێت هەر خواردن و دانیشتنی لەسەر بێت و ڕەنج نەدات.
(٦٠٢) پێویستە هەموو کەس ڕادە و سنوورێك دانێت بۆ بەرگری لە خۆی بۆ ئەوەی نەکەوێتە ژێر توانج و تانەی ناحەزەکانی.
(٦٠٣) ئەوەندە لە هزرا هەژارە ناتوانێت بەرگری لە خۆی بکات.
(٦٠٤) چونکە بەبێ ویژدانانە کەسابەتی خۆی دەکات.
(٦٠٥) کەواتە هەموو کەس دەزانێت هاوڕێیەتی لەگەڵ کێ بگرێت و شەڕ لەگەڵ کێ بکات.
(٦٠٦) ئەوانەی حەرامخۆرن و گوێ نادەنە حەلاڵ و جیای ناکەنەوە لە یەکتر کیسەیان چڵکن و بەتاڵە.
(٦٠٧) ئەوانەی بەپەلە حەز لە یەکتر دەکەن و بە یەکتر دەگەن زوو تێك دەچن.

**حەقە حەقدارم، بەشە بەشدارم.**[٦٠٨]
**حەقە بۆیە رەقە.**[٦٠٩]
**حەق ئاوی خۆر دەوەستێنێت.**[٦١٠]
**حەق بەحەق، نانێکی رەق.**[٦١١]
**حەقدار لە حەقی خۆی واز دەهێنێت، شایەت واز ناهێنێت.**[٦١٢]
**حەقی بزنی کۆڵ بەسەر بزنی شاخدارەوە ناهێڵێت.**[٦١٣]
**حەمام بە تر گەرم نابێت.**[٦١٤]
**حەواڵە بە گەواڵە کراوە.**[٦١٥]
**حەیا باری کردووە.**[٦١٦]
**حەیا بە چاوەوەیە.**[٦١٧]

---

(٦٠٨) واتە ئەگەر مافمی تیادایە مافی خۆم بدەرێ، ئەگەر بەشمی تیادایە بەشی خۆم دەوێت.
(٦٠٩) واتە هەموو بەربەستکردنێك بە حەق رەچاوکردنی تێدا نییە.
(٦١٠) واتە حەق پەسەندە لای هەموو کەس، کەس لاری لێی نییە.
(٦١١) ئەو کارەی تۆ کردت لەگەڵ من، منیش توانیم لەگەڵ تۆ بیکەم.
(٦١٢) حەقدار لە حەقەکەی دەکشێتەوە کە دەزانێت شاهید سوێند دەدرێت و درۆ بۆ کەس ناکات و راست دەروات.
(٦١٣) واتە خوا حەقە حوکمی بێ دەسەڵاتیش دەکات و مافی زۆرلێکراو بەسەر زۆردارەوە ناهێڵێت.
(٦١٤) کەوابێ هیچ شتێك بێ رەنج و هیلاکیی بەرهەم نایەت.
(٦١٥) واتە بەفرتوفێڵ کارەکەیان براندەوە و کۆتایی پێ هێناوە.
(٦١٦) واتە شەرم و شکۆ لە بەینی گەورە و بچووکدا نەماوە.
(٦١٧) واتە سەیری چاوی هەر کەسێك بکەین شەرم و شکۆ و حەیای پێوە دیارە.

**حوكمی حاكمه، مەرگی موفاجات.**[٦١٨]
**حولحولی مەزەبە.**[٦١٩]
**حیلم لە عیلم چاكترە.**[٦٢٠]

(٦١٨) واتە دەبێت زۆر بەخێرایی ڕازیبوون و ملكەچیی نیشان بدەیت.
(٦١٩) واتە خاوەنی قسە و ڕای خۆی نییە.
(٦٢٠) واتە كەسێك بە ئارام بێت زۆر بە چاكیی دەتوانێت زانیاریی وەرگرێت بەڵام زانیاریی بەبێ ئارامگرتن وەرناگیرێت.

# پیتی ( خ )

**خازەی خوشکم تری، مەگەر گڵ لیم ببیستیت.**[٦٢١]
**خاس کەیت بۆ خۆتە، خراپ کەیت بۆ خۆتە.**[٦٢٢]
**خاکپەرست هەر خاك بەسەرە.**[٦٢٣]
**خالق بیدەرە بەر رەحمەت، مەیخەرە ژێرباری زەحمەت.**[٦٢٤]
**خانەی تەنگ مالی خۆیەتی.**[٦٢٥]
**خانەی بەجەنگ، پیلاوی تەنگ**[٦٢٦]
**خانمی خانمان، گلینەی چاوان.**[٦٢٧]

---

(٦٢١) واتە کەسێك عەیبێکی بوو. براکەشی بۆی ناپۆشێت.
(٦٢٢)چاکە و خراپەی مرۆڤ هەر بۆ خودی خۆی دەگەرێتەوە.
(٦٢٣) ئەوەی خاك و نیشتمانی خۆی خۆش بوێت، دەبێت هەر لەو خاکەدا بمرێت و بخرێتە گۆڕەوە و ئەو خاکە بکرێت بە سەریا.
(٦٢٤) هەڵەو خەتای منداڵ بەرامبەر دایك هەرچۆنێك بێت... خۆیان لێی خۆش دەبن و داواش لە یەزدان دەکەن لێی خۆش بێت.
(٦٢٥) بۆ کەسێك ئەمە دەوترێت کە حەزی لە ماڵی خۆی نەبێت و سرەوتی تیادا ناگرێت و خوێڕی بێت.
(٦٢٦) ئەمە دوو شتە کە بار و ڕەوتی ژیان تێك دەدات.
(٦٢٧) واتە ئەوەی خوا باشی بۆ دەکات و دەچێتە سەر تەخت و بەختی خۆی، لەبەر چاوی هەموو کەس خۆشەویستە.

**خانمی دەستەوەستان، چ لە گەرمیان بێت چ لە کوێستان.**[٦٢٨]
**خانوو مەگرە تا دراوسێ دەناسیت.**[٦٢٩]
**خانووی فەقیر مانگەشەو چرایەتی.**[٦٣٠]
**خانووی دوو کەیبانو خۆلی تا ئەژنۆیەتی.**[٦٣١]
**خاوەنی قسەی خۆی نییە.**[٦٣٢]
**خەتە سووری لە خۆم دووری.**[٦٣٣]
**خەتابارە و تۆبەکارە.**[٦٣٤]
**خەریکە لە خۆشیا شامەرگ دەبێت.**[٦٣٥]
**خەزیم بوو بە بڕنووتی، هەموو کچێك کردیە لووتی.**[٦٣٦]

---

(٦٢٨) ئافرەتێك دەستەوەستان بێت و کەیبانویەکی باش نەبێت لە هەر ماڵ و شوێنێکدا بێت. هەر لێنەهاتووی پێ دەڵێن.
(٦٢٩) واتە دراوسێ ناسین پێش خانوو کڕین و کردن.
(٦٣٠) واتە خانووی هەژار فەنتازی نییە.
(٦٣١) کەوابێ ئیشوکار لە ماڵی دوو کەیبانودا ناکرێت. چاوەڕوانی یەکتر دەکەن و خۆیان لە کارەکە دەدزنەوە.
(٦٣٢) واتە کەسایەتی و کەسێتیی ئەو کەسە لاواز و بێ هێزە.
(٦٣٣) کەسێك دەیڵێت کە تاوانێك یان هەڵەیەك کرابێت. خۆی بە دوور بگرێت و خۆی تیایدا نەبێت.
(٦٣٤) ئەگەر دڵنیا نەبێت لە خەتاکەی خۆی بۆچی تۆبەکارە؟
(٦٣٥) واتە گەیشتووە بە ڕادەیەکی پلە و پایە و پارە. کە خۆی لە خۆی ڕانابینێت یان دەمێکە بە ئاواتیەوەیەتی.
(٦٣٦) کە شتێك بوو بە چاولێکەریی دەبێتە باو لەو ڕۆژەدا.

خەسوو لەگەڵ تۆمە، بووکێ تۆ گوێت لێ بێت.(٦٣٧)
خەڵەی خۆم و گەلەی خۆم.(٦٣٨)
خەڵکیی کاغەزی سپی دەخوێنێتەوە.(٦٣٩)
خەڵك دۆستیشی هەیە و دوژمنیشی هەیە.(٦٤٠)
خەم بۆ ئەو باشە.(٦٤١)
خەمخۆریەتی.(٦٤٢)
خەم بوو بە نان و خەم بوو بە بەرگم، خەم بوو بە ئاگر چزا لە جەرگم.(٦٤٣)
خەمی دنیای لە خۆی بار کردووە.(٦٤٤)
خەم بادەی بەزمە، بۆیە مامەوە لەم پایە نزمە.(٦٤٥)

---

(٦٣٧) کەوابێت بۆ ئەو کەسانەیە کەس ناتوانێت ڕاستەوخۆ ڕێنماییان بکات.
(٦٣٨) ئەوەی بە بەرهەمی ڕەنجی خۆی ڕازییە چاوی لە کەسەوە نییە.
(٦٣٩) هەموو کەس پێویستە بە ئاگا بێت لە هەڵسوکەوتی خۆیدا و قسەکانیدا.
(٦٤٠) واتە خەڵك ئەوەندە دڵنیا نەبێت وا بزانێت گشت کەس دۆستێتی و ئەوەندەش بێ متمانەش نەبێت هەموو کەس بە ناحەزو دوژمن بزانێت.
(٦٤١) واتە بێکەس و هەژار و دەردەدارە هەر بۆ ئەوە باشە خەم بۆ حاڵی خۆی بخوات.
(٦٤٢) بەربرسیاریی ئەو کەسەی خستۆتە ئەستۆی خۆی.
(٦٤٣) تا ژیان هەبێت خەم و پەژارە بەردەوامە. بەڵام با نەبێت بە پریاسکەی بەردڵ و بە کۆڵ بگوێزرێتەوە.
(٦٤٤) هەموو شتێك بەشی خۆی خەمی هەیە. با بیر لە چارەسەری بکرێتەوە.
(٦٤٥) خەم مرۆڤ گیرۆدە دەکات کە فریای هیچ شتێکی دیکە نەکەوێت.

**خەمی کردووە بە جامانە، ورگی بووە بە هەمانە.**(٦٤٦)
**خەو برای مەرگە.**(٦٤٧)
**خەوت بێت پێخەفت ناوێت، برسیت بێت پێخۆرت ناوێت.**(٦٤٨)
**خەنجەر لە کا دەدات.**(٦٤٩)
**خەنجەری دەبان لە کیلانا ناوەستێت.**(٦٥٠)
**خەنجەری لێدەیت خوێنی لێ نایەت.**(٦٥١)
**خەنجەری دەبان ببڕێت حەیاتم، هەتاکو مردن من بە تەماتم.**(٦٥٢)
**خەنەبەندانە.**(٦٥٣)

---

(٦٤٦) واتە خەمی ئالاندووە لەسەری و کاری کردۆتە سەر ناخی.
(٦٤٧) واتە خەوتی بە تەما مەبە خەبەر بیتەوە.
(٦٤٨) واتە کەسێك خەوی هات ناو جێگای چاك و نەرمی نلوێت و کەسێك زۆر برسی بوو ڕازییە بە هەموو خواردنێك.
(٦٤٩) بە کەسێك دەوترێت دەست دەوەشێنێت و ناترسێت یان زیادڕەویی دەکات. یان زیاد مەسرەف دەکات یان قسەی بێ سنوور دەکات.
(٦٥٠) بە کەسێك دەوترێت کە توانا و دەسەڵاتێکی هەبێت لە دەرفەتێکدا دەریخات.
(٦٥١) بە کەسێك دەوترێت زۆر هەستیار و ڕق ئەستوور بێت کە ڕقی هەستا ئەوەی نیازی بێت دەیکات.
(٦٥٢) واتە ئەوەندە سوورە لە خۆشەویستییەکەیدا، هیچ شتێك ناتوانێت بەربەست بێت بۆی.
(٦٥٣) واتە خەنە گیراوەتەوە کەسێك ئاواتێکی هاتۆتە دی و کۆمەڵێك بەشداریی خۆشییەکەی دەکەن.

**خزمی خراپ گونی قۆرە.**[٦٥٤]
**خزمی خەزووری سەپانی شێخە.**[٦٥٥]
**خزمی ژنان بەرە بەرزە، خزمی مێردان دەربەدەرە.**[٦٥٦]
**خزم گۆشتت بخوات، ئێسقانت ناشکێنێت.**[٦٥٧]
**خلە بار دەکات، بلە کەپر دەکات.**[٦٥٨]
**خێر بەخویش، نەك بۆ دەرویش.**[٦٥٩]
**خێر بێ و بیر بێ بە سەرمانا رژێت.**[٦٦٠]
**خێر و سەرفترە و بەرات، هیچ بەندەیەك تێر ناکات.**[٦٦١]
**خێزان بێ پارە، پارە پارەیە.**[٦٦٢]

---

(٦٥٤) کەواتە خزم و کەسوکاری خراپ بوونیان ئازارە، نەبوونیان مردنە.
(٦٥٥) کەوابێ ئەمە خزم نییە بە کەسی خۆی هەڵقورتانووە.
(٦٥٦) ژنان رێز لە کەسەکانی خۆیان دەگرن و رایاندەکێشن و کەسایەتی خۆیانی پێ بە هێز دەکەن. بەڵام کەسی پیاو بە دۆست نازانن و تەرەیان دەکەن.
(٦٥٧) خزم بێزاریش بێت بەشی کەسایەتیەکەی تیا دەهێڵێتەوە.
(٦٥٨) واتە زەمان و شوێن کەسێك بۆی لەبارە و کەسێك لێی بێزارە.
(٦٥٩) کەواتە خێر و خوایشتت بۆ کەسوکارت بێت، نەك بۆ بێگانە خزمەکە لەبەر چاوێتی و جیا نابێتەوە. بەڵام بێگانەکە کاتێك دوورکەوتەوە هیچی تۆ نییە.
(٦٦٠) کەسێك دەیڵێت کە چاوەڕوانی خێر بێت.
(٦٦١) کەواتە مرۆڤ دەست پان نەکاتەوە و چاوەڕوانی دەستی کەس نەبێت و خۆی هەنگاو بنێت بۆ کارکردن و رەنجدان.
(٦٦٢) خێزانی کەمدەرامەت پرش و بڵاو دەبنەوە و هەموویان لە کەسایەتی و برایەتی دەبن.

**خێر و شەری بەرامبەرە.** (٦٦٣)
**خێری بەخشراوەتەوە.** (٦٦٤)
**خراپیی بۆ کەس نەچۆتە سەر.** (٦٦٥)
**خوا بەندە ناسە.** (٦٦٦)
**خوا بۆ یەکی دروست کردوون.** (٦٦٧)
**خوا بدات مەرگم، زاوا نەکات بەرگم.** (٦٦٨)
**خوا بدات مرازم حەوت ژنی بۆ بخوازم.** (٦٦٩)
**خوا بیبرێت خازە رشکن، بەسەر مندا خۆی کرد بە ژن.** (٦٧٠)
**خوا پێ بە مار نەدات.** (٦٧١)
**خوا حاکم بێت.** (٦٧٢)

---

(٦٦٣) بە کەسێك دەوترێت لە پاڵ چاکەیدا خراپەش دەکات.
(٦٦٤) واتە زۆر هیچ و پووچە و جێی متمانە نییە.
(٦٦٥) ئەوەی خراپیی بکات یان خۆی پەشیمان دەبێتەوە یان بەرەنگاری دەبنەوە.
(٦٦٦) خوا خۆی مرۆڤی دروستکردووە هەر خۆیشی دەیناسێت.
(٦٦٧) واتە سروشت و ئەتواریان وەك یەك وایە. خۆیان دەتوانن یەك ڕاگرن.
(٦٦٨) هەندێك خەسوو هەیە زاوا بەك ەسی خۆی نازانێت، دوور گرتوێتی.
(٦٦٩) ئەمە قسەی دایکە کە کوڕەکەی بە منداڵی دەلاوێنێت بەڵام کە گەورە بوو لەگەڵ یەك ژنیشیا ناگونجێت.
(٦٧٠) ژن جوان بێت یان ناشیرین یان هەرچۆنێك بێت بەختی باشی بوو شانازیی پێوە دەکات.
(٦٧١) خوا دەستی زاڵم درێژ نەکات و توانای نەداتێ.
(٦٧٢) واتە خوا عادل و دادپەروەرە.

**خواجاو خولامانیتی.**[٦٧٣]
**خوا خەمی خەمبەر نەدات.**[٦٧٤]
**خوا خۆی دەمێنێت و موڵکی.**[٦٧٥]
**خوا داییێت نالێت کوری کێیت.**[٦٧٦]
**خوا داویتی و لەقەی لێ مەدە.**[٦٧٧]
**خوا دەردیش دەدات و دەرمانیش دەدات.**[٦٧٨]
**خوا دەرگایەك بگرێت دەرگایەكی دیكە دەكاتەوە.**[٦٧٩]
**خوا دەرووی زۆرە.**[٦٨٠]
**خواردن قابیلی هەموو کەسە، جل قابیلی هەموو کەس نییە.**[٦٨١]
**خواردن ڕیبیانەوەی دەوێت.**[٦٨٢]

---

(٦٧٣) واتە خزمەتكاریەتی و بە دەوریدا دێت و دەیلاوێنێت.
(٦٧٤) واتە خوا خەمێكی قورستر نەدات كە خەمی كۆنترت بیر بەرێتەوە.
(٦٧٥) كەسێك ئەوە دەڵێت بە تەواوی بڕوای بە خوا و گەورەیی هەبێت و مردن و نەمانیش كارێكی خوایی و سروشتیی بێت بەلایەوە.
(٦٧٦)خوا پلەو پایە و پارە بدات بە هەر كەس دەیداتێ كوڕی هەر كەس بێت.
(٦٧٧) كە خوا زۆری دایتێ لووت بەرزیی لە ئاستدا مەكە.
(٦٧٨) خوا دەرد یا پەژارەیەكیشی نارد چارەسەریشی هەیە دەبێت بەدوایدا بگەرێت.
(٦٧٩) خوا دەرگای زۆرە و پەناشی زۆرە بۆ لێقەوماندن.
(٦٨٠) كەواتە خوا دەرووی زۆرە مرۆڤ پەكی ناكەوێت.
(٦٨١) خواردنی باش بۆ هەموو كەس باشە و حەرام نییە بەلام جل لە هەموو كەس نایەت.
(٦٨٢) پێویستە بە ئاگابوونمان لە ڕیژە و جۆری خواردنمان چونكە ڕیبیانەوەی دەوێت.

**خواردی تیکە و کردی فیکە.[٦٨٣]**
**خوا راستە و راستی لا خۆشە.[٦٨٤]**
**خورمای بابییان داوەتێ.[٦٨٥]**
**خورماش لە بەغدا زۆرە[٦٨٦]**
**خوازبێنیکەر هاتوچوو، هەموو کچان کردیان شوو، بەشی کچی من نەمابوو. ئەوەی مابوو گەند و گوو.[٦٨٧]**
**خوا سەرما و گەرما بە پێی حاڵ دەدات.[٦٨٨]**
**خوا سەرما بە پێی بەرگ دەدات.[٦٨٩]**
**خواشی دەوێت و خورماشی دەوێت.[٦٩٠]**

---

(٦٨٣) بە کەسێك دەوترێت خۆی بەبەرپرسیار نەزانێت لە ماڵەکەیدا هەر بخوات و بچێتە دەرەوە.
(٦٨٤) بە پێی گەورەیی خوا لە قورئانی پیرۆزدا بۆمان بەیان دەکات ڕێنمایمان دەکات بۆ راستیی و راستی لا خۆشە.
(٦٨٥) واتە عەقڵیان لێشێواندووە، لە بارێکەوە چۆتە سەربارێکی تر.
(٦٨٦) واتە هەرچی شتێك بە ئاسانیی دەستکەوێت منەتی نییە.
(٦٨٧) ئەمە قسەیەکی کۆنە لە خۆشەویستیی کچەکانیان لە مناڵیدا ئەمەیان بۆ وتووە.
(٦٨٨) هەژارێکی لەش ساغ و ڕووت ڕادێت لەگەڵ باری ژیانیدا لە سەرما و گەرما. بەڵام دەوڵەمەند بە جلە باشەکەشی سەرمایەتی و نەخۆشە.
(٦٨٩) واتە ڕاهاتن لەگەڵ سەرما و گەرمادا بەرگری مرۆڤە.
(٦٩٠) بە کەسێك دەوترێت داوای دوو شتی جیاواز بکات هەرگیز یەك نەکەوێت لە یەککاتدا.

**خوا یار بێت.[٦٩١]**
**خوا عەقڵی نەدا بە خۆت، بە منداڵەکانتی بدات.[٦٩٢]**
**خوا غەزەب لە بزن بگرێت نانی شوان دەخوات.[٦٩٣]**
**خوا غەزەب لە مێرووله بگرێت باڵی لیٚ پەیدا دەکات.[٦٩٤]**
**خوای قولی دای لە ملی.[٦٩٥]**
**خوا کێو نەبینێت بەفری تێ ناکات.[٦٩٦]**
**خوا کڵاوی بۆ بەروو کردووە.[٦٩٧]**
**خوا کردەیە.[٦٩٨]**
**خوای گەرمیان و کوێستان هەر یەکە.[٦٩٩]**

---

(٦٩١) کەسێك دەیڵێت بە تەمای خوا دەست بداتە کارێك و سەرکەوێت و ئاواتی بێتەدی.

(٦٩٢) بە کەسێکی هەڵە و هەرزە دەڵێن بە فرمانەکانیدا تێ دەکەوێت و عەقڵی کار کردنی نییە.

(٦٩٣) بە یەکێك دەوترێت کە شتێکی گرنگی هاورێکەی یان خاوەنەکەی لەناو بەرێت.

(٦٩٤) مێرووله بۆ سەر زەوی دروست بووە کە باڵی لیٚ ڕوا نیشانەی نەمانێتی.

(٦٩٥) زوڵم لە کەسێك نەکرێت کە بێ دەسەڵات بێت، چونکە ئەویش خوای هەیە.

(٦٩٦) خوا کەسێك بەخراپ نەزانێت، تووشی سزای ناکات.

(٦٩٧) خوا ئاگاداری هەموو شتێك هەیە.

(٦٩٨) خوا خۆی بەو جۆرە دروستی کردووە واتە سروشتییە.

(٦٩٩) لە هەر لایەك کردارێکت کرد خوا چاوی لێیە و بە ئاگایە.

**خوا لە سوڵتان مەحمود گەورەترە[٧٠٠]**
**خوا لە کاری خۆی پۆتەوە.[٧٠١]**
**خوا مافی بزنی کۆڵ بەسەر شاخدارەوە ناهێڵێت.[٧٠٢]**
**خوا لێم لارە، بەندە لێم بێزارە.[٧٠٣]**
**خوا رۆژ پیشانی ماری سر نادات.[٧٠٤]**
**خوا نەجار نییە، خوا تەختەتاشە، دوو بەندەی خراپ بۆ یەکتری باشە.[٧٠٥]**

---

(٧٠٠) دارتاشێك دەکەوێتە ژێر گوشاری سوڵتان مەحمودەوە، کە تا بەیانیی فەردەیەك ئاردەداری بۆ ئامادە بکات. دارتاشە دەیزانی ئەمە بیانووە دەیەوێت بیکوژێت. ژنەکەی وتی وەرە بنوو خوا لە سوڵتان مەحمود گەورەترە بەیانیی لە دەرگای دارتاشەکە درا. ووتیان وەرە تابووتێك بۆ سوڵتان دروست بکە مردووە.

(٧٠١) واتە خوا هەرچییەك بخاتە نسیبمانەوە لە ناوچەوان نووسراوە دەبێت بیبینین.

(٧٠٢) واتە خوا مافی زۆرلێکراو لە زۆردار دەسەنێت.

(٧٠٣) ئەو کەسەی خۆی بزانێت کردەوەکانی ناشیرین و ناپەسەندە چاکیش دەزانێت لای خوا و خەڵك قێزەونە.

(٧٠٤) واتە زۆردار و ستەمکار با هەر سڕ بێت و گەرمی نەبێتەوە بە کەسەوە بدات.

(٧٠٥) واتە مرۆڤی باش ناگونجێت لەگەڵ مرۆڤی خراپدا. باش بۆ باش و خراپ بۆ خراپ وەکو لە قورئانی پیرۆزدا بەیان کراوە.

**خوا هەتا سەر بدات، رزقیش دەدات[٧٠٦]**
**خوویەك گیرا بە شیریی، تەرك نادرێت بە پیریی.[٧٠٧]**
**خوێتی بۆ گەری دەشێت.[٧٠٨]**
**خوێتی خۆی کردە کاسە.[٧٠٩]**
**خوێتاوی بخواتەوە ئۆخەی ناکات.[٧١٠]**
**خۆی مامرە و هێلکەی قاز دەکات.[٧١١]**
**خوێتێك بە ناوچەوانییەوە هەیە.[٧١٢]**
**خووی شیریی، هەتا پیریی.[٧١٣]**

---

(٧٠٦) واتە خوا کەسێك دروست بکات رزقیشی بۆ تەرخان کردووە لە شیری دایکیەوە تا خۆی هەوڵ دەدات.
(٧٠٧) کەواتە تا دەتوانین با منداڵەکانمان فێری خووی جوان بکەین.
(٧٠٨) واتە ئەوەندەپیس تەبیعەتە، گولی هیچ نییە لە چاویدا.
(٧٠٩) کەواتە کارێکی ئەوەندە ناپەسەندی کردووە، وەکو خۆی پێ کوشتبێت وایە.
(٧١٠) بە کەسێك دەوترێت حەزی بە مردن و نەمانی کەسێکی دیکەیە لە رق ئەستووریدا.
(٧١١) بە کەسێك دەوترێت زیاد لە توانای خۆی کەشوفش بکات و لاسایی بکاتەوە.
(٧١٢) واتە ئەو کەسە هار بووە و سەری لە خۆی شێواندووە تا کەتنێك دەکات و دادەمرێتەوە.
(٧١٣) ئەوەی بە خوویەکی منداڵییەوە دەق بگرێت بەپیریی دەستی لێ هەڵناگرێت.

خوایە دەوڵەمەند زۆر کەیت تا هەژار تێر گۆشت کەیت.(٧١٤)
خوشکەکەت لە خۆراسان تری، نان و دۆی تۆی لێرە بڕی.(٧١٥)
خۆ بن مەمکی نەرزیوە.(٧١٦)
خۆت بکوژیت بۆ بۆرە پیاو، دەڵێن بە دەردی خوا مرد.(٧١٧)
خۆت مەکە بە مقاشی دەستی نامەرد.(٧١٨)
خۆ خومخانە نییە تێی هەڵکێشیت.(٧١٩)
خۆ دەست و پێی بە خەنەوە نییە.(٧٢٠)
خۆزگە دەمزانی بە زمانی بولبول، هەرگیز نەم دەکرد کاری نابەدڵ.(٧٢١)
خۆزگەم بەو کەسەی دراوسێتانە، بە شەو و بە ڕۆژ ئاگای

---

(٧١٤) واتە نرخی گۆشت ئەوەندە بەرزە، مەگەر بەخێری دەوڵەمەند هەژار گۆشت ببینێت.
(٧١٥) پیاوێك کە بە بیانوو بێت لە ژن. ئەوەی نەشچێت بە عەقڵیا هەر دەیڵێت.
(٧١٦) واتە تەمەنی ئەو کچە ئەوەندە گەورە نییە.
(٧١٧) کەوابێ پیاوی سپڵە و پێ نەزان چاکەکردن لەگەڵیا سوودی نییە.
(٧١٨) ئاگات لە خۆت بێت نا پیاو هەڵتنەسوورێنێت.
(٧١٩) واتە کارێك پێویستی بە کات بێت نابێت پەلەی تێدا بکرێت.
(٧٢٠) واتە غیرەتی ئەوەی نییە یارمەتیی کەس بدات و فریای کەس کەوێت.
(٧٢١) ئەوانە دەیڵێن کە پەشیمانن لە کاری پێشوویاندا.

**لیتانە.[٧٢٢]**
**خۆساڵی دوو بەهار نییە.[٧٢٣]**
**خۆشەویستیی دوور و نزیکی بۆ نییە[٧٢٤]**
**خۆشیی بنۆشیت، دەبێت تالیش بچێژیت.[٧٢٥]**
**خۆشە ئاگر، خۆشە دوو، برا خاسە نەوەك شوو.[٧٢٦]**
**خۆشتبێ و ترشتبێ دەبێت وا بیت.[٧٢٧]**
**خۆشە شارەزا هاوڕێی سەفەر بێت، نەك هاوڕێی سەفەر نەزان و کەر بێت.[٧٢٨]**
**خۆ کابە کەچ نەبووە.[٧٢٩]**
**خۆ لە خۆ دەکوتێت، بێگانە لە کلۆری دار.[٧٣٠]**

---

(٧٢٢) خۆی دوورە بەڵام ئاوات بە نزیکەکان دەخوازێت کە لە خۆشەویستەکەیەوە نزیکن.
(٧٢٣) کەسێك بۆ جاری دووەم داواکارییەکی هەبوو بەمە ڕێی لێ دەگرن.
(٧٢٤) ئەوەی کەسێکی خۆشبوێت دوور بێت یا نزیك هەر خۆشەویستە.
(٧٢٥) هیچ کەسێك نرخی تامی خۆشیی نازانێت ئەگەر تامی تاڵیی نەچێژێت.
(٧٢٦) هەندێك کچ شوو دەنێن بەلاوە لە پێناوی کەسوکاردا.
(٧٢٧) هەندێکجار زۆرداریی ئەو کارە دەکات کە بەرامبەرەکەی بێدەنگ بێت و بە هەموو شتێك رازی بێت.
(٧٢٨) مرۆڤ لە سەفەر و غەریبایەتیدا کە دادەمێنێت. لەگەڵ شارەزا و زانادا پێوەی دیار نییە.
(٧٢٩) واتە هەڵەکە ئەوەندە گەورە نییە. با لێخۆشبوون هەبێت.
(٧٣٠) کەوابێت خزم پەنا بۆ خزم دەبات لە کاتی تەنگانە و پرسیاردا، نەك بۆ بێگانە.

**خۆ لە ماڵی باوکمەوە نەمهێناوە.**[٧٣١]
**خۆڵی رەنجی خۆت بخۆیت لە پڵاوی بێگانە چاکترە.**[٧٣٢]
**خۆ ماست نییە بە لێویەوە دیار بێت.**[٧٣٣]
**خۆ نانم بەسەر ساجەوە نەسووتاوە.**[٧٣٤]
**خۆی بە گورگان خواردوو دا.**[٧٣٥]
**خۆی خستۆتە ساجی عەلی.**[٧٣٦]
**خۆی لێرە نییە و خوای لێرەیە.**[٧٣٧]
**خۆی ریشی نییە و بە کۆستە پێدەکەنێت.**[٧٣٨]
**خۆی وەجاخ نییە، هەتا داوای کوڕ بکات.**[٧٣٩]

---

**(٧٣١)** ئەو ژنانە دەیڵێن کە منداڵەکانیان دەگرین و پیاوەکە توورە دەبێت.
**(٧٣٢)** کەواتە مرۆڤ پێویستە چاوی لە دەست و رزقی کەسەوە نەبێت بە رەنج و بەشی خۆی رازی بێت.
**(٧٣٣)** هەندێکجار بەبێ بەرپرسیاریی قسە دەکرێت کەس خۆی ناکات بە خاوەنی.
**(٧٣٤)** ئەوە کچێك دەیڵێت کە زۆری لێ بکرێت بۆ شوویەك و بە دڵی نەبێت.
**(٧٣٥)** واتە کارێکی وای کرد سەری تێدا چوو.
**(٧٣٦)** واتە نابووت بووە و هیچی بە دەستەوە نەماوە.
**(٧٣٧)** ئەوەی ئامادە نەبێت لەو شوێنەدا نابێت بکوترێتەوە بە چاك و بە خراپ چونکە خوا لەو شوێنەدا بە ئاگایە.
**(٧٣٨)** پێویستە هەموو کەسێك عەیبی خۆی ببینێت ئینجا بە عەیبی خەڵکیی پێبکەنێت.
**(٧٣٩)** خۆی کوڕێکی باش و ناوازە نەبووە بۆ باوکی ببێتە وەجاخ تا کوڕی تازە فریای کەوێت و ببێتە وەجاخ بۆ ئەو.

**خۆی کەر کردووە.[٧٤٠]**
**خۆی کێشایەوە.[٧٤١]**
**خۆی کشانەوە.[٧٤٢]**
**خۆی گەیاندە حاڵی جاو.[٧٤٣]**
**خۆی لێرەیە و کلکی لە بەغدا تۆز دەکات.[٧٤٤]**
**خۆی لێ کردووین بە هەنگوینی شەمەتلیتکە.[٧٤٥]**
**خۆی نایکات و خوا بۆی باراندووە.[٧٤٦]**
**خۆت بەرز مەگرە لە ئاستی زەوی، هەرچەندە بژییت خۆراکی ئەویت.[٧٤٧]**

---

(٧٤٠) واتە وەکو مرۆڤ ڕەفتار ناکات.
(٧٤١) واتە مردوو تەواو بوو.
(٧٤٢) واتە خۆی دەرباز کرد لەوەی کە بۆی نەچووە سەر.
(٧٤٣) خۆی گەیاندە ڕوویەك و باریك کەس لێی نەپرسێتەوە و چاری بە کەس نەکرێت.
(٧٤٤) بە کەسێکی ئاژاوەگێڕ و بزێو دەوترێت کە هەمیشە شەڕەگێڕیی بخاتە ناو خەڵکییەوە.
(٧٤٥) بە کەسێك دەوترێت کەم دەرکەوێت و دەست نەکەوێت وەکو ئەو هەنگوینە لە ناو دارا و لە ناو شاخدا کەس نەیگاتێ.
(٧٤٦) کەوابێت خوا ڕزق بدات بە هەر کەس توانا و ئارەزووی خوا خۆیەتی
(٧٤٧) پێویست ناکات مرۆڤ بە لووت بەرزیی بڕوات و منەت بەسەر زەویدا بکات چونکە هەر ئەو خاك و خۆڵەیە سرمان دەپۆشێت.

# پیتی (د)

دار بە کونی زەردەواڵەدا دەکات.[٧٤٨]
دار هەڵبرە، سەگی دز دیارە.[٧٤٩]
دار بە گەورەیی ناچەمێتەوە.[٧٥٠]
دار خۆی لاربوو سێبەریشی لارە.[٧٥١]
دار دەڵێت: تەور کلکی لە خۆم نەبێت نامبڕێت.[٧٥٢]
دار کرم لە خۆی نەبێت هەزار ساڵ دەژی.[٧٥٣]
دار پوازی لە خۆی نەبێت ناقڵیشێت.[٧٥٤]

---

(٧٤٨) کەواتە کەسێك شەڕانیی و زەرەرمەند بێت وازی لێ بێنە.
(٧٤٩) مرۆڤی ناپاك هەر لە خۆیەوە دیارە و بە ڕوویا دەردەکەوێت.
(٧٥٠) دەبێت پەروەردەی منداڵ لە سەرەتای تەمەنیەوە دەست پێ بکرێت، نەك بە گەورەیی.
(٧٥١) بە کەسێکی کردەوە خوار و خراپ دەوترێت کە هەر ئیشێك پێی بسپێرێت باش نەیکات.
(٧٥٢) هەموو کەسێك خزم و هاودەمی خۆی یارمەتیی دوژمنەکەی نەدات دوژمن دەستی بەسەریا ناڕوات و زەرەری بۆی نابێت.
(٧٥٣) بە کەسێك دەوترێت بە هۆی کەسێکی نزیکیەوە یان هاوڕێیەکی نزیکەوە زەفەری پێ ببرێت و لەناوچێت.
(٧٥٤) بە کەسێك دەوترێت کە بەهۆی خزمێکی زۆر نزیکیەوە زەفەری پێببرێت و زەرەرمەند بێت.

**داری بێبەر بۆ برینەوە باشە.**[٧٥٥]
**داری دا بەروحیا.**[٧٥٦]
**داری نەرم کرم دەیخوات.**[٧٥٧]
**داری پیرەدار قەت بە دار نابێت، دۆستی دوور ولات قەت بە یار نابێت.**[٧٥٨]
**داریکم پە دەستەوەیە، هەردوو سەری گوواوییە.**[٧٥٩]
**داخی دڵ بۆ گڵ.**[٧٦٠]
**دار و دیوار گوێی هەیە.**[٧٦١]
**داشی سوارە.**[٧٦٢]
**داماوی سەری پیاو دەکات بە کۆشی دوژمندا.**[٧٦٣]

---

(٧٥٥) دەبێت هەموو شتێك بە پێی خۆی سوودمەند بێت لە ژیاندا.
(٧٥٦) واتە زەرەرێکی تەمەنی پێگەیاندووە.
(٧٥٧) واتە کەسێك ئازایانە بەرگری لە خۆی نەکات دەفەوتێت بە دەست دەم و ئەوەوە.
(٧٥٨) درەختی پیر و گەنگ هەرگیز لق و داری چاك دروست ناکات. دۆستایەتی دووریش نابێتە هاوڕێ و خۆشەویستیی نزیك و هاودەم.
(٧٥٩) بە کەسێك دەوترێت بیەوێت کارێك بکات. هەرچۆنێك دەستی باتێ بۆی نارەخسێ و نازانێت لە کوێوە دەستی پێ بکات.
(٧٦٠) زۆر کەس داخی زۆر لە دڵدایە ناتوانێت تا ماوە بیدرکێنێت تا بەو داخەوە دەچێتە ژێر گڵ.
(٧٦١) واتە دەنگ بەرز مەکەرەوە. با قسەکە لە بەینماندا دەرنەچێت.
(٧٦٢) واتە بەختی لە برەودایە و قسەی دەڕوات.
(٧٦٣) مردن زۆر چاکترە لەوەی پەنا بەریت بۆ ناحەز و دوژمن.

**دان بۆ دوژمن رۆ مەکە[764]**
**دان ئێشان، چاری کێشان.[765]**
**دانی شاشە و بەختی باشە.[766]**
**دانا بە ئیشارەت، کەر بە نەقیزە.[767]**
**دانی لێ تیژ کردۆتەوە.[768]**
**دانێکی بە هەزار ساڵ دەردێت.[769]**
**دانوویان پێکەوە ناکوڵێت.[770]**
**داویە لە حەوت ئاو قولەپێی تەڕ نەبووە.[771]**
**دایە ببینە و دوێتە بخوازە.[772]**
**دایك مەدحی کچی کات، دەبێت خاڵوان بیخوازێت.[773]**

---

(٧٦٤) قسە و نهێنیی خۆت مەگەیەنە دوژمن و ناحەزت.
(٧٦٥) هەر کەسێك ئازاری دایت تا زوو رزگارت بێت درەنگە.
(٧٦٦) بە پێی ئەزموونی کۆنەکان ئەم پەندە هەر وتراوەتەوە و بەلایانەوە راست بووە.
(٧٦٧) واتە مرۆڤی دانا و خاوەن عەقڵ ئیشارەتێك بەسە بۆی، بەلام بێ عەقڵ دەبێت بە دار تێی گەیێنیت.
(٧٦٨) واتە تەماعی بۆی هەیە و دەیەوێت بە هەر رێگایەك بێت دەستی بکەوێت.
(٧٦٩) زۆر رەزیلە و هیچی لە دەست نابێتەوە.
(٧٧٠) لەگەڵ یەکتر ناگونجێن و رێکەوتتنیان مەحاڵە.
(٧٧١) زۆرزان و زرنگ و بە ئەزموونە زەرەرمەند نەبووە.
(٧٧٢) کچی ژیر لە دایکی ژیر دەبێت خواستنی خێر دەداتەوە بۆ ماڵی خۆی.
(٧٧٣) واتە دایك مەدحی کچی خۆی بکات تەنها خاڵوان بڕوای پێ دەکەن.

**دایکی بمرێت گوڵوەشان، ناشتەی نەکرد بردیشیان.(٧٧٤)**
**دایکی دز یان سنگ دەخوات یان سنگ دەکوتێت.(٧٧٥)**
**دراوسێ لە دراوسێ دەگرێت سەراسێ.(٧٧٦)**
**درۆ شیرینە ڕاستیی تاڵە.(٧٧٧)**
**درۆکانی بە باڵ دەفرن.(٧٧٨)**
**درۆزنە، خۆی لێ ونە.(٧٧٩)**
**درۆ نە فەرزە، نە سونەت.(٧٨٠)**
**درۆ هێشتا لە دەم دەرنەچووە لۆقە دەکات(٧٨١)**

---

(٧٧٤) کاتێك کچێك دەبرێت بە بووکیی دایکی بۆی دەگری کە کە برسێتیی لە ماڵ چۆتە دەرێ وەك لەم کورتە چیرۆکە دەڵێت: (دایکی بمرێت گوڵوەشان نانی نەخوارد بردیشیان) نۆ نانی خوارد بە پیازەوە، نۆ نانی خوارد بە نازەوە، نۆ نانی خوارد بە شیری مانگا بازەوە.
(٧٧٥) کەوابێت دایکی دز یان ماڵی دزێتی دەخوات یان کوڕەکەی دەکوژرێت و لە سنگی خۆی دەدات.
(٧٧٦) دراوسێ خووی دراوسێ دەگرێت.
(٧٧٧) درۆ لای درۆزن خۆش و ئاسان و شیرینە، بەڵام ڕاستیی تاڵە.
(٧٧٨) واتە درۆ لەبەر ئەوەی دوورە لە ڕاستییەوە و بە ئارەزووی درۆزنەکەیە چەند هەڵیفڕێنێت.
(٧٧٩) کە پیاو درۆی کرد ناچێتەوە سەر خۆیشی تیایدا ون دەبێت.
(٧٨٠) درۆ بە چاك و بە خراپ پێویست ناکات.
(٧٨١) کەوابێ مرۆڤی درۆزن خۆی چاك دەزانێت ڕاست ناکات لە بەر ئەوە ڕاڕایە لە وتنیدا و زمانی پێوە دەلەرزێت.

**درۆزن هەر جارێك ناشتە دەكات.**[٧٨٢]
**درۆزن دوژمنی خوایە.**[٧٨٣]
**درۆ بێ دەسەڵاتە، هەموو كەس پێی دەوێرێت.**[٧٨٤]
**درك ترێ ناگرێت.**[٧٨٥]
**ڕكبە و بچۆ بە چاوی دوژمندا.**[٧٨٦]
**دز دز دەناسێت.**[٧٨٧]
**دز لە دزی بێت هەر تاریكە شەو زۆرە.**[٧٨٨]
**دز یەكێك و شك هەزار.**[٧٨٩]
**دز بازاڕی شێواوی دەوێت.**[٧٩٠]

---

(٧٨٢) درۆزن یەكجار جێی باوەڕە، دوایی ڕاستیش بڵێت كەس گوێی لێ ناگرێت.

(٧٨٣) خوا ڕاستە حەزی لە درۆ و درۆزن نییە.

(٧٨٤) درۆ زۆر ئاسانە دروستكردنی بەڵام ڕاستیی دەبێت بۆی بگەڕێیت وەكو خۆی بیدۆزیتەوە.

(٧٨٥) هیچ مرۆڤێكی خراپ ناتوانێت كاری چاك بكات و چاكیی لە دەست بێتەوە.

(٧٨٦) واتە نەرم و بێ دەسەڵات مەبە لەبەردەم دوژمندا.

(٧٨٧) واتە تەگبیری دزیتی تەنها لەگەڵ دز دەكرێت.

(٧٨٨) واتە كەسێك نیاز و مەیلی كارێكی بێت هەر كات زۆرە.

(٧٨٩) واتە تەنها یەك كەس بە كاری دزیتی هەستاوە، هەزار كەس تێوەدان دەكەن.

(٧٩٠) تا شوێن و بازاڕ شێواو بێت دز بە دڵیتی.

**دز بدوێنە هەر باسی پەیژەت بۆ دەکات.**[٧٩١]
**دز شەوێك نەچێت بۆ دزی، بە ژنەکەی دەڵێت راومنێ.**[٧٩٢]
**دز و پاسەوان کردەیان یەکخەن، بە کونەبانا حوشتر سەر دەخەن.**[٧٩٣]
**دزی ماڵیی ناگیرێت.**[٧٩٤]
**دڵ ئاوێنەی دڵە.**[٧٩٥]
**دڵ لە پەڕەی گوڵ ناسکترە.**[٧٩٦]
**دڵ لە دڵ بە ئاگایە.**[٧٩٧]
**دڵ لە دڵ دەروانێت.**[٧٩٨]
**دڵ لە دڵ مەدە.**[٧٩٩]

---

(٧٩١) واتە هەموو کەس لە خەیاڵی سەرکەوتنی خۆیەتی.
(٧٩٢) واتە راهاتن لەسەر هەر کارێك بێت دەبێتە خوو.
(٧٩٣) واتە بە دوو دز دەوترێت لە دەرەوە و لە ژوورەوە یارمەتیی یەکتر بدەن.
(٧٩٤) خێزان بشزانن دز لە خۆیانە ئەو لەکە و نەنگییە نانێن بە ناوچەوانی خۆیانەوە. لێخۆشبوونیان هەیە لەبەر ناوبانگیان. هەموو خێزانێك بە متمانە لەگەڵ یەك دەژین.
(٧٩٥) واتە هەرچی لە دڵی بەرامبەرەکەتدا بێت لە دڵی تۆشدا دیارە.
(٧٩٦) واتە دڵ بە گلەیی و وتەیەکی بچووکیش بێت گەرد دەگرێت.
(٧٩٧) کەوابێت ئەو هەستەی دڵی تۆ پێی دەزانێت، خۆشەویستەکەشت بە ئاگایە لێی.
(٧٩٨) کەسێك خۆشیی یا ناخۆشییەکی کەسێکی دیکەی بوێت، وەك یەك دەبن.
(٧٩٩) واتە هەر دوو دڵەکە بێشك وەك یەکن.

دڵی وەك شووشە وایە كە شكا دەشكێت.(٨٠٠)
دڵ تەماشای دڵ دەكات.(٨٠١)
دڵ و دڵخواز دەبنە نان و پیاز.(٨٠٢)
دڵ سفرە نییە بۆ هەموو كەسێك بكرێتەوە.(٨٠٣)
دڵ مێشە لە گووش دەنیشێت.(٨٠٤)
دڵی پێت دەسووتێت.(٨٠٥)
دڵی وەك گونی هەلاج دەلەرزێت.(٨٠٦)
دڵی پێتەوەیە.(٨٠٧)

---

(٨٠٠) كە دڵێكت شكاند بێ قەڵغان مەبە.
(٨٠١) واتە دڵی دوو كەس تەماشای یەكتر دەكەن وەك یەك مامەڵەی یەكتر دەكەن.
(٨٠٢) زۆرجار بە تامەزرۆ و ئاوات و نیاز و خوازەوە دوو دڵدار بە یەك دەگەن بەڵام زوو لە یەكتر بێزار دەبن.
(٨٠٣) هەموو قسەیەكی شاراوەی دڵ نابێت و ناكرێت بۆ هەموو كەسێك بوترێت و هەڵرێژرێت.
(٨٠٤) جاروبار وا رێ دەكەوێت كەسێكی زۆر چاك و نایاب دڵی دەچێت بە كەسێكی قێزەوندا.
(٨٠٥) واتە لە رووی بەزەییەوە مامەڵەت دەكات.
(٨٠٦) بە كەسێك دەوترێت بە ترس و لەرزەوە بچێتە پێشەوە بۆ كارێك كە سەر نەگرێت بۆی.
(٨٠٧) واتە زۆری خۆش دەوێت.

**دڵی نەبوو بەماڵەوە، شەیتان دەیبرد بە خەیاڵەوە.**[٨٠٨]
**دنیا چەند نەفەسێکە، هەر نەفەسێك بۆ تەرەسێکە.**[٨٠٩]
**دنیا گەڕاوە، شەرمی شکاوە.**[٨١٠]
**دنیا با بێبات یان باران کلی نابڕێت لە چاوان.**[٨١١]
**دنیا بەسەریا رووخاوە.**[٨١٢]
**دنیا بە دڵی ئەوە.**[٨١٣]
**دنیا پیچی میزەرێکە.**[٨١٤]
**دنیا چەرخ و فەلەکە.**[٨١٥]
**دنیا وەك پەشتەماڵی حەمام وایە، هەر ڕۆژەی بە بەر**

---

(٨٠٨) بە یەکێك دەوترێت بە نابەدڵ و زۆرداریی کارێکی بەسەردا دەسەپێنن، لووت هەر نادات و نایکات.

(٨٠٩) ژیان بۆ هەموو کەس کورتە با کار و کردەوەمان جوان بێت لەو ماوە کورتەدا.

(٨١٠) ئەوەی دنیا بگەڕێت زۆر شت فێر دەبێت و لێهاتوو دەبێت و لە ڕوودا دانامێنێت.

(٨١١) ئەوە بە کەسێك دەوترێت هەرچی شتێك ڕوودات لە ناو خزم و هۆزیدا دەقی خۆی نەشکێنێت، وەکو هیچ شتێك ڕووی نەدا بێت.

(٨١٢) بە کەسێك دەوترێت کەم ئارامە و نەفەس درێژ نییە.

(٨١٣) واتە هەموو شتێك لەبارە بۆ دڵی و ژیانی.

(٨١٤) بە کەسێك دەوترێت کە ئارام بگرێت لە ئاستی گرفتەکانی ژیان، چونکە ژیان کەم و کورتە.

(٨١٥) واتە ژیان پڕە لە سەرکەوتن و دابەزین و لە خۆشیی و ناخۆشیی.

**یەکیکەوەیە.** [816]

**دنیا بە گونی.** [817]

**دنیا کلاو کلاوە.** [818]

**دنیا بنی قوولە.** [819]

**دنیا کوێرە و دوێرە** [820]

**دنیا دەوران دەورانە.** [821]

**دنیا یان زۆردار دەیخوات یان بێعار.** [822]

**دنیا هەورە، گورگ دەمی چەورە.** [823]

**دنیا بەهەشتی کەرانە.** [824]

**دنیا وەك ماستی مەیوو وایە.** [825]

---

(٨١٦) دنیا تا سەر بۆ کەس نییە، هەر ڕۆژەی بۆ کەسێکە.

(٨١٧) بە کەسێك دەوترێت گوێ نەداتە هیچ شتێك لە ژیانیدا.

(٨١٨) دنیا هەر ڕۆژەی بۆ یەکێکە و لەگەڵ یەکێکە.

(٨١٩) واتە پێویستە مرۆڤ بە ئاگا و دووربین بێت بۆ دوارۆژی.

(٨٢٠) دنیا بەری دوورە و ژیان قووڵە.

(٨٢١) دنیا هەر ڕۆژەی لەگەڵ کەسێکە و بۆ کەسێکە و لێشیان دەسەنێتەوە.

(٨٢٢) دنیا بۆ کەسێکە بە زۆر بیسەنێ و داگیری بکات یان بەبێ شەرم و حەیا بیخوات.

(٨٢٣) واتە ئەگەر کەس دیار نەبێت دنیا ئاژاوە و گێژاو بێت، دزو زۆردار و پیاو خراپ فرسەت دەهێنن بۆ خواردن و دزی و حەرامخۆریی.

(٨٢٤) دنیا خۆشە بۆ کەسانێك هەست و عەقڵیان نەبێت.

(٨٢٥) واتە ئەمن و ئاسایش بەرقەرارە.

**دنیا بۆتە چەرخی دەوران، نامێنێ بۆ کەس تا سەر شادمان[٨٢٦]**
**دنیا کێ خواردی؟ زمان لوسان، لوس و پوسان، بێ ناموسان.[٨٢٧]**
**دنیای بە دەست و دەم گرتووە.[٨٢٨]**
**دنیای لە سەری پێچاوە.[٨٢٩]**
**دنیای لە باوەش گرتووە.[٨٣٠]**
**دنیای داوەتە بەر کلکان.[٨٣١]**
**دنیای لێ بۆتە چەرمی چۆلەکە.[٨٣٢]**
**دنیای لە کۆڵ گرتووە.[٨٣٣]**
**دنیای بە گاڵتە گرتووە.[٨٣٤]**

---

(٨٢٦)دنیا وەك چەرخ دەسووڕێتەوە بۆ کەس نییە تا سەر.
(٨٢٧) دنیا تەنها ئەمانە دەیخۆن، زمان لوس و بێ ڕەوشت و بێعار.
(٨٢٨) بە کەسێك دەوترێت بەبێ بوار هەوڵ و تەقەلای زۆر بدات.
(٨٢٩) بە یەکێك دەوترێت ئەوەندە گێرمە و کێشە دەکات، وا دەزانێت دنیا بەو چاك دەبێت و بەرپرسیارە.
(٨٣٠) واتە زۆر تەماعکارە و دنیای بە قورس گرتووە.
(٨٣١) بە کەسێك دەوترێت گاڵتە بە هەموو شتێك بکات لە دنیادا.
(٨٣٢) بە کەسێك دەوترێت ترسنۆك و نەوێر غیرەتی ئەوەی نییە بچێتە پێشەوە بۆ هیچ کارێك، لە کەوتن دەترسێت.
(٨٣٣) بە یەکێك دەوترێت دەست بداتە هەرچی کارێك بە قورسی و بە خەم و پەژارە و بێ هیواییەوە بەرەو ڕووی دەچێت.
(٨٣٤) بە کەسێك دەوترێت هیچ نرخ و گرنگی نەدات بە هیچ شتێك لە ژیانیدا

دوای شەڕ ئاشتیی خۆشە.[٨٣٥]
دوای مردن ڕەحمەت چاکە.[٨٣٦]
دوای هەموو شەوێك ڕۆژ دەبێتەوە.[٨٣٧]
دوای کڵاوی بابردوو کەوتووە.[٨٣٨]
دوای هەموو تەنگانەیەك خۆشییە.[٨٣٩]
دوژمن بچووکیش بێت، ئیشی زل دەکات.[٨٤٠]
دوژمن لە ماڵت نا ئومێد بێت.[٨٤١]
دوژمنی خۆی بە شەکر دەخنکێنێت.[٨٤٢]
دوژمنی خۆی دانابوو بە دۆستم، چاوەڕێ بکەم بکەوێ کۆستم.[٨٤٣]

---

(٨٣٥) واتە شەڕ ئەوەندە خۆشە کە دەکرێت و دوایی پەشیمانیی زۆر لەدوایە ئاشتبوونەوەش زۆر خۆشە. چونکە کەس هیچی پێ نەماوە.
(٨٣٦) واتە لەدوای مردووەوە قسە بێ سوودە ڕەحمەت بوون چاکە.
(٨٣٧) دوای تاریکیی و تەنگانە خۆشیی و ڕووناکیی دەبێت.
(٨٣٨) بە کەسێك دەوترێت خۆی بێ هودە هیلاك دەکات و ئاگات بەو شتەی هەوڵی بۆ دەدات و دوای کەوتووە.
(٨٣٩) دوای هەموو نەبوونییەك و بێ هیواییەك گەیشتنە بە هەموو ئاواتێك و خۆشییەك.
(٨٤٠) مرۆڤ پێویستە بە ئاگا بێت لەگەڵ ناحەز و دوژمندا پشت گوێیان نەخات.
(٨٤١) واتە مەیەڵە دوژمن لەسەر ڕەنج و ماڵت بە ئاکام بگات.
(٨٤٢) بە کەسێك دەوترێت بە گفتی جوان و خزمەت و پیاوەتیی دوژمنی خۆی پەشیمان بکاتەوە.
(٨٤٣) تا ناحەز و دوژمنت دانا بێت،چاوەڕێی کۆستێکی گەورەتر بکە.

**دوژمنی دانا لە دۆستی نادان چاکترە.** [٨٤٤]
**دوژمنایەتی زانا، لە دوژمنایەتی نەزان خۆشترە.** [٨٤٥]
**دوژمنی دوژمنم دۆستمە، دۆستی دۆستم دۆستمە.** [٨٤٦]
**دوعا مەکە لە نەویستان، دەکەوێت لە خۆشەویستان.** [٨٤٧]
**دووگم خۆش بێت، خانووم بۆ چییە.** [٨٤٨]
**دۆ تا نەیژەنیت دۆ نادات.** [٨٤٩]
**دۆ و دۆشاو تێکەڵ دەکات.** [٨٥٠]
**دۆ بێ و بە خولق و خۆ بێ.** [٨٥١]

---

(٨٤٤) کەواتە دوژمنێك دانا بێت، دەزانێت چی بکات، بەڵام دۆستی بێ عەقڵ و نادان زەرەری زۆرە.
(٨٤٥) دوژمنی زانا تیا دەهێڵێتەوە تێ ناکەوێت، بەڵام دوژمنی نەزان هیچی تیادا ناهێڵێتەوە بەشی ئاشتیی.
(٨٤٦) ئەوەی دۆستایەتی لەگەڵ دۆستما بگرێت دۆستمە بەڵام نەخێر، دوژمنم هەر دوژمنمە.
(٨٤٧) ئەمە کەسانێکی پێ دەترسێنن دوعا لە وەخت و ناوەختا لە کەس نەکات با نەگەڕێتەوە بۆ خۆیی.
(٨٤٨) ئەمە (چیرۆکی مەڕ و بزنە) و نموونەیە و وانەیە بۆ هەندێك کەس کە لە سەرەتای ژیانیاندا بیر لە دوارۆژی خۆیان ناکەنەوە.
(٨٤٩) هەموو کارێك پێوەی هیلاك نەبیت بەرهەمی نییە.
(٨٥٠) بەو کەسانە دەڵێن کە تێگەیشتنیان نییە زۆر شێتن.
(٨٥١) بە کەسێك دەوترێت کاتێك میوانی دەچێت بە ڕووی خۆش و کرداری جوانەوە بە ڕێی دەکات، هەر چەند خواردنی چاکی لەماڵدا نەبێت.

**دۆستت هەزار بێت کەمە، دوژمنت یەك بێت خەمە.**[852]
**دۆست دەتگریەنێت و دوژمن پێت پێ دەکەنێت.**[853]
**دۆستی دۆستم دۆستمە، دوژمنی دوژمنم دۆستمە.**[854]
**دۆستی وامان بێت، دوژمنمان ناوێت.**[855]
**دۆم بۆ سەروپێیەك ماڵی خۆی جیا دەکاتەوە.**[856]
**دۆم بۆ دانیشتن ماڵی وێرانە.**[857]
**دۆم بێت، کلاش بۆ خۆی بکات.**[858]
**دوو ببیستە و یەك بڵێ.**[859]
**دوو گا لە دۆڵێکا ڕەنگی یەك نەگرن، خووی یەك دەگرن.**[860]

---

(٨٥٢) دۆست پێویستە بۆ ژیانی هەموو کەس، دوژمن مەترسییە.
(٨٥٣) کاتی لێقەومان و هەڵە دۆست لەگەڵتا دەگری و پێی ناخۆشە، بەڵام دوژمن دەخەنێت پێت.
(٨٥٤) دۆستی دۆست هەر دۆستە، دوژمنی دوژمنم نابێت بە دۆست.
(٨٥٥) هەندێکجار ئەوەی دۆست پێت دەکات، دوژمن پێت ناکات.
(٨٥٦) هەندێك کەس بەلایانەوە نەنگە پیاوەتی بکەن و ماڵی خۆیان دەرخواردی کەس بدەن.
(٨٥٧) ئەمە بە کەسێك دەوترێت، دەبێت ڕۆژانە کار بکات، بۆ ئەوەی بیخوات و چاوەڕوانی دەستی کەس نەکات.
(٨٥٨) واتە هەموو کەسێك شتی خۆی لە شتی هەموو کەس چاکتر دروست دەکات.
(٨٥٩) کەوابێت زۆر بڵێ مەبە.
(٨٦٠) دوو کەس هاوڕێیەتی یەکتر بکەن خووی یەکتر دەگرن و شت لە یەکەوە فێر دەبن و هەڵسوکەوتیان وەك یەکی لێ دێت.

دووروو بێ ئابروو.[861]
دوو خووی سەبرێك.[862]
دوو کاڵەك بە دەستێك هەڵناگیرێت.[863]
دوو نینۆکان دەخورێنم دوو کەسان بە شەڕ دێنم.[864]
دوور برۆ و دروست وەرەوە.[865]
دوور و دۆست.[866]
دوور بینی دەکات.[867]
دووریی و دۆستیی.[868]
دووربینیی پەشیمانیی لە دوا نییە.[869]

---

(٨٦١) ئەوەی دووڕوو و دووزمانە هیچ حەیایی نییە.
(٨٦٢) ئارامگرتن باشترە، لە زەرەر و بێبەشبوونی تەواو و دەم سووتاندن.
(٨٦٣) مرۆڤ کارێك نەکات مەحاڵ بێت. چونکە زەردەرەکەی بە ئازایەتی باس ناکرێت و بۆی ناگەڕێتەوە.
(٨٦٤) ئەمە دەکەوێتە سەر ساکاریی عەقڵی هەندێك کەس.
(٨٦٥) بە کەسێك دەوترێت ئەگەر ڕێگای دووریشی بڕی زۆر ئاگای لە خۆی بێت و لانەدات شت بەسەر خۆی بهێنێت.
(٨٦٦) واتە کاری یەکتر تێکەڵ نەکرێت و دەست نەخرێتە ئیشی یەکتر بۆ ئەوەی دۆستایەتی بمێنێت.
(٨٦٧) واتە زرنگە و هەستیارە، بۆ دوارۆژی خۆی بەرنامەی داناوە.
(٨٦٨) دوورکەوتنەوە، سنووردانان، هەریەك بۆ خۆی.
(٨٦٩) واتە ئەوەی بە بەرنامە قۆناغ بۆ خۆی دادەنێت لە ئیشوکاری ژیانیدا سەرکەوتووە.

**دوور کوژی نزیك به خەسار.**[870]
**دووگی چەور بێبەڵا نییە.**[871]
**دیاری شوان یان شەنگە یان هەڵەکۆك.**[872]
**دیاری مێرووله قاچه کولەیە.**[873]
**دیزە بە دەر خۆنه دەکرێت.**[874]
**دیزەی چەور ئاو ناگرێتە خۆی.**[875]
**دیزە چەورەکەی دوو کون لەبنا، دەستە چەورەکەی سوو بەسەر منا.**[876]
**دیزەیەك کەیبانو بیشکێنێت تەقەی نایەت.**[877]

---

(۸۷۰) به کەسێك دەوترێت له دوورەوە زۆر جوان بێت، بەڵام کاتێك نزیك دەکەویتەوە زۆر ناشیرینە.
(۸۷۱) واته دەوڵەت و بوون و جوانیی زۆر گرفت دروست دەکات بۆ مرۆڤ.
(۸۷۲) دەست و دیاری هەر جوانە هەر چەند هەرزان و کەمیش بێت.
(۸۷۳) دیاریش بەپێی حاڵ و توانا و بوون.
(۸۷٤) واته ئەوەی ڕوویدوە با ناوی نەبرێت و بپۆشرێت.
(۸۷٥) کەوابێت پیاوی بێعار و بێ هەست هیچ خەتا و تاوانێك له خۆی ناگرێت.
(۸۷٦) واته ئەو کەسانەی به ئاشکرا عەیببارن، عەیبەکەی خۆیان دەخەنه سەر شانی کەسێکی دیکه و له خۆیان دووری دەخەنەوە.
(۸۷۷) واته ئەگەر کەیبانو یان گەورەی ماڵ خەتایەکی کرد کەس ناتوانێت هیچ بڵێت و خەتاباری بکات
و هەمووی بێدەنگە له ئاستی.

**دیزە رەشەی خڵتە لەبن، خڵتەکەی خۆت مەسوو لە من.**[٨٧٨]

**دیکل بۆ سەربڕینە.**[٨٧٩]

**دیگەڵەی نەدیوە، چەند ماڵە.**[٨٨٠]

**دێر بێت و نێر بێت.**[٨٨١]

**دین سز ئیمان سزی گەرەکە.**[٨٨٢]

**دەبێت بەسەر لاشەکەمدا بڕوات.**[٨٨٣]

**دەچمە شارێك کەس نەمناسێ، خۆم هەڵکێشم پڕ بە کراسێ.**[٨٨٤]

**دەریا بە دەمی سەگ پیس نابێت.**[٨٨٥]

---

(٨٧٨) بە کەسێك دەوترێت زۆر خوار و خەتابارە، بەڵام خەتای کۆن و تازەی دەخەنە سەر شانی یەکێکی دیکە.

(٨٧٩) وەکو کورد وتویەتی بەرخی نێر بۆ سەربڕین باشە، کەوابێت، نەك کەڵەشێر یان بەرخ نێرینە هەمووی
بۆ بەرگری و خۆبەخشین باشە.

(٨٨٠) بەو کەسانە دەوترێت کارێك یان کە شتێك دەکەن، دوایش خۆیان وا دەردەخەن کە ئاگایان لەو شتە نییە.

(٨٨١) واتە مرۆڤ ئارام بگرێت تا شتێکی باشتری دەست دەکەوێت.

(٨٨٢) واتە کەسی بێ ویژدان و خراپ، هەر لە وێنەی خۆی باشە بۆی.

(٨٨٣) واتە ئێمە بێ دەسەڵات نین وەکو ئەو بەتواناین و بەرگریی دەکەین.

(٨٨٤) بۆ کەسێکە هیچی لە بارا نییە، دەبێت لای کەسانێك خۆی هەڵکێشێت و باسی خۆی بکات نەیناسن،
بۆ ئەوەی بە درۆی نەخەنەوە.

(٨٨٥) پیاوی گەورە و پایە بڵند و زانا بە قسە و زەمی مرۆڤی هیچ و پووچ ناشکێت.

**دەردەدار بە حاڵی دەردەدار دەزانێت.**(٨٨٦)
**دەرزی هەڵدەیت ناکەوێتە سەر زەوی.**(٨٨٧)
**دەرزییەك بکە بە خۆتا، ئینجا سوژنێك بکە بە خەڵکدا.**(٨٨٨)
**دەرگای خێری داخراوە، هی شەڕیشی بەربڵاو.**(٨٨٩)
**دەروونی قووڵە.**(٨٩٠)
**دەردی بێ دەرمان، دڵی بێ ئامان.**(٨٩١)
**دەردەژێ، زۆر دەژێ.**(٨٩٢)
**دەست بە دەمی سەگا دەکات.**(٨٩٣)
**دەست بە کڵاوی خۆتا بگرە، با با نەیبات.**(٨٩٤)

---

(٨٨٦) ئەوەی گرفت و دەردێك و ئازارێکی نەچێژتبێ بە حاڵی دەردەدار نازانێت.
(٨٨٧) ئەو شوێنەی قسە و باسی دەکات زۆر قەرەباڵغ بووە.
(٨٨٨) کاتێك دەتەوێت قسەی ناخۆش یا خراپەیەکت بۆ خەڵك بوێت بەراوردێك بکە لە بەینی خۆت و ئەو کەسەدا لە رووی زەرەرمەندییەوە.
(٨٨٩) کاتێك مرۆڤ بیر لە شەڕ و خێر دەکاتەوە خوای بیر بێت.
(٨٩٠) زۆر گوێ دەگرێت و تێ دەگات و ئارامگرە.
(٨٩١) ئەوەی تووشی گرفتێکی بێچارە و دەردی بێ دەرمان دەبێت، دڵی خۆی و دۆستەکانی بێ ئامان دەبێت.
(٨٩٢) بەو کەسانە دەوترێت لە ژیانیاندا زۆر تووشی دەرد و نەخۆشی دەبن کە بەرگەیان گرت بەرگریش پەیدا دەکەن و زۆر دەژین.
(٨٩٣) واتە ئەو کەسانە ئەوەندە هار و شەڕەنگێزن شەڕ بە عالەم دەفرۆشن.
(٨٩٤) واتە ئاگات لە خۆت بێت و بەشداریی شەڕی کەس مەکە.

دەست لە گونان درێژتر.[٨٩٥]
دەست دەست دەناسێت.[٨٩٦]
دەستخەڕۆت کردم، ڕەنجەڕۆم مەکە.[٨٩٧]
دەست لە دەست و قووەت لە خوا.[٨٩٨]
دەسشکاو باشترە، لە دڵشکاو.[٨٩٩]
دەست سپی‌یە.[٩٠٠]
دەست بخەرە دەمی بزانە دەیگەزێت.[٩٠١]
دەست ئێش دەکات و چاو دەترسێت.[٩٠٢]
دەست پانکەیتەوە، لە پێ دەکەوێت.[٩٠٣]

---

(٨٩٥) بە کەسێك دەوترێت دەستی لە کۆشا بێت و هیچ کارێك نەکات یان لە داوایەکدا شکست بهێنێت.
(٨٩٦) لە کەسێك ئامانەتێکت وەرگرت بیدەرەوە دەست هەمان کەس.
(٨٩٧) بە کەسێك دەوترێت دەستیی دەستیی بە کەسشێکی دیکە بکات، دەڵێت بێ هیواشم مەکە.
(٨٩٨) ئەمە کاتێك دەوترێت بە ئیشێك هەستێت زیاد لە توانای خۆت، پشت بە خوای گەورە ببەستێت.(ئێوە یەك بگرن و بەیەکەوە هەوڵ بدەن، خوای گەورەش هێز و تواناتان ئەداتێ).
(٨٩٩) واتە دەستی شکاو خۆی دەگرێتەوە، بەڵام دڵی شکاو چاك نابێتەوە.
(٩٠٠) بە یەکێك دەوترێت هیچ کارێك نەکات و پارەی نەبێت.
(٩٠١) بۆ کەسێکە خۆی بێدەنگ و عەقڵ و هەژار دەردەخات.
(٩٠٢) بە کەسێك دەوترێت غیرەتی ئەوەی نییە دەست بداتە کارێك و بیکات.
(٩٠٣) کەسێك فێری سواڵکردن بێت ناتوانێت ئیشوکار بکات.

دەست دەخاتە قورگی گورگەوە و دەیخنکێنێت.[904]
دەست دەنێتە قورگی شێرەوە.[905]
دەستە وەستانە، وەستای قسانە.[906]
دەستە چەورەکەی خۆت مەسوو بەسەر مندا.[907]
دەستە و دامان دانیشتووە.[908]
دەستت بە کەوگیر بێت، چاوت لە فەقیر بێت.[909]
دەستگیرانی هیچ کەس ناشیرین نییە.[910]
دەستگیرانیی و چاوەڕوانیی.[911]
دەستی لە کفن دەرهێناوە.[912]

---

(٩٠٤) واتە زۆر ئازایە و سڵ لە دوژمن ناکەتەوە.

(٩٠٥) واتە دەتوانێت بەرامبەر ئازاترین کەس بوەستێتەوە.

(٩٠٦) بە یەکێك دەوترێت هیچ کارێکی پێ ناکرێت بەڵام لە قسەدا کارامەیە.

(٩٠٧) واتە عەیبەکانی خۆت مەهێنە بەسەر مندا.

(٩٠٨) بە کەسێك دەوترێت بێکار و کردار دانیشتووە و بیر دەکاتەوە.

(٩٠٩) بە کەسێك دەوترێت ئەگەر کارێك و پلە و پایەیەکی گرتە دەست چاوی لە خوار خۆیەوە بێت، هەر بۆ خۆی کار نەکات .

(٩١٠) (خۆشەویستیی کوێرە هەر چەندە دەبینێت). بۆیە دەستگیران ناشیرین نییە.

(٩١١) کەواتە کاتی دەستگیرانی کچ و کوڕ چاوەڕوانی یەکترن بۆ بەیەکگەیشتن.

(٩١٢) واتە دەستی لە خۆی شتووە و بە تەمای هیچ نییە.

**دەستی نا پەرژێت سەری خۆی بخورێنێت.**[٩١٣]
**دەستی لە بنی هەمانەکە دەرچووە.**[٩١٤]
**دەستی لێ بشۆ لە دۆستی سەر کاسە.**[٩١٥]
**دەستی لەبنا بریوە.**[٩١٦]
**دەستی ئەسپی درێژ نەبێت.**[٩١٧]
**دەستی بڵاو بە پیر گەداوە دەچێت.**[٩١٨]
**دەستی تەماع درێژە.**[٩١٩]
**دەستی خێری نایە سەری.**[٩٢٠]
**دەستی خۆی نییە و ماری پێدەگرێت.**[٩٢١]

---

(٩١٣) واتە کارگێڕێکی زۆر شپرزە و قاڵە.
(٩١٤) بە کەسێك دەوترێت هیچی بە دەستەوە نەماوە و چاوەڕوانی ئەنجامی زەرەرێکی گەورە بکات.
(٩١٥) واتە ئەوەی لەسەر سفرە بۆ خواردن و تەماع لەگەڵ تۆ بێت دەستی لێ بشۆ.
(٩١٦) واتە ئیفلاسی پێ کردووە و هیچی بە دەستەوە نەهێشتووە.
(٩١٧) ببە کەسێك دەوترێت چاکە وز یارمەتیی لە دەست نایەت.
(٩١٨) واتە ئەگەر ڕەزیل نەبیت دڵکراوە و دەستکراوە بیت،بەرامبەرەکەت هەر وەکو خۆت دەبێت.
(٩١٩) هەموو کەس حەز بە پارە و سامان دەکات دەستی بکەوێت.
(٩٢٠) واتە خێری بۆ ئەو کەسە هەیە و خزمەتی دەکات.
(٩٢١) بە یەکێك دەوترێت کە ئیشێکی ستەمکاریی و بزێو بە کەسێکی دیکە بکات.

دەستی بێگانە هەر بۆ مار کوشتن باشە.[٩٢٢]
دەستی شکاو جێی خۆی ناگرێتەوە.[٩٢٣]
دەستی چوو بە زاخا.[٩٢٤]
دەستی لە دنیا شتووە.[٩٢٥]
دەستی ماندوو لەسە سکی تێرە.[٩٢٦]
دەستی شەیتان بشکێت.[٩٢٧]
دەستی شێر لەت و پەتم بکات، نەك دەستی ڕێوی خاڵ و خەتم بکات.[٩٢٨]
دەستێك حاكم بیبرێت خوێنی نییە.[٩٢٩]
دەستێك خوار گیرایەوە بۆ برین باشە.[٩٣٠]
دەستێك نەمتوانی بیبڕم، دەبێت ماچی بکەم.[٩٣١]

---

(٩٢٢) واتە کەمجار بێگانە خێر دەداتەوە، تێکەڵ بە خۆتی مەکە.
(٩٢٣) کەسێك قاچی هەڵخزا، حورمەتی پێشوی بۆ ناگەڕێتەوە.
(٩٢٤) بە کەسێك دەوترێت زەرەرمەندییەکەی زۆر پێوە دیار بێت.
(٩٢٥) وازی لە کەشوفش و کەشخەیی دنیا هێناوە، چونکە بە تەمای ژیان نییە.
(٩٢٦) ئەوەی ئیش بکات پارەی چاك پەیدا دەکات و تێرە.
(٩٢٧) کارێك لە کار بترازێت، لە دەست دەرچێت شەیتان تاوانبار دەکەن.
(٩٢٨) ئەوەی زەرەریشم لێ بدات با کەسێکی ئازا بێت، نەك مرۆڤێکی ترسنۆك و کەم پیامدا هەڵ بدات.
(٩٢٩) لەبەر ئەوەی فەرمانی یاسایە و ڕاستە.
(٩٣٠) کەواتە مەهێڵە کاری خوار ڕووت تێ کات، کە ڕووی تێ کردی چارەسەری بۆ نییە تیا دەچێت.
(٩٣١) کارێك لە دەسەڵاتم نەبوو بەسەریا، دەبێت ملی بۆ شۆڕ بکەم.

**دەستیم بە بۆنەوە نەکردووە.**[٩٣٢]
**دەستم لە هەویرە، هەر ئەوەندەم لە بیرە.**[٩٣٣]
**دەستیان لە دەستە و تۆیان مەبەستە.**[٩٣٤]
**دەستی نا لە ماڵی خۆی.**[٩٣٥]
**دەستنوێژ بگرە، ئینجا ناوی بەرە.**[٩٣٦]
**دەستیش دەوەشێنێت و هاواریش دەکات.**[٩٣٧]
**دەوڵەمەند پیرۆز بێت، هەژار لە کوێت بوو؟.**[٩٣٨]
**دەفی دەنگ نادات.**[٩٣٩]

---

(٩٣٢) بە کەسێك دەوترێت سەربەست بێت لە ئیشوکاریدا. کەس ناتوانێت دەستی بگرێت و ڕێگای لیٚ ببەستێتەوە.
(٩٣٣) ئەمە چیرۆکی دایك و کوڕێکە، کوڕەکە لە دایکی دەپرسێت؟ چەند شووت کردووە هەتا (دە) شوو دەڵێت دوایی پێی دەڵێت دەستم لە هەویرە هەر ئەوەندەم لە بیرە.
(٩٣٤) واتە خۆبەخۆی خۆیان لەلایەکەوە ڕێکەوتوون، کەسێکی دیکەیان مەبەستە.
(٩٣٥) ئەمە بە کەسێکی زۆر ڕەزیل و ڕیسوا دەڵێن دەست نەکات بە گیرفانیدا.
(٩٣٦) واتە کەسێکی زۆر خراپ دەیەوێت ناوبانگی کەسێکی چاك تێك بدات.
(٩٣٧) بە کەسێك دەوترێت لە خۆی ڕانابینێت ڕاستەوخۆ کارێك بکات، بە لاکووت دەیکات و بۆی دەردەچێت.
(٩٣٨) پیرۆزبایی لە دەوڵەمەند دەکرێت لە تازەکارییەکانیدا بەڵام هەژار جلێکی تازە بکات، دەڵێن لە کوێت بوو؟.
(٩٣٩) واتە کەس گوێی لیٚ ناگرێت و پشتگویٚ خراوە.

**دەم بووەستێت سەر سەلامەتە.**[٩٤٠]
**دەم تەری کاسە وشك.**[٩٤١]
**دەم دەخوات و چاو شەرم دەکات.**[٩٤٢]
**دەمە چیت لێ کەمە.**[٩٤٣]
**دەم بوو بە تەڵەی تەقیوو.**[٩٤٤]
**دەمی پڕ لە خوێنە.**[٩٤٥]
**دەمی شڕە.**[٩٤٦]
**دەمی چۆتە کلیلە.**[٩٤٧]
**دەمی سەگ بە تیکە ببەستە.**[٩٤٨]
**دەمی نایگاتێ و دەڵێت سوێرە.**[٩٤٩]

---

(٩٤٠) واتە زمان وەکو ئەسپ وایە چۆن تاوی بدەیت وا دەڕوات.
(٩٤١) واتە بە دەم هیچی نەهێشتۆتەوە بەڵام هیچی لە دەست نابێتەوە.
(٩٤٢) بە کەسێك دەوترێت زۆر هەراش بێت لە خواردندا کە هیچ بۆ کەس ناهێڵێتەوە، چاو بێزار بێت لەو دیمەنە.
(٩٤٣) واتە بە دەم هەموو شتێك ئاسانە بەڵام بە کردەوە گرانە.
(٩٤٤) بە کەسێك دەوترێت لە ئاستی ڕاستیدا نەتوانێت یا نەوێرێت هیچ بڵێت.
(٩٤٥) واتە قسە و تەگبیرەکانی شەڕانیی و خوێناوییە.
(٩٤٦) واتە هاتو و برد بە قسەی خەڵکییەوە دەکات و نەهێنیی خەڵکیی ناپارێزێت.
(٩٤٧) واتە هیچ وەڵامی پێ نییە.
(٩٤٨) ئەوەی زمانی بێ ڕەحم و نارەحەتە بە بەرتیل بێدەنگی بکە.
(٩٤٩) هەندێك کەس ئەوەی دەیەوێت بە ئاسانیی دەستگیری نابێت لێی دەبێتە کوردە ناموسێ و دەڵێت پێویستم پێی نییە.

دەمی خەڵکیی مشتی خۆم نییە بینوقێنم.[٩٥٠]
دەمی دەڵێیت چەقەنەیە.[٩٥١]
دەمی تەتەڵە دەکات.[٩٥٢]
دەمم نەبێت ها بکەم، پێم نەبێت ڕا بکەم، ئەی قوڕی کوێ بەسەر خۆما بکەم.[٩٥٣]
دەنگی دەهۆڵ لە دوور خۆشە.[٩٥٤]
دەنگی هەیە و ڕەنگی نییە.[٩٥٥]
دەنگ دەکەم بەدناوم، دەنگ ناکەم تەنگاوم.[٩٥٦]
دەنگم خۆش بووایە بۆ خۆم دەگریام.[٩٥٧]
دەهۆڵێکی خستۆتە بندەستی و داینانێت.[٩٥٨]

---

(٩٥٠) دەمی کەس بە کەس ناگیرێت.
(٩٥١) واتە خێرا خێرا و بە دەنگی بەرز قسە دەکات خەڵکیی بێزار دەکات.
(٩٥٢) واتە خۆیشی نازانێت چی دەڵێت.
(٩٥٣) کەسێك ئەمە دەڵێت لەژێر گوشاردایە هەموو ڕێگایەکیان لێ گرتووە.
(٩٥٤) بە کەسێك دەوترێت ناو و ناوبانگی زۆر زل بێت، بەڵام لە نزیکەوە دوای لێکۆڵینەوە زۆر بێ نرخ و ساختەچی دەردەچێت.
(٩٥٥) بە کەسێك دەوترێت دەنگ و سەدای گەورەیە بەڵام ناوێرێت خۆی دەرخات ڕووی مەجلیسی نییە.
(٩٥٦) هەندێك کەس بەرامبەر مافی خۆیشی ناتوانێت بەرگری بکات، دەنگیش ناکات ماف خوراوە و لە تەنگانەدا.
(٩٥٧) کەواتە ئەوەی دەنگ و قسەی ناسازە با هەر بێدەنگ بێت.
(٩٥٨) واتە لە قسە و باسێك خەریکە کۆڵ نادات.

**دەهۆڵەکەی درراوە.**[٩٥٩]

**دەوەن بە ئاشە.**[٩٦٠]

**دەوەن هەر دەبێت بە دار.**[٩٦١]

**دە وەرە چیت دیوە بیگێڕەوە.**[٩٦٢]

**دە وەرە ئەم کەرە لەو قوڕە دەربێنە.**[٩٦٣]

**دەوڵەمەندی بە دڵە، نەك بە ماڵ و پارە.**[٩٦٤]

**دەوران دەوڵەتت لە دەست دەسێنێت بەڵام ناوی چاك تا سەر دەمێنێت.**[٩٦٥]

**دەیەوێت ماسی بگرێت و قولە پێی تەڕ نەبێت.**[٩٦٦]

---

(٩٥٩) واتە ئەو قسانەی ئەو کردویەتی تا ئێستا باوی نەماوە و دەنگی ناڕوات.

(٩٦٠) لەسەر دوو کەسی بێ عەقڵ وتراوە، کە لەسەر قسەیەکی پڕوپووچ یەکتریان زەرەرمەند کردووە.

(٩٦١) واتە هەموو درەختێکی بچووك دەبێتەدارێکی بەرز و بە سایەو سێبەر، هەموو منداڵێکی باش دەبێتە پیاوێکی کارامە.

(٩٦٢) واتە کردەوەی زۆر کەس جێی سەرسوڕمانە ناوترێت.

(٩٦٣) واتە گرفتەکە ئەوەندە گەورەیە کەس ناتوانێت دەستی باتێ.

(٩٦٤) دەوڵمەندی بێ خێر و بەرچاوتەنگ هەیە گیرفانیشی پڕە، بەڵام خەڵکێك هەیە کەمیشی هەیە دڵ و دەروونی فراوانە و بەخشندەیە، وەکو چۆن ژیریی و دانایی بە تەمەن نییە.

(٩٦٥) واتە ڕۆژگار تێدەپەڕێت و کورسی و پلەو پایە و ماڵ و سامان بۆ کەس تاسەر نییە، ئەوەی چاکە و پیاوەتیی و خزمەتکردنی خەڵك هەر دەمێنێت.

دەپیاتە سەر ئاو و ئاوی نادات و دەیهێنێتەوە.[967]
دەڵێیت ئاگری بن کایە.[968]
دەڵێیت ئاڵەتی خواردووە.[969]
دەڵێیت ئاو لای داوە.[970]
دەڵێیت ئاسکە کێوییە.[971]
دەڵێیت ئاشی ئاو کەوتەیە.[972]
دەڵێیت ئەسپێی کراس کۆنە.[973]
دەڵێیت ئەسپی تۆپخانەیە.[974]
دەڵێیت ئەو ڕۆژەیە کە قەرەوەیسی تیادا کوژاوە.[975]

---

(٩٦٦) بە کەسێك دەوترێت لە ژیانیدا قازانج بکات و هەموو شتێکی دەستگیر بێت و هیلاك نەبێت.
(٩٦٧) بەو کەسە جامباز و زۆرزانانە دەوترێت هەموو پەتگ و ڕەنگێکیان لایە لە هەڵسوڕاندنی خەڵکیدا.
(٩٦٨) بەوانە دەوترێت شەڕو ئاژاوە بۆ خەڵکیی دەنێنەوە.
(٩٦٩) بە کەسێك دەوترێت هەموو کات تووڕەیە و ئاگری لیّ دەبێتەوە.
(٩٧٠) بە کەسێك دەوترێت خەم و بێدەنگی کەناری پێبگرێت.
(٩٧١) بە کەسێك دەوترێت زۆر لەش سووك بێت و ئازایانە بجوڵێت.
(٩٧٢) بە شوێنێك دەوترێت جووڵە و بێدەنگی باڵ بکێشێت بەسەریا.
(٩٧٣) بەوانە دەوترێت کە کەسێکیان گرت بە ئاسانیی لێی نابنەوە.
(٩٧٤) واتە کەسێکە جوان بەخێوکراوە و زۆر بەهێزە.
(٩٧٥) بەو شوێنە دەڵێن قەرەباڵغی و پڕ دەنگە دەنگ و ئاژاوەیە.

دەڵێیت بەردی ئاوە سووە.[976]
دەڵێیت بە دەم داییناوە، کتومت خۆیەتی.[977]
دەڵێیت بەردی بن گۆمە.[978]
دەڵێیت بەرزەکی بانانە.[979]
دەڵێیت بەرووی لە دەما تەقیوە.[980]
دەڵێیت بۆ ئاگر هاتووە.[981]
دەڵێیت بووکە بە بارانییە.[982]
دەڵێیت بێژنگی بن پچراوە.[983]
دەڵێیت پا پۆرەکەی نوقم بووە.[984]
دەڵێیت پەڕی با بردووە.[985]

---

(٩٧٦) بە کەسێك دەوترێت ئەوەندە زەمان ڕەتانویتی و ڕاپهێناوە و بەدخوو بووە و کەس دەرەقەتی نایەت و کەس خۆی لە قەرە نادات.
(٩٧٧) بە کەسێك دەوترێت بە شێوە و کردار لە کەسێکی خۆی بکات.
(٩٧٨) بە کەسێك دەوترێت هیچ نەجووڵێت و لە جێی خۆی و بێدەنگ بێت.
(٩٧٩) بە کەسێك دەوترێت دەستی هەبێت لە بەزم و ئاژاوەیەکدا، کەس پێی نەزانێت و بۆی دەرچێت و کەس ناوی نەبات.
(٩٨٠) بە کەسێك دەوترێت چەنەباز و هەڵەوەڕ بێت، بە دەنگی بەرز و خێرا قسە بکات.
(٩٨١) بە کەسێك دەوترێت بچێت بۆ میوانی و زوو هەستێت.
(٩٨٢) بە کەسێك دەوترێت سەرتاپای ئاوی لێ بچۆڕێت.
(٩٨٣) بە کەسێك دەوترێت لە هیچ کارێکدا نەتوانێت بەرپرسیار بێت.
(٩٨٤) بە کەسێك دەوترێت لە ئەنجامی زیانێکدا بێدەنگی پیشان دەدات.
(٩٨٥) بە کەسێك دەوترێت دوای زەرەرێك بکەوێت و خۆی نەگرێتەوە.

دەڵێیت پشیلەی سەروپێخانەیە.[٩٨٦]
دەڵێیت پیریژنی دۆ ڕژاوە.[٩٨٧]
دەڵێیت پێ بە مێرووڵەدا دەنێت.[٩٨٨]
دەڵێیت پڕ بە پێستێتی.[٩٨٩]
دەڵێیت چاو دەنێتەوە.[٩٩٠]
دەڵێیت جاشی ماکەرێکن.[٩٩١]
دەڵێیت جن گۆریویێتی.[٩٩٢]
دەڵێیت جن پیا تسیوە.[٩٩٣]
دەڵێیت جیوەی تیایە.[٩٩٤]
دەڵێیت حەمامی ژنانە.[٩٩٥]

---

(٩٨٦) بە کەسێك دەوترێت کە گوپ خڕ و قەڵەو و تێروپڕە.
(٩٨٧) بە کەسێك دەوترێت بەبێ هۆ و بە هۆ هەر بۆڵەی بێت.
(٩٨٨) بەو کەسانە دەوترێت زۆر بە ئاگا و بە ترس و نەرم دەڕۆن بە ڕێدا.
(٩٨٩) واتە هەر بۆ خۆی کراوە و قابیلێتی.
(٩٩٠) واتە زۆر دێت و دەچێت بەبێ هۆ.
(٩٩١) بە چەند کەسێکی خراپ دەوترێت کە کەسیان لە کەسیان چاکتر نەبن.
(٩٩٢) واتە زۆر ناشیرین شێوەیە.
(٩٩٣) واتە ڕەزا قورسی و ناشیرینییەکەی لە تاما نییە.
(٩٩٤) واتە جووڵەکەی ئیرادەی تیادا نییە و بێ هۆیە.
(٩٩٥) بە شوێنێك دەوترێت پڕ بێت لە دەنگە دەنگ و شپرزەیی و ڕاکە ڕاکە.

دەڵێیت حوشتری ناو پەمووە.[996]
دەڵێیت خۆڵی مردوو بەسەریا کراوە.[997]
دەڵێیت خەرمانەی گوڵە.[998]
دەڵێیت دۆمی خەڵاتکراوە.[999]
دەڵێیت داری وا وەیلایە.[1000]
دەڵێیت دانی مارە.[1001]
دەڵێیت سفتی ڕۆیە.[1002]
دەڵێیت دیزەی ڕەشە.[1003]
دەڵێیت ڕەسمی دیوارە.[1004]

---

(٩٩٦) حوشتر بە سروشت حەزی لە دەنکی پەمووە، کە دەمی تێژەن چاو دادەخات تا تێر دەخوات و گێژ دەبێت.
(٩٩٧) بە کەسێك دەوترێت خەفەتبار و بێدەنگ و کز لە پەنایەکدا دانیشتبێت.
(٩٩٨) بە کەسێك دەوترێت ئەوەندە جوانە نازانیت سەیری کوێی بکەیت.
(٩٩٩) واتە دۆم و جلوبەرگی زۆر شڕ و پنتییە، جلی خەڵاتکراویشی لە بەردا جوان نییە.
(١٠٠٠) بە کەسێك دەوترێت کە لاواز بێت و لەش و لاری ناشیرین بێت.
(١٠٠١) واتە زۆر زرنگ و زیرەك و هەستیارە.
(١٠٠٢) بەو دایکانە دەوترێت بە ئاواتی منداڵێکی خۆیانن لە باوەشی بگرن.
(١٠٠٣) بەو کەسە پێست ڕەشانە دەڵێن وەکو دیزە چەور و پیسن.
(١٠٠٤) بە کەسێکی زۆر جوان دەڵێن بەڵام بێدەنگ و هیچ لە بارا نەبووە.

دەڵێیت ڕۆنی وورچ لە جەستەی دراوە.[1005]
دەڵێیت ڕۆنی سەگ دراوە لە قەلبی.[1006]
دەڵێیت ڕێوی قامچووغەیە.[1007]
دەڵێیت ژنە باخەوانە.[1008]
دەڵێیت سەگی پێ سووتاوە.[1009]
دەڵێیت سەگی هەڵە پاسە.[1010]
دەڵێیت سوێنەی چەورە ئاو ناگرێتە خۆی.[1011]
دەڵێیت سەگی سەر خەرمانە.[1012]
دەڵێیت شەیتان تفی کردۆتە دەمی.[1013]
دەڵێیت شەیتان دەرسی داداوە.[1014]

---

(١٠٠٥) بە کەسێك دەوترێت جەستەی ساغ و چالاك بێت و زیاد لە چالاکی توانای مرۆڤێك بجولێت.
(١٠٠٦) واتە دڵی زۆر خۆشە و هەست بە بەختیاریی دەکات.
(١٠٠٧) دیارە ڕێوی قامچووغە بەناوبانگە بە لاوازی و فێڵبازیی.
(١٠٠٨) بەو جۆرە ژنانە دەڵێن کە هات و هاواریانە.
(١٠٠٩) بەو کەسانە دەوترێت دانیشتن و سرەوتیان نییە، هەر لە هات و بردان و ناکەونە سەر زەوی.
(١٠١٠) واتە بە هەڵە پاس دەکات و دەکەوێتە هەڵەوە.
(١٠١١) هیچ توانج و تانونێکی بە لاوە گرنگ نییە و کاری تێ ناکات.
(١٠١٢) واتە زۆر بلێ و چەقە چەقکەرە و خەڵکیی لێی بێزارە.
(١٠١٣) واتە وریا و بزێو و زۆرزانە و بە کەس هەڵنایەت.
(١٠١٤) واتە کەسێکی بلیمەت و زیرەك فێری هەموو شتێکی کردووە.

دەڵێیت سەخسە پەرۆیە.[1015]
دەڵێیت شەلاقەی شکاوە.[1016]
دەڵێت فاتەی سوورە بانە.[1017]
دەڵێیت کەشکی ئاوە سوورە.[1018]
دەڵێیت کەرە و لە خۆڵەمێشدا گەوزاوە.[1019]
دەڵێیت کەری ئاشەوانە.[1020]
دەڵێیت کەڵشێری سەر بارە دارە[1021]
دەڵێیت کەڵشێری ناوەختە.[1022]
دەڵێیت کتکە نەوتینەیە.[1023]

---

(١٠١٥) واتە هەموو جۆرە جلێکی کردووە بەسەر یەکدا و هەڵشڵەپاوە پێی.
(١٠١٦) واتە لە رۆیشتندا هاوسەنگ نییە و جوان ناڕوات.
(١٠١٧) بە کچێك دەوترێت بە هەموو ماڵ و سەربانێکەوە بێت و هار و بزێو بێت.
(١٠١٨) واتە نە بە قسەی کەس دەکات و نە لە دەست کەس دایە.
(١٠١٩) بە کەسێك دەوترێت کە خاوێنیی و ڕێکپۆشی خستۆتە لاوە.
(١٠٢٠) بە کەسێك دەوترێت گرنگی نەدا بێت بە ڕووکەشیی.
(١٠٢١) بە کەسێك دەوترێت خۆی ڕاتەکێنێت و خۆی دەرخات بە ئازایەتی بەڵام ناتوانێت و ئەوە نییە
(١٠٢٢) بەو کەسانە دەوترێت بە میوانیی لە ناوەختدا هەڵدەکوتنە سە ماڵان.
(١٠٢٣) بە کەسێك دەوترێت زۆر چڵکن و پیس بێتن کەس هاوڕێیەتی نەکات لەبەر بۆگەن.

دەڵێیت کەندووی بەتاڵە.[١٠٢٤]
دەڵێیت کەندووی نەزان کردووە.[١٠٢٥]
دەڵێیت کورتانەکەی جەجاڵە.[١٠٢٦]
دەڵێیت کوردی دۆ نەدیوە، پف لە دۆ ناکات.[١٠٢٧]
دەڵێیت کوردی بە دۆ مردەیە.[١٠٢٨]
دەڵێیت کوپەی سەر و بنە.[١٠٢٩]
دەڵێیت گۆشتی قازی خواردووە.[١٠٣٠]
دەڵێیت گۆمی مەنگە.[١٠٣١]
دەڵێیت گوو گێژی کردووە.[١٠٣٢]
دەڵێیت گوێزە باری نییە.[١٠٣٣]

---

(١٠٢٤) بە یەکێك دەوترێت بە قەوارە و باڵا بەرز و زل بێت بەڵام هەرچی هونەر بێت تیایدا شك نەبرێت.
(١٠٢٥) بە کەسێك دەوترێت هەرچی جوانیی بێت تیایدا بە دی ناکرێت.
(١٠٢٦) واتە هەر دروست دەکرێت و هەڵدەوەشێتەوە.
(١٠٢٧) واتە هەڵدەکوتێتە سەر هەر شتێك بیخوات، خواردنی ئەو نییە و نازانێت بیخوات.
(١٠٢٨) بە کەسێك دەوترێت کە دەم دەژەنێتە خواردنێکەوە تا خۆی بە هیلاك دەبات.
(١٠٢٩) بە کەسێك دەوترێت لە کورتیی و قەڵەویدا شێوا بێت.
(١٠٣٠) واتە بە دەنگی بەرز قسە دەکات و برینەوەی نییە.
(١٠٣١) واتە ئەو کەسە ئەوەندە مەنگە کەس قسەی لێ نابیستێت.
(١٠٣٢) واتە کەسێکی ورە و ئاگای لە کەس نییە.
(١٠٣٣) واتە جێگای متمانە نییە بۆ کەس.

دەڵێیت گوێزی بۆ دەژمێرن.[١٠٣٤]
دەڵێیت گوێزی ناو بێژنگە.[١٠٣٥]
دەڵێیت گوێزی ناو دەغیلەیە.[١٠٣٦]
دەڵێیت گیسکە ناو دێیە.[١٠٣٧]
دەڵێین گیسکی سەلەمە.[١٠٣٨]
دەڵێیت ماسییە بە دەست ناگیرێت.[١٠٣٩]
دەڵێیت ماستی مەییوە.[١٠٤٠]
دەڵێیت مارە پێچی خواردووە.[١٠٤١]
دەڵێیت مردن بۆ ئەو نییە.[١٠٤٢]
دەڵێیت مراوییە ئاو ناگرێتە خۆی.[١٠٤٣]

---

(١٠٣٤) بە کەسێك دەوترێت چەند ئامۆژگاریی بکرێت گوێ ناگرێت.
(١٠٣٥) بە کەسێك دەوترێت سرەوت و دانیشتنی بۆ نییە.
(١٠٣٦) کەسێکی ڕاڕایە و باری نییە و جێگیر نابێت.
(١٠٣٧) بە کەسێك دەوترێت لە وەخت و ناوەختە بە حەوشە و بان و دەرگای هەموو کەسێکە.
(١٠٣٨) بەو گیسکە لەڕە دەوترێت کە پارە نەکات.
(١٠٣٩) واتە زۆر جەربەزەیە بە فێڵیش ناگیرێت.
(١٠٤٠) بە کەسێك دەوترێت زۆر بێ جووڵە و بێدەنگ و باس بێت.
(١٠٤١) واتە خۆبەخۆیی خۆی خۆی دەپارێزێت.
(١٠٤٢) بە کەسێك دەوترێت هەموو شتێك بۆ خۆشی خۆی دەکات، گوێ ناداتە بەرژەوەندیی هیچ کەسێك وا دەزانێت نامرێت.
(١٠٤٣) بە کەسێك دەوترێت هەموو دنیا قسەی پێبڵێن بە خەیاڵیدا نایەت.

دەڵێیت میچی قومارخانەیە.[1044]

دەڵێیت میشێك میوانی نییە.[1045]

دەڵێیت میزە پشیلە دراوە لە بەری پێی.[1046]

دەڵێیت موویان بۆ هەڵکروزاندووە.[1047]

دەڵێیت نانی هاریی گرتووە بە دەمەوە.[1048]

دەڵێیت نانی بەسەر ساجا سووتاوە.[1049]

دەڵێیت نازداری قازی بە نییە.[1050]

دەڵێیت نە بای دیوە، نە باران.[1051]

دەڵێیت نە نان دەخوات نە ئاو.[1052]

---

(١٠٤٤) واتە بە دەست هەموو قومارچییەکەوەیە عەقڵی هەموویانی مەشغوڵ کردووە.

(١٠٤٥) بە کەسێك دەوترێت هەموو دنیا سەرزەنشتی بکات بە خەیاڵیدا نایەت.

(١٠٤٦) بە کەسێك دەوترێت کە زۆر هاتوچۆ بکات و وەستانی نەبێت.

(١٠٤٧) بە کەسێك دەوترێت لە ناوەختدا زوو بگاتە ئەو شوێنە.

(١٠٤٨) بە کەسێك دەوترێت سەری لە خۆی شێواند بێت و خۆی تووشی کۆسپێك بکات.

(١٠٤٩) بە کەسێك دەوترێت پەلە لە کارێکدا بکات و وابزانێت دواکەوتووە، یان قەت بەو ئاواتە ناگات.

(١٠٥٠) بە کەسێك دەوترێت بە نەزری زیارەتی سەر مەشایخ قازی بەنێ بووبێت لە دایکن هەموو کەس بە نازداری مامەڵەی بکات.

(١٠٥١) بە کەسێك دەوترێت توندوتیژیی زۆر لەگەڵ کراوە، هەر بە خۆی نازانێت.

(١٠٥٢) واتە کەسێکی لاواز و بێ هێز و سیسەڵەیە.

دەڵێیت نیسکە هەڵدەچێت.[1053]
دەڵێیت نیسکە پەرو پشتی بۆ نییە.[1054]
دەڵێم نێرە، دەڵێت بیدۆشە.[1055]
دەڵێیت ورچی یاری نەکەرە.[1056]

---

(١٠٥٣) بەو کەسانە دەوترێت زۆر دەمارگیر و توڕەن، لە هیچ کتوپڕ تووڕە دەبن.
(١٠٥٤) واتە مرۆڤێکی دووڕوو دووزمانە پشتی کردە هەر کەسێك خراپ باسی دەکات.
(١٠٥٥) بە کەسێك دەوترێت نایەوێت قەت تێ بگات و هەر لەسەر قسەی خۆیەتی.
(١٠٥٦) واتە هەر چۆنێك خۆی دەرخات لێنەهاتووە.

## پیتی (ڕ)

**ڕازیانە فرۆشە و منداڵەکەی بە سك ئێشە دەمرێت.**(١٠٥٧)
**ڕازت لای یەکێك، پرست لای هەزار.**(١٠٥٨)
**ڕازیم بە قەزای خوا.**(١٠٥٩)
**ڕزقی سوارە و ماڵی بارە.**(١٠٦٠)
**ڕاستیی ڕەوتی، چەوتیی کەوتی.**(١٠٦١)
**ڕاستیی یان لە شێت یان لە منداڵ وەرگرە.**(١٠٦٢)
**ڕاستیی گرانە، درۆ هەرزانە.**(١٠٦٣)

---

(١٠٥٧) بە کەسێك دەوترێت بیر لە ژیانی هەموو کەس دەکاتەوە و سوودمەندە تەنها بە کەڵکی ماڵ و منداڵی خۆی نایەت.
(١٠٥٨) نەهێنیی دڵت هەڵمەڕێژە لای هیچ کەسێك بەڵام ڕاوێژ و پرست بخەرە بەردەستی مرۆڤی دانا.
(١٠٥٩) واتە هەرچی خوا خستبیەتە نەسیبم و چارەنووسم ڕازیم.
(١٠٦٠) بە کەسێك دەوترێت لە ڕەنج و هەوڵ و کاروکاسبی کەم دەستگیر بکات. ماڵی هەر بە کۆڵیەوە بێت و جێگیر نەبێت.
(١٠٦١) مرۆڤی ڕاست خوا هەر ڕاستیی و باشیی دەهێنێتە ڕێ و سەرکەوتوو دەبێت مرۆڤی چەوت و خوار هەر خوار و خراپ دێتە ڕێی.
(١٠٦٢) واتە شێت و منداڵ درۆزن نین و درۆ نۆ کەس ناکەن.
(١٠٦٣) قسە ڕاست و قسەی ڕاست نرخ و بەهای خۆی هەیە بە قەد خاوەنەکەی بەنرخ و گرانە بەڵام درۆ و درۆزن بێ بەهان.

**ڕاستییەکەی وەك گۆچان وایە.(١٠٦٤)**
**ڕاست بە و بەلای شێردا برۆ.(١٠٦٥)**
**ڕاستیی لە مەزەبیا نییە.(١٠٦٦)**
**ڕاست و چەپی خۆی لێك ناکاتەوە.(١٠٦٧)**
**ڕاستیی ڕەحمەتی خوایە.(١٠٦٨)**
**ڕاگرتنی زۆردار، زوڵمە لە هەژار.(١٠٦٩)**
**ڕاو و ڕێویم بۆ مەهێنەرەوە.(١٠٧٠)**
**ڕەشە وەك گلۆڵە موو، دەوڵەتی باوك دەیدا بە شوو.(١٠٧١)**
**ڕەش و ڕووت و بێ دراو، لە زستانا بێ کڵاو.(١٠٧٢)**
**ڕەش، هەر ڕەشە.(١٠٧٣)**

---

(١٠٦٤) بە کەسێك دەوترێت کردەوەی چاك و وشەی ڕاستی لادەست ناکەوێ.
(١٠٦٥) مرۆڤی ڕاست و ڕاستگۆ لە کەس ناترسێت.
(١٠٦٦) واتە ڕاستیی لە کار و کردەوە و هزریدا نییە.
(١٠٦٧) بە کەسێك دەوترێت یان ئەوەندە هەژار عەقڵە یان زۆر گێل و گەمژەیە.
(١٠٦٨) واتە هەموو جۆرە ڕاستییەك لە گەورەیی یەزدانەوەیە.
(١٠٦٩) واتە ڕێزگرتن و حورمەتگرتن و خزمەتکردنی پیاوی زۆردار زوڵمە لە زۆرلێکراو و هەژار دەکرێت.
(١٠٧٠) واتە پێویست ناکات فێڵباز و تاوانبار پاساو بهێنێتەوە.
(١٠٧١) کەوابێت دەوڵەتی باوك زۆر شت جوان دەکات و بار ڕاست دەکاتەوە.
(١٠٧٢) کەوابێت مرۆڤی هەژار و بێ پارە زیاتر لە زستاندا ڕووتیی و بێ بەرگیی پێوە دیارە.
(١٠٧٣) واتە پیاو خراپ هەر پیاو خراپە، چاوەڕوانی چاکیی و باشیی لێ مەکە.

ڕەشراهات بە نان خورا و بە ئاو چوو.(١٠٧٤)
ڕەشە وەك تاوە، دەخوازرێت لە باوە.(١٠٧٥)
ڕەحم بە بەچكە مار ناكرێت.(١٠٧٦)
ڕەحمەت لە كفن دزی پێشوو.(١٠٧٧)
ڕەمەزانە مەرگی ژنانە.(١٠٧٨)
ڕەنج بە با چوو بۆ دەریا چوو.(١٠٧٩)
ڕەنج پەیژەی سەركەوتنە.(١٠٨٠)
ڕەنج و گەنجیان وتووە.(١٠٨١)

---

(١٠٧٤) بە كەسێك دەوترێت زۆر لێهاتوو بێت و لە دزیدا، بە چاوتروكاندنێك كاری خۆی بكات.
(١٠٧٥) بە كچێك دەوترێت هیچ خەسڵەتێكی جوان و باشی نەبێت، بەڵام كە دەڵێن كچی فلانە عیلم دەوەستێت لە ئاستی ئەم كارەدا.
(١٠٧٦) واتە كوری پیاوێكی زاڵم و بزێو و زۆردار چاوەڕوانی چی لێ دەكرێت.
(١٠٧٧) كەواتە كەسان و فەرمانبەرانی پێشووتر چاكتر بوون وەك لە تازە هاتووەكان.
(١٠٧٨) واتە لە ڕەمەزاندا ئەركی زۆر زیاترە وەك لە پیاو.
(١٠٧٩) واتە ئەو ڕەنجەی كەسێك داوێتی نایەتەوە، دەستی بە ڕۆخی دەریادا چوویێتە خوارەوە.
(١٠٨٠) ئەوەی ڕەنجی حەڵاڵ بدات هەر ڕوو لە سەركەوتنە تا دەگاتە لووتكە.
(١٠٨١) كەوابێت تا گەنجیت و توانای هزریی و جەستەییت هەیە ڕەنج بدە.

ڕەنجی بوو بە ڕەنجی بە فەرهاد[1082]

ڕەورەوەی مێژوو ناگەڕێتەوە[1083]

ڕم لە کەوان دەرچوو ناگەڕێتەوە[1084]

زستان دەڵێت: ڕۆژێکم مابێت لە بارا، کلکی بزن دەکەم بە دارا[1085]

ڕۆژان ڕۆژی لە دوایە...؟[1086]

ڕۆژ دەڕوات و قەزا ناڕوات[1087]

ڕۆژ بووە بە ساڵ، ساڵ بووە بە جەواڵ[1088]

ڕۆژ بە پەنجەی دەست دەژمێرێت[1089]

ڕۆژ دیار بێت پەنجەی ناوێت[1090]

---

(١٠٨٢) واتە هەموو ڕەنج و هیلاکییەکەی بە خۆڕایی لە دەست دەرچوو.

(١٠٨٣) کەوابێت چەرخی زەمان دەسووڕێتەوە بەرەو پێشەوە و ناگەڕێتەوە بۆ دوواوە فریا بکەوە لە سەرەتای ژیانتەوە با پەشیمان نەبیتەوە.

(١٠٨٤) واتە قسە لە دەم دەرچێت ناگەڕێتەوە.

(١٠٨٥) واتە هەموو کەسێك تا دەمرێت دەیەوێت لووتی ناحەزەکەی بشکێنێت، واتە زستان بە شەوێك و پیریش بە تەوێك.

(١٠٨٦) پێویستە مرۆڤ زیادەڕۆیی نەکات، لە هەموو شتێکدا سەیری بەردەمیشی بکات، ڕۆژان هەمووی بە خۆشی و باشی ناڕوات.

(١٠٨٧) یەزدانی گەورە چی لە ناوچاوانمان نووسی بێت دەبێت ببینین.

(١٠٨٨) کەسێك دەیڵێت ئەوەندە خەم و پەژارەی زۆرە ڕۆژێکی بە ساڵێك لێ دەڕوات.

(١٠٨٩) واتە چاوەڕوانی شتێکی گرنگ دەکات و زۆر زوو پێی بگات.

(١٠٩٠) بە شتێکی ڕوون و گەورە و ئاشکرا دەوترێت، کەس نەتوانێت چەنگ و چوونی لەسەر بکات.

**ڕۆژی نەفسی نەفسییە، کەس ئاگای لە کەس نییە.[(١٠٩١)]**
**ڕۆیشتنی دەڵێیت ڕەوتی کەوە.[(١٠٩٢)]**
**ڕۆستەم نێر بوو یا مێ...؟[(١٠٩٣)]**
**ڕۆنی خۆم دەداتەوە لە سمێڵم.[(١٠٩٤)]**
**ڕۆن زۆر بوو لە خۆی دەسوێت.[(١٠٩٥)]**
**ڕۆن لە پیاو بکرە و گەنم لە ژن.[(١٠٩٦)]**
**ڕۆڵە لەبەر دایك هەڵدەگرێت.[(١٠٩٧)]**
**ڕووی ڕەش بێت یاران، منی خستە مەنەی منداڵان.[(١٠٩٨)]**

---

(١٠٩١) واتە هەموو کەسێك دەست بۆ دەمی خۆی دەبات و کۆشی خۆی پڕ دەکات. هەموو کەسێکیشی خستۆتە لاوە.
(١٠٩٢) بەجوانێك دەوترێت سنگی لە پێش بێت و گەردن بەرز بکاتەوە.
(١٠٩٣) دەگێڕنەوە باسی پاڵەوانێتیی ڕۆستەم کراوە بۆ زەلامێك تا کۆتایی چیرۆکەکە لە دوایدا ئەوەی گوێی لە چیرۆکەکە گرتبوو (پرسیی ڕۆستەم نێر بوو یان مێ)
(١٠٩٤) واتە ڕەنجی خۆم دەرخواردی خۆم دەداتەوە.
(١٠٩٥) واتە ئەگەر شت زۆر بێت، بە ئارەقەی ناوچەوان دەستت نەکەوتبێت قەدری نازانیت.
(١٠٩٦) ژن زۆر ورد و کارامەیە بۆ پوختەکردنی گەنم و نانکردنی جوان، بەڵام ڕۆن ئەو ئەرکەی نییە.
(١٠٩٧) ئەوەندە جەربەزە و چاو نەترس و بێ شەرمە و دزە.
(١٠٩٨) واتە دۆست و یار و مێرد کارێکی باش ناکەن یەکتر بخەنە ژێر منەتی منداڵان.

**ڕووناکیی مۆمێك بۆ تاریکیی شەو زۆرە.**(١٠٩٩)

**ڕووناکیی مانگە شەو سەر لە ئێوارە دیارە.**(١١٠٠)

**ڕووناکیی مانگی چواردە ئیشارەتی ناوێت.**(١١٠١)

**ڕووناکیی لە ڕوویدا نییە.**(١١٠٢)

**ڕووی ڕۆژ بە بێژنگ ناگیرێت.**(١١٠٣)

**ڕووی زەمانە ڕەش بێت.**(١١٠٤)

**ڕووی نەبوونی ڕەش بێت.**(١١٠٥)

**ڕێ باریکە و شەو تاریکە.**(١١٠٦)

---

(١٠٩٩) واتە ڕووناکییەکی کەم بۆ ڕێ دەرکردن و کەس ناسین زۆرە بۆ شەو لە تاریکیی ڕزگارت بێت و لە تەنگانە دەرچێت.

(١١٠٠) چاکیی و خراپیی هەموو کەسێك لە سەرەتای هاوڕێیەتی و یەکتر ناسینەوە دیارە.

(١١٠١) هەموو شتێکی ڕوون و ئاشکرا پێویست ناکات دەستی بۆ ڕابکێشیت.

(١١٠٢) واتە شەڕ لە ڕووی دەبارێت.

(١١٠٣) ڕاستیی و ڕووناکیی بە پڕوپاگەندە و درۆ ناپۆشرێت.

(١١٠٤) کەسێك دەیڵێت کە خۆی بە مەغدوور بزانێت و باشتری بۆ ژیانی خۆی ڕادەبینێ.

(١١٠٥) واتە ئەگەر نەبوونی نەبووایە ئاوات و ئامانجی زۆر کەس دەهاتە دی.

(١١٠٦) ئەمە کەسێك دەیڵێت توانای نەبێت و دەستی کورت بێت و ڕێگری زۆر بێت نەتوانێت کارەکەی مەیسەر بکات.

ڕێگای تەنگانە کورتە.(١١٠٧)
ڕێڕەوی ئایین بگریت، ڕێ لە خراپە دەگریت.(١١٠٨)
ڕێبوار دەڕوات، سەگ دەوەڕێت.(١١٠٩)
ڕێوی بە فێڵ ناوەستێ، مەگەر تەڵە بیبەستێ.(١١١٠)
ڕێوی بە پیریەوە هاتووە.(١١١١)
ڕێوی دەمی نەدەگەیشتە ترێ، دەیوت ترشە.(١١١٢)
ڕێوی دەرەوە و شێری ماڵەوە.(١١١٣)
ڕێوی فێڵی خۆی دەکات، مریشك باوکەڕۆ دەکات.(١١١٤)

---

(١١٠٧) واتە کەسێك ئارامگر بێت شت لە خۆی زل نەکات، تەنگانە زۆر زوو کۆتایی دێت.

(١١٠٨) ئایین و ڕێنمایی و بەرنامەی خوا و پێغەمبەرانە، هەموو کەس دوور دەخاتەوە لە خراپەکاریی.

(١١٠٩) واتە بێ ئەوەی تۆ خەتا و تاوان و گوناهێکت هەبێت کەسانی خراپ لە خۆڕایی قسەی ناجایزت پێ دەڵێن.

(١١١٠) واتە کەسێك زۆر فێڵباز و کەڵەکچی بێت فێڵی لێ ناکرێت، مەگەر خوا خۆی تووشی شتێکی بکات.

(١١١١) لە کوردەواریدا کاتی ژن خواستن و یا شووکردن ئەمە دەوترێت.

(١١١٢) بە یەکێك دەوترێت بە دڵ و بە گیان حەزی لە شتێك بێت بەڵام بۆی نارەخسێت، دوایی دەڵێت خۆم نەمویست.

(١١١٣) بەو کەسانە دەوترێت لە ماڵەوە زۆر شەڕانیی و بوێرن لە دەرەوە لەناو خەڵکدا زۆر ترسنۆك و نەوێرن.

(١١١٤) ڕێوی لە فێڵی خۆی ناوەستێ، ئەگەر برایەتیش ببەستێ.

**ڕێوی نەدەچووو بە کونەوە، هەژگێکیشی دەبەست بە گونەوە.**(١١١٥)
**ڕێوی لە کونی خۆی هەڵگەڕێتەوە گەڕ دەبێت.**(١١١٦)
**ڕێویە و لە بەرگی شێردا.**(١١١٧)
**ڕێوی کێ شاهێدتە... ؟ کلکم.**(١١١٨)
**ڕیسەکەمان بووەوە بە خوری.**(١١١٩)
**ڕیش نەبێت بە تووشەوە، کە بوو! دەبێت شانەی بۆ هەڵگریت.**(١١٢٠)

---

(١١١٥) بەو کەسانە دەوترێت جێی خۆیان ناکرێتەوە، خەڵکیی دیکەش ڕادەکێشن بەدوای خۆیاندا.
(١١١٦) بە کەسێك دەوترێت لە خێزان و هۆز و نەتەوەی خۆی و گەورەی خۆی هەڵگەڕێتەوە و لابدات، بێگانەلە قەدر و حورمەت و ڕێزدا سەیری بکەن.
(١١١٧) واتە کەسێکی ترسنۆك و بێ توانایە بە فێڵ خۆی ئازا و بەغیرەت دەردەخات.
(١١١٨) واتە کەس نابێتە شاهێدی ناحەق، ڕێوی ناچارە بڵێت کلکم.
(١١١٩) واتە کارەکەمان سەری نەگرت و هەڵوەشایەوە.
(١١٢٠) واتە بەبێ حەز و ئارەزووی خۆت شتێکت بوو بە تووشەوە دەبێت ئارام بیت و بگو نجێیت لەگەڵیدا.

# پیتی (ز)

**زارت پڕ بێت لە خوێن، لای کەس ڕۆی مەکە.**[1121]
**زاخاوی چاوی دایەوە.**[1122]
**زاڵم ئەمر نەکات.**[1123]
**زاڵم زەواڵی بۆ دەبێت.**[1124]
**زەرەر لە نیوەی بگەڕێتەوە، هەر باشە.**[1125]
**زەردە لوو بۆ گەروو.**[1126]
**زەرینی هاتووە.**[1127]
**زەمانە چەکوش نەدا بەسەردا، بەرگی تەسلیمی ناکرێت بە بەردا.**[1128]

(١١٢١) بە کەسانێك دەوترێت قسە و شتی نەهێنیی و شاراوەی خۆیان لای کەس نەدرکێنن و باسی نەکەن.
(١١٢٢) واتە تەماشای نامەحرەم دەکات.
(١١٢٣) ئەمە وتوویژێکی ڕێزدارییە لە نێوان دوو کەسدا.
(١١٢٤) واتە کەسی زۆردار خوا لە خۆی زۆردارتری بۆ دەنێرێت.
(١١٢٥) کەواتە هەر کەسێك تووشی زەرەرێك بوو کەم زەرەر بکات، نەك زەرەرمەندی تەواوەتی بێت.
(١١٢٦) بەو کەسانە دەوترێت بیری دوا ڕۆژیان نییە و پاشەکەوت ناکەن.
(١١٢٧) واتە خۆی لێ گۆڕاوە و هار بووە.
(١١٢٨) کەوابێت ئەزموونی ژیان و گوشاری ڕۆژ و زەمان مرۆڤ دروست دەکات.

زەمان هەندێك كەسی گۆڕیوە و هەندێكیشی هاڕیوە.(١١٢٩)
زستان بە شەوێ، پیران بە تەوێ.(١١٣٠)
زستان هات، هەتیو مەیلی هەتاو دەكات.(١١٣١)
زستان بە شركە و هاوین بە روونكە.(١١٣٢)
زستان بە باران بڕۆ، بەهار بە هەور مەڕۆ.(١١٣٣)
زستانان پینەوپەڕۆ، هاوینان ورد ورد بڕۆ.(١١٣٤)
زلەی ڕۆژگاری نەدیوە.(١١٣٥)
زمان درێژ بێت دەستت كورت دەبێت، كە خۆت هەڵكێشا گوێت لە

---

(١١٢٩) ڕۆژگار و زەمان هەندێك كەس بە پلە و پایە و بوون بەرز دەكاتەوە، هەندێكیش مەحف دەكاتەوە و دەیهاڕێت.
(١١٣٠) زستان بە شەوێك تێمان دەگەیەنێت سەرماكەی چەندە كاریگەرە و مرۆڤی پیریش بەرگەی تایەك ناگرێت.
(١١٣١) ئەوە دەگەیەنێت هەتیوو لە بێ بەرگی و برسێتیی و سەرمادا مەیلی گەرمیی بەر هەتاو دەكات.
(١١٣٢) واتە لە زستاندا بەهۆی هەور و قوڕ و باران و بەفرەوە، كەس كەس نابینێت و جلی تازە خەسار دەبێت، بەڵام جلی جوان و تازە بۆ ناو خەڵكیی جوانە و بۆ سەر جادە و ماڵان لە وەرزی هاویندا.
(١١٣٣) ئەمە حیكمەتێكە كە بارانی زستان نەرم و هێواش لە سەرخۆیە، بەڵام بەهار هەور و بروسكە و لافاو خێرا دەهێنێت.
(١١٣٤) واتە جلە كۆنەكانت بۆ زستان بەكاربهێنە، بە جلی تازەوە هاوینان خۆت دەربخە و بڕۆرە دەرەوە.
(١١٣٥) واتە ژیان سەختە ڕۆژگار بە گاڵتە ناگیرێت، دەبێت قۆڵی مەردانەی لێ هەڵكەیت بۆ ئەوەی بەجێ نەمێنیت لە كاروان.

**جرت دەبێت.**[1136]

**زمان ئامان.**[1137]

**زمان بوەستێت سەر سەلامەتە.**[1138]

**زمانی تەتەلە دەکات.**[1139]

**زمانی تەڕ و پاراوە، لە هیچ شتێك دانەماوە.**[1140]

**زمانی دەڵێیت تولە مارە دەیگیرێت.**[1141]

**زمانی براوە و عەقڵی وەستاوە.**[1142]

**زمانی لە دەمدا نییە.**[1143]

**زمانی شیرین لە بەهەشتەوە هاتووە.**[1144]

---

(١١٣٦) واتە ئەوانەی خۆهەڵکێش و فشوهوڕ دەکەن، هیچیان لە دەست نایەت و دەبنە گاڵتەچی خەڵکیی.

(١١٣٧) هەموو کەسێك دەبێت بە ئاگا بێت و بزانێت چی دەڵێت.

(١١٣٨) واتە ئەگەر نەزانیت قسە بکەیت، زمان زۆر ئاژاوە و گرفتت بۆ دروست دەکات.

(١١٣٩) واتە دەیەوێت ڕاست بڵێت بەڵام ناوێرێت.

(١١٤٠) بەو کەسانە دەوترێت هەموو جۆرە قسەیەك دەتوانن بکەن، و لە توانایاندایە هەموو کەس ڕازی بکەن.

(١١٤١) واتە خاوەنی قسە و زمانێکە هەموو کەس لێی دەترسێت و خۆی لێ دەپارێزێت.

(١١٤٢) بە کەسێکی ترسنۆك و نەوێر دەوترێت کە خۆی حەپەساو دەردەخات.

(١١٤٣) واتە زۆر سست و هەژار عەقڵە.

(١١٤٤) واتە کەسانی قسەخۆش و شیرین لە دنیادان، بارەگای خۆیان لە بەهەشتدا دامەزراندووە.

زمانی خۆت ئەسپی خۆتە.[١١٤٥]
زوڵمی زاڵم لە ئەستووریدا دەپچڕێت.[١١٤٦]
زورناژەن بۆ خۆی زورنا بژەنێ، مَن گوێی لێ ناگرم عالەم بخەنێ.[١١٤٧]
زۆرە زۆردارم، هەقە هەقدارم.[١١٤٨]
زۆر هات قەواڵە بە تاڵە.[١١٤٩]
زۆر لەِ خۆی رازییە.[١١٥٠]
زۆر بێ و بۆر بێ.[١١٥١]
زۆردار ئاوی سەروژوور دەڕوات.[١١٥٢]

---

(١١٤٥) زمانی مرۆڤ وەك ئەسپێك وایە، چۆنی تاو بدەیت وا دەتخاتە ڕێ.
(١١٤٦) کەواتە تا زۆردار زۆرت بۆبهێنێت ڕق ئەستوورتر دەبیت لە ئاستیدا زووتر خۆت ڕزگار دەکەیت.
(١١٤٧) بە کەسێك دەوترێت بۆ ئارەزووی خۆی هەموو شتێك بکات و گوێ نەداتە دەوروبەری عالەم بێزار بکات.
(١١٤٨) واتە ئەگەر کارێك بە زۆر بە کەسێك بکرێت، دووەم هێزی خۆی زیاتر دەردەخات و ئەگەر مافیشی تێدا بێت بە هەق دەیسەنێت.
(١١٤٩) واتە ئەگەر زۆر هات بۆ کەسێك زوڵمی لێ بکرێت، ئەویش گوێ ناداتە هیچ شتێك بەرگری لە خۆی دەکات.
(١١٥٠) بۆ کەسێکە وا هەست دەکات کە لە وێنەی ئەو دروست نەبووە، خوا هەر ئەوی بە تایبەت دروست کردووە.
(١١٥١) بەشتێك دەوترێت گوێ نەدەنە ڕێژەکەی با زۆر بێت و بەڵام جۆرەکەی باخراپ.
(١١٥٢) واتە زۆردار هیچ بە حەق ناکات و هەموو کارێکی ناپەسەند و شازە.

زۆرداری ئاسانه، بەڵام زۆردار ماڵوێرانه.[1153]
زۆر وتن قورئان خۆشه.[1154]
زۆری پێیه و کەمی دەردەخات.[1155]
زێر له قوریشا دیاره، ژەنگ هەڵناهێنێت.[1156]
زێڕ ناسه.[1157]

---

(١١٥٣) هەموو کەسێك دەتوانێت زۆردار بێت و ستەمکار بێت بەڵام دەبێت بیر له ڕۆژانی ڕەشیی بکاتەوه که چاوەڕوانی دەکات.
(١١٥٤) ئەوەی درێژه به شتێك دەدات و بەرامبەرەکەی دەخلافێنێت و ئەگەر به قورئان سوێند بخوات سنووری بۆ دادەنێت.
(١١٥٥) واته زیرەك و زرنگ و به توانایه، زۆر کەمی دەرخستووه له بلیمەتییەکەی خۆی.
(١١٥٦) واته مرۆڤی چاك هەرچۆنێك بێت کار و جلوبەرگی و پیشەی هەر چاکی پێ دەڵێن ڕووکەشی مەرج نییه بۆ مرۆڤ.
(١١٥٧) به کەسێك دەوترێت مرۆڤی باش و چاك و بەچاکی بناسێت، و بزانێت لەگەڵ کێدا هاوڕێیەتی دەبەستێت.

# پیتی (ژ)

**ژانی پێوە گرتووە.**[1158]
**ژاڵە بۆ وا تاڵی...؟ لەبەر باوك مردن، گوڵت بۆ وا جوانە؟**
**لەبەر دۆست و دوژمن.**[1159]
**ژەم بووردە بووە.**[1160]
**ژن بە بێکەس هار دەبێت، پیاو بە بێکەس هەژار دەبێت.**[1161]
**ژن تا نەزێ بێگانەیە.**[1162]
**ژنت شەریکیی بێت و ماڵت شەریکیی نەبێت.**[1163]
**ژن بێباوەڕ و خۆش باوەڕە.**[1164]

---

(١١٥٨) بە کەسێك دەوترێت گرفتێکی گەورەی هەیە و ژانی پێوە کردووە و ناتوانێت دەریبڕێت.
(١١٥٩) هەموو کچێکی جوان ئەو خواستەی نامێنێت دوای مردنی باوکی بەڵام بە پاکیی و جوانیی دەپارێزرێت بۆ خۆشی دۆست و کوێری چاوی دوژمن.
(١١٦٠) واتە ماوەیەکی زۆر دوورکەوتۆتەوە لەو خواردن و خواست و ئارەزووی خۆی، کاتێك بۆی ڕەخساوە هەراش بووە لەسەری.
(١١٦١) وا دەگەیەنێت ژن نابێت بێکەس و بێ چەتری سەر بژی واتە برا و باوك و مێرد، پیاویش بەبێ کەسوکار وپشت و پەنا هەژارە.
(١١٦٢) واتە نەوەی هەموو ژنێك دەبێتە ڕۆڵە و نەوەی ئەو هۆزەی کە شووی پێکردوون ئینجا دەبێتە خزمی ئەو هۆزە یان ئەو خێزانە.
(١١٦٣) واتە تەماع دۆستایەتی و برایەتی ناهێڵێت.
(١١٦٤) واتە ژن زۆر بێ متمانەیە و جاروباریش زۆر متمانەی بە خۆیەتی.

ژن و ماڵیان وتووه.(١١٦٥)
ژن هەیە ماڵ وێران دەکات، ژن هەیە ماڵ ئاوا دەکات.(١١٦٦)
ژن بدە بە ژن مردە، گا بدە بە گا مردە.(١١٦٧)
ژن کۆڵەکەی ماڵە.(١١٦٨)
ژن هەسانی پیاوە لە خێر و شەڕدا.(١١٦٩)
ژنی نیوەی کۆمەڵە.(١١٧٠)
ژن سەگیش پێی ناوەرێت.(١١٧١)
ژن و فیل لە مشك دەترسن.(١١٧٢)

---

(١١٦٥) کورد وتوویەتی (ژن ئینجا ماڵ) ژنیان پێش ماڵ خستووە.
(١١٦٦) ژنی وا هەیە هۆش و مەیلی نییە بە ماڵەوە، شەیتان دەیبات بە خەیاڵەوە، ژنی ماڵئاوا کەر و کەیبانوی چاك ماڵ دەڕازێنێتەوە و دەیکات بە بە هەشت.
(١١٦٧) واتە ئەو پیاوەی ژنی دەمرێت قەدری ژن دەزانێت، ئەو پیاوەی گامردەیە خزمەتی گایەکەی چاك دەکات.
(١١٦٨) کەوابێت ماڵ هەمووی بە ژن ڕاگیراوە و ڕاوەستاوە.
(١١٦٩) واتە ژن هاندەر و پاڵێوەنەری پیاوە لە هەنگاوی کاری خێر و کاری شەڕدا.
(١١٧٠) بەر پرسیارێتیی ژن لە خێزان و کۆمەڵدا ئەوەندە زۆرە دەتوانین بڵێین لە نیوەش زیاترە.
(١١٧١) ژن بە سروشت نەرم و نیان و هێواشە، توندوتیژیی لەگەڵیدا ستەمە، سەگیش لەگەڵ ژندا هێورە.
(١١٧٢) ژن زۆر ترسنۆك و هەستیارە لەگەڵ مشکدا، فیلیش لەبەر ئەوەی مشك دەچێتە خەرتوومەکەیەوە و بۆی دەرنایەت.

**ژنت بە دەست خەڵکەوە بێت، ماڵت بە دەست خەڵکەوە نەبێت.**(١١٧٣)

**ژنی مرد بۆی راکە، تەڵاقیدا لێی راکە.**(١١٧٤)

**ژنی پیاوی کوێر ئارایشتی ناوێت.**(١١٧٥)

**ژنیش هەیە و ژانیش هەیە.**(١١٧٦)

**ژنێکم دەوێت ژنانە، پێستە بکات بە هەمانە.**(١١٧٧)

**ژیان پێچی مێزەرێکە.**(١١٧٨)

**ژیان لەگەڵ نادان و نەزان ماندوویتییە.**(١١٧٩)

**ژیان بۆ کەس فەرشی سوور نییە.**(١١٨٠)

**ژیان یەکجارە و با خۆش بێت.**(١١٨١)

---

(١١٧٣) ژن بەهەرحاڵ بەرگرییەك لە خۆی دەکات، بەڵام ماڵت کە کەوتە دەست خەڵکیی هەمووی فووی لێ دەکرێت و دەخورێت.

(١١٧٤) واتە پیاوێك ژنی بمرێت زۆر قەدری ژنی دووەم دەزانێت، بەڵام پیاوێك ژن تەڵاق بدات چارەنوسی ژنەکانی دیکەیش هەر خراپ دەبێت.

(١١٧٥) لەبەر ئەوەی پیاوی کوێر رووی ژنەکەی نابینێت.

(١١٧٦) واتە ژنی وا هەیە دەبێتە خۆشیی و ئاوەدانیی، ژنی واش هەیە دەبێتە هۆی ئاژاوە و ماڵوێرانیی.

(١١٧٧) لە کۆندا ئەم قسەیە کراوە، ژن دەبێت کەیبانویەکی لێهاتووی وابێت دەرچوو بێت لە هەموو کارێکدا.

(١١٧٨) واتە ژیان کورتە با هەموو کەس قەدری بزانێت.

(١١٧٩) واتە تەمەن بە خەسار دەچێت لەگەڵ گەمژەڵ و نەزانە.

(١١٨٠) واتە ژیا ن ئەرك و هیلاکیی و کار و کردارە و رێگایەکی تەخت نییە.

(١١٨١) واتە مرۆڤ کە هاتە دونیاوە یەکجار دەژیی با خۆش و رازاوە بێت.

**ژیان بۆ کەس تاسەر نییە.[1182]**
**ژیانی کولەمەرگیی نەبوونی چاکترە.[1183]**
**ژیرە و بە تەگبیرە.[1184]**
**ژیشك دەڵێت: لە بێچووی من نەرم و شلتر نییە...![1185]**

---

(١١٨٢) هەموو کەس دوای ماوەیەك ژیا کۆتایی دێت بە مردن.
(١١٨٣) واتە ئەو کەسەی بە نەبوونی و زەبونییەوە دەژیی مردنی باشترە.
(١١٨٤) واتە هەموو مرۆڤێکی دانا بەبێ تەگبیر و بەرنامە کار ناکات.
(١١٨٥) واتە هەموو کەسێك منداڵی ناشیرین و نەخۆش و هاری خۆی خۆش دەوێت.

## پیتی ( س )

**ساڵ بە ساڵ خۆزگەم بە پار.[1186]**
**ساڵێك منال و ساڵێك مال.[1187]**
**ساڵانمان خایاند، مانگانیش دەخایەنین.[1188]**
**سابوون دەدات لەژێر پێی.[1189]**
**ساغمان بە کۆڵی کەر دەگەڕێت.[1190]**
**سامانت بە گشتیی مەخەرە یەك کەشتی.[1191]**
**سەد بەرتیل، قەرزێك پڕ ناکاتەوە.[1192]**

---

(١١٨٦) لەبەر ئەوەی ساڵی پێشوو گەنجتر و بە تواناتر بووە لە هەموو ڕوویەکەوە.
(١١٨٧) ئەمە بۆ ئەو ژنانەیە کە منداڵی تازەبوویان هەیە زۆر پەیڕەوی ئەو منداڵە بکرێت لە ڕووی بەخێوکردنەوە، لەو ساڵەدا کەمتر گوێ بداتە ماڵ.
(١١٨٨) واتە لە ماوەیەکی دوور و درێژدا زۆر ئارامگر بووین با کەمێکی دیکەش ئارام بگری
(١١٨٩) واتە هەڵیدەخەڵەتێنن و لە گرێژەنەی دەبات.
(١١٩٠) واتە هەمووومان نەخۆش و کەفتەکارن و بێ توانا و داماون.
(١١٩١) واتە تەماع پەلەت پێ نەکات هەرچییەکت هەیە لە دەستت بچێت و بە هەدەر بڕوات.
(١١٩٢) کەسێك قەرزی کرد و قەرزار بوو دەبێت بەپێی ئەو ڕێکەوتنەی بەینی خۆیان سەر ڕاست بێت، بەرتیل جێی قەرز ناگرێت.

**سەد حەکیم بە قەد دەردەدارێك نازانێت.**[١١٩٣]
**سەد کراس بدرە بە پاکیی کراسێك مەدرە بە پیسیی.**[١١٩٤]
**سەد ساڵ بکەیت بێگانە پەرستیی، دوایی دەهێنێت نوشستیی.**[١١٩٥]
**سەد رەحمەت لە کفن دزی پێشوو.**[١١٩٦]
**سەد ڤاکم بە فیکیکی.**[١١٩٧]
**سەد قەزوان بخۆیت، بە گوێزێك پێت دەگەمەوە.**[١١٩٨]
**سەرچاوەکەی لێڵە.**[١١٩٩]
**سەر دەدات و سڕ نادات.**[١٢٠٠]

---

(١١٩٣) لەبەر ئەوەی حەکیمەکە دەردەکە بە خۆیەوە نییە، بەڵام دەردەدارەکە دەزانێت نەخۆشییەکەی چی بووە؟ بە چاك بۆتەوە.
(١١٩٤) واتە لای خەڵکیی پاکیی مرۆڤ و رەوشتی ئاساییە. بەڵام بێڕەوشتیی و داوێن پیسیی نەنگە دەبێتە لەکەی پاشەڵ و لێی نابێتەوە.
(١١٩٥) واتە بێگانە هەرچی چاکەیەکی لەگەڵ بکەیت کاتێك دوورکەوتەوە هیچی تۆ نییە و نایبینیتەوە، بەڵام کەس و خزم لە خۆشی و تەنگانەدا هەر کەستە و بەپیرتەوە دێت.
(١١٩٦) واتە کاربەدەستی پێشوو باشتر و بە ویژدانتر بووە لە دزیی و جەردەیی و ماڵ خواردنی خەڵکیدا وەك لە ئەمەی ئێستا.
(١١٩٧) بە کەسێك دەوترێت ئەوەندە فێڵباز و کەڵەکچی بێت لە وێنەی کەم بێت کەس دەرەقەتی نەیەت.
(١١٩٨) واتە سەد کار و هەوڵ و هیلاکیی هەژارێك بەرامبەر بە یەك هەوڵ و کارێکی دوڵەمەندێکی پارەدارە.
(١١٩٩) بە کەسێك یان کارێك بە خراپیی هاتبێتە پێشەوە دەوترێت.
(١٢٠٠) واتە کەسێکی سڕپۆش و عاقڵە سەری خۆتی پێ بسپێرە.

سەر بە سەر، بێ دەردی سەر.(١٢٠١)
سەر هەڵبڕە، خوا بناسە.(١٢٠٢)
سەر بدەو ڕاز مەدە.(١٢٠٣)
سەر هاتووە بۆ پێ.(١٢٠٤)
سەر بۆ سەرپڕین، نەك بۆ سەرزەنشت.(١٢٠٥)
سەر کزی دڵ وریایە.(١٢٠٦)
سەرچاوەی دڵی ڕوونە.(١٢٠٧)

---

(١٢٠١) لە کوردەواریدا ژن بە ژن باو بووە کە هەر دوو ماڵەکە یان کچ و کوڕەکە هاوسەنگ و بەرامبەر بوون، بەمجۆرە خوازبێنی کراوە.
(١٢٠٢) بە کەسێك دەوترێت زوڵم و تاوانی لەلا ئاسان بێت و بەردەوام بێت.
(١٢٠٣) واتە ڕازی دڵی خۆت بۆ کەس هەڵمەڕێژە، ئەگەر سەریشت لەگەڵ گرفتی خۆتا تیادا بچێت.
(١٢٠٤) لە کۆندا منداڵ درەنگ کەوتۆتە سەر پێ، منداڵەکەیان خستۆتە سەبەتەیەکەوە و بە ماڵاندا گێڕاویانە وتوویانە: (سەر هاتووە بۆ پێ) ماڵەکان بریشکەو و شەکری کڵۆیان کردۆتە کۆشی منداڵەکەوە و وتیان:(خوا پێی بداتێ) یان هەر دوو پەنجە گەورەکەی منداڵەکەیان بە پەتێکی سوور بەستووە و لەناو دەرگای مزگەوتێکدا دایانناوە تا بەگزادەیەك بێت و بۆی بکاتەوە.
(١٢٠٥) واتە مرۆڤ سەری تیاچێت باشترە، نەك سەرزەنشت بکرێت لە ناپەسەندیا.
(١٢٠٦) بە کەسێك دەوترێت لە شێوە و ڕوودا زۆر هێور و کز و کەساس خۆی دەردەخات بەڵام لە ناخەوە زۆر بە ئاگا بێت.
(١٢٠٧) واتە هیوای بە خۆی و ڕۆژگاری ژیانی بە هێزە.

سەرچاوەی دڵی تاریکە.[١٢٠٨]
سەرم نایەشێ و پریسکەی لێ دەبەستم.[١٢٠٩]
سەرتۆپی یەك قوماشن.[١٢١٠]
سەر بدۆزێتە و قسە مەدۆزێتە.[١٢١١]
سەرە واو لە سکیا نییە.[١٢١٢]
سەری خۆی نییە.[١٢١٣]
سەری دنیای بە پووش گرتووە.[١٢١٤]
سەری کڵافەکە ونبووە.[١٢١٥]
سەری بێ دەلاك دەتاشێت.[١٢١٦]

---

(١٢٠٨) واتە هیچ هیوای نییە بە دوارۆژی و داهاتووەکان.
(١٢٠٩) بەو کەسانە دەوترێت هیچ گرفت و تاڵاوێکیان لە ژیاندا نییە،بەڵام بە خوت و خۆڕاییی خۆیان بۆ خۆیانی دروست دەکەن.
(١٢١٠) بە دوو کەس یان دوو کۆمەڵ دەوترێت سروشت و کار و کردەوە و بیرکردنەوەیان بەرەو یەك شت بچێت.
(١٢١١) واتە قسە گەوهەرە و لە ناخی بیری مرۆڤەوە دەردەچێت دەبێت بزانرێت چۆن دەکرێت.
(١٢١٢) بە یەکێك دەوترێت خوێندەوار نەبێت و هیچ زانیارییەکی نەبێت.
(١٢١٣) بە کەسێك دەوترێت بە سروشت شەڕەنگێز و شەڕانیی بێت ببێتە هۆی مردن و لەناوچوون.
(١٢١٤) بە کەسێك دەوترێت گرفتێکی بچووك زل بکات لە خۆی بە هیوای هیچ نەمابێت.
(١٢١٥) بە گرفتێك دەوترێت نەتوانن چارەسەری بۆ بدۆزنەوە.
(١٢١٦) بە کەسێك دەوترێت شارەزای کارێك نییە و وەستایەتییەکەی دەکات.

سەری بێ دەلاك مەتاشە.[١٢١٧]
سەری بێ ڕۆزی لەژێر خاكدایە.[١٢١٨]
سەری بێ سەودا ناوەستێت.[١٢١٩]
سەری ئاشە و بنی ماشە.[١٢٢٠]
سەری دای لە بەرد.[١٢٢١]
سەری زل دەولەتە، پێی زل مەینەتە.[١٢٢٢]
سەری دنیا بە پووش نەگیراوە.[١٢٢٣]
سەری دنیای لێ هاتۆتەوە یەك.[١٢٢٤]

---

(١٢١٧) واتە بە ناشارەزایی هەڵمەستە بە هیچ كارێك.
(١٢١٨) ئەوەی ڕزقی لەسەر زەوی نەماوە خۆی مردووە و لەژێر خاكدایە.
(١٢١٩) كەسێك بیەوێت كار بكات كار زۆرە و دەیدۆزێتەوە، بە دەستی سپی دانانیشێت.
(١٢٢٠) بە كەسێكی سەرلێشێواو دەوترێت نازانێت چی بكات خۆی بگرێتەوە.
(١٢٢١) بە كەسێك دەوترێت هەڵەیەكی گەورە بكات وەكو سەری خۆی كێشا بێت بە بەردێكدا.
(١٢٢٢) ئەم قسەیەیە لە كۆنەوە وتراوەتەوە بەو واتایەی هەر كەس سەری گەورە بوو دەوڵەمەند دەبێت، هەر كەسیش پێی گەورەبوو فەقیر و مەینەتبار دەبێت.
(١٢٢٣) واتە دنیا هێشتا ڕووناكە و پڕ لە خێر و بەرەكەتە.
(١٢٢٤) بە كەسێك دەوترێت هیچ كارێكی پێ مەیسەر ناكرێت و هیچ گرفتێكی پێ شیكار ناكرێت.

**سەری شکاندووە و ریشی بۆ شانە دەکات.**[١٢٢٥]
**سەری دەتاشێت و ئاوێنەکەیشی دەداتە دەست.**[١٢٢٦]
**سەری کوێرەماری لا دەست دەکەوێت.**[١٢٢٧]
**سەری کەر وەرگێرە و نورەی سەیفوڵا ئاغایە.**[١٢٢٨]
**سەری گوریسەکە کورت بوو نەگەیشت بە تۆ.**[١٢٢٩]
**سەری لە گوێ قەبر دەلەرزێت.**[١٢٣٠]
**سەری لێی دەخورێت.**[١٢٣١]
**سەری نایەوە بەو داخەوە.**[١٢٣٢]
**سەرێ بە دەستی خۆت نەیخورێنیت، خوروی ناشکێت.**[١٢٣٣]

---

(١٢٢٥) واتە زەرەرمەندی کردووە و دڵخۆشی دەداتەوە.
(١٢٢٦) واتە کارێکی ناپەسەندی پێ کردووە و جارِیشی لێ داوە بۆ حەیا چوونی.
(١٢٢٧) بە کەسێك دەوترێت هیچ شتێك بە زایە نەدات کارامە و نەخت و پوختە.
(١٢٢٨) بە پیاوێك دەوترێت لە عەقڵدا کەم و لە قەوارەدا نابووت و تەنها وشەی ئاغا و ناونیشانەکەی لە کۆمەڵدا دەری دەخات.
(١٢٢٩) واتە ئەو تەگبیرە کرا نەمان هێشت تۆ بزانیت.
(١٢٣٠) بە کەسێك دەوترێت تەندروستیی و تەمەنی بەسەر چووە و هیچ کارێکی پێ هەڵناسورِێت؟
(١٢٣١) بە کەسێك دەوترێت ئارەزووی کارێك بکات و بێدەنگیی نیشان بدات.
(١٢٣٢) واتە مرد و کەس لەنگەرێکی گرفتەکەی بۆ نەگرت.
(١٢٣٣) واتە هەموو مرۆڤێك خۆی دەرد و کاری خۆی دەزانێت، دەبێت خۆی بە چارەسەرکردنی هەستێت.

**سەرکەوتن ئاسانە، دابەزین گرانە.[١٢٣٤]**
**سەرکەوتن بەختە، کەوتن سەختە.[١٢٣٥]**
**سەفەرە و لەبەرە.[١٢٣٦]**
**سەفەر و مامەڵە سەنگی محەکە.[١٢٣٧]**
**سەروەت میشە لە گوویش دەنیشێت.[١٢٣٨]**
**سەرما و گەرما خوا بە پێی حاڵ دەیدات.[١٢٣٩]**
**سەرم لەبەر هەتاو سپی نەکردووە.[١٢٤٠]**
**سەرێك لەناو سەراندا نەبێت بۆ برین باشە.[١٢٤١]**

---

(١٢٣٤) هەموو کەسێك نیازی سەرکەوتنی هەبێت بیر لە ڕێگایەك دەکاتەوە، بەڵام دابەزین لە لووتکەوە بۆ خوارەوە زۆر گرانە.
(١٢٣٥) واتە سەرکەوتن و پێشکەوتن لە هەموو شتێکدا بەختەوەرییە بەڵام کەوتن ئەوەندە سەختە کەم کەس بەرگەی دەگرێت.
(١٢٣٦) تەنها بە مردن دەوترێت سەفەرە و لەبەرە.
(١٢٣٧) واتە تۆ لە سەفەر و مامەڵەدا شارەزای تەواوی خەڵکیی دەبیت.
(١٢٣٨) واتە ئەوەی ڕەنج بدات و نەیدات و عاقڵ و بێ عاقڵ کە خوا پێی بەخشی ئەیداتێ وەکو لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێت: (یرزق من یشاو).
(١٢٣٩) کەواتە مرۆڤ توانای ئەوەی هەیە لەگەڵ هەموو شتێکدا خۆی بگونجێنێت و خۆی ڕابهێنێت ئایا خواردن بێت یان جلوبەرگ یان سەرما و گەرما.
(١٢٤٠) ئەوەی بژی لە دنیادا بەپێی تەمەنی دەبێتە خاوەنی ئەزموونێك.
(١٢٤١) کە وابێت مرۆڤی گۆشەگیر کە بەشداریی هاوڕێ و هاودەمی خۆی نەکات بۆ مردن باشە یان لە جێی نەبووان دەژمێردرێت.

سەریکی هەیە و هەزار سەودا.[(١٢٤٢)]
سەبر تاڵە و بەری شیرینە.[(١٢٤٣)]
سەگ بە مانگەشەو دەوەڕیت.[(١٢٤٤)]
سەگ بە خاوەنەکەی ناوەڕیت.[(١٢٤٥)]
سەگ بە ژن ناوەڕیت.[(١٢٤٦)]
سەگ بە زەبری کڵکی ئیسقان دەشکێنیت.[(١٢٤٧)]
سەگ نەوەڕیت بۆ کوشتن باشە.[(١٢٤٨)]
سەگ لەبەر ماڵی خاوەنیدا ئازایە.[(١٢٤٩)]

---

(١٢٤٢) بە کەسێك دەوترێت لایەکی پێ ناکرێت خۆی لە چەندەها کاردا هەڵدەقورتێنێت.
(١٢٤٣) بە کەسێك دەوترێت لە ئەنجامی ئارامگرتندا زۆر تاڵاو بچێژێت، بەڵام دووایش زۆر شیرینی بنۆشێت.
(١٢٤٤) ئەمە بە کەسێك دەوترێت داخ لە دڵ بووبێت جنێو بە پیاوی پلەوپایە بەرز بدات و هیچ کاریگەر نەبێت.
(١٢٤٥) بەوانە دەوترێت خاوەن و کەسی باشیان هەیە، هەموو کەس نەرمە لە ئاستیاندا و ڕێزیان لێ دەگرێت لەبەر ئەوەی چاکەیان لە دەست دێت.
(١٢٤٦) واتە ڕێز و حورمەتگرتنی ژن بەلای هەموو کەسێکەوە زۆر پێویستە.هەتا سەگیش پێی ناوەڕێت.
(١٢٤٧) بە کەسێك دەوترێت کە بە پشتی کەسێکی بەهێزتر و بەتواناتر خراپەکاریی بکات.
(١٢٤٨) واتە هەموو کەسێك بە کاری خۆی هەڵنەستێت نەمانی چاکترە.
(١٢٤٩) بە کەسێك دەوترێت تەنها لە یەك مەڵبەندا ئازا بێت.

سەگ کلك و گوێی نەکەیت، باش پاست بۆ ناکات.(١٢٥٠)
سەگ لە سەگ بەردە و تۆ تەماشاکە.(١٢٥١)
سەگ لە قەسابخانە نەمرێت تەمەنی بە خەسار دەچێت.(١٢٥٢)
سەگ لە کولێرە ڕا ناکات.(١٢٥٣)
سەگی لێوە گلاو دەبێت.(١٢٥٤)
سەگی تێر ڕا ناکات.(١٢٥٥)
سەگی هار چڵ شەوی تەمەنە.(١٢٥٦)
سفرەی بەتاڵ بسم اللەی لێ ناکرێت.(١٢٥٧)

---

(١٢٥٠) منداڵ یان سەگ کەمێك ئازاری نەدەیت و برسی نەکەیت بە دەوریدا نایەن واتە زۆر نەدرێت بە دەم هیچ کەسێکەوە تا بتخاتە پشتگوێ.
(١٢٥١) مرۆڤی خراپ بۆ هاوشانی باشە.
(١٢٥٢) واتە هەندێك کەس نازانێت ژیان بۆ خۆی خۆش بکات،حەزی لە مەینەتی و قوڕ بەسەرییە.
(١٢٥٣) واتە ئەگەر مرۆڤ زۆری بۆ نەیەت دەست نانێت بە خێر و خۆشی خۆیەوە و بە جێی بهێڵێت.
(١٢٥٤) بە کەسێك دەوترێت زۆر ڕەفتار ناشیرین و نەفرەتلێکراو بێت.
(١٢٥٥) واتە مرۆڤی تێروپڕ پێویستی بەوە نییە دوای کار و کاسپی بکەوێت.
(١٢٥٦) بە کەسێك دەوترێت کە هەر چی خوا پێی ناخۆشە بیکات، ئەو کەسە هەر بە هیلاکیی و ئازاری ویژدانی خۆی دەمرێت.
(١٢٥٧) کەسێك شتێکی بە دڵ نەبێت و لێی ڕازی نەبێت بۆی ناچێتە پێشەوە.

سفره دری نمەك حەرام.[1258]
سك تیشوو هەڵناگریت.[1259]
سك هەڵدەگوشیت.[1260]
سكە ڕۆ نابیت بە ماڵ.[1261]
سكی سووتاوه.[1262]
سم سمی كەرە و چنگ چنگی هەیاسێ، سەرم لەم كارە دەئاوسێ.[1263]

---

(١٢٥٨) بە كەسێك دەوترێت دوای تێربوون لەسەر سفرەی خەڵك مەمنون نابێت و بە لالووتەوە هەڵدەستێت.
(١٢٥٩) واتە ئەو خواردنەی مرۆڤ دەیخوات هەرس دەبێت و دەڕوات بۆ كاتێكی دیكەی پاشەكەوت ناكات.
(١٢٦٠) بەو كەسانە دەوترێت ڕەنجی خۆیان بە خۆیان ڕا نابینن و تێری لێ ناخۆن.
(١٢٦١) بەو كەسانە دەوترێت هەموو ڕەنجییان بۆ خواردن و ورگیانە بیر لە پاشەكەوت و دووا ڕۆژ ناكەنەوە.
(١٢٦٢) بەو كەسانە دەوترێت سك سووتاون و قرچەی جەرگ سووتاوی منداڵیان لێ كەوتبێت.
(١٢٦٣) ئەمە چیرۆكێكە كە بووكەكە زۆر لە خەسووی دەترسێت، ناوێرێت خواردنی ماڵەكە بخوات، خەسووی سەری كوپەی ترشیاتەكە قوڕ دەدات، بووكەكە بە سواری كەر دەچێتە سەر كوپەكە و ترشیاتەكە دەردەهێنێت، خەسوو سەیر دەكات جێی سمی كەر دیارە لە ئەرزە، بەڵام پەنجە هەیاسی بووكیەتی لەسەر قوڕی كوپەكە.

**سنگی فراوانە.**[١٢٦٤]
**سواربوون عەیبێك و دابەزین دوو عەیب.**[١٢٦٥]
**سوارِ تا نەگلێت نابێت بە سوار.**[١٢٦٦]
**سوالکەر تورەکەی پڕە و خەجاڵەتە.**[١٢٦٧]
**سوێند دوو جەسەری هەیە.**[١٢٦٨]
**سوێند بە سەری یەکتر دەخۆن.**[١٢٦٩]
**سووك بڕۆ و سەلامەت وەرەوە.**[١٢٧٠]
**سڕی خۆم و تڕی خۆم.**[١٢٧١]

---

(١٢٦٤) بەو کەسانە دەوترێت خۆشنوود و خۆشمەندن، لێخۆشبوونیش لایان ئاسانە.

(١٢٦٥) واتە ئەگەر دەست بدەیتە کارێك و ژووان ببەستیت لەگەڵ کەسێکدا، پەشیمانیی لەکەدارت دەکات.

(١٢٦٦) هەموو کەسێك تا قاڵ دەبێت و شارەزایی دەیگەیەنێتە ڕادەی وەستایی دەبێت چەند جارێك بکەوێت و هەستێتەوە.

(١٢٦٧) واتە هەموو دەستپانکردنەوەیەك بۆ بەدەستهێنانی پارە بەبێ ڕەنج و هیلاکیی و ئارەقڕشتن، خەجاڵەتیی و ڕیسواییە.

(١٢٦٨) یەکەمیان بە حەق و ناحەق، دووەمیان بۆ ڕازیکردنی کەسێك کە دڵی پاك بکەیتەوە.

(١٢٦٩) بە دوو کەس دەوترێت هاوڕێیەتی و دۆستایەتی و کەسایەتی و خۆشەویستیان زۆر بێت بۆ یەکتر.

(١٢٧٠) واتە باجی پەلەکردن و کەوتنە سەلامەتیت لە هێواشیدایە.

(١٢٧١) واتە بە بەشی خۆم ڕازیم ئەگەر کەمیش بێت، بەو شەرتەی کەس نەیەتە ژیانمەوە.

سەیری خوار خۆت بکە.[١٢٧٢]
سیروان لێشت نەدەم هەر دەمبەیت.[١٢٧٣]
سیر مەدە لە سمێڵم.[١٢٧٤]
سیر و مار ناگونجێن.[١٢٧٥]
سێ و دووی لێ مەکە.[١٢٧٦]
سێبەری بەردان، وەفای مێردان.[١٢٧٧]

---

(١٢٧٢) هەموو مرۆڤێك لە رادەیەکی بوون و نەبووندا وەستاوە، با سەیری خوار خۆی بکات، نەوەکو نەگاتە سەروو خۆی.
(١٢٧٣) کەواتە کەسێك بیەوێت زەرەرم لێ بدات دوور بێت و نزیك بێت و ئەو کاری خۆی هەر دەکات، یان داواکردنی شتێك لە کەسێکی ڕەزیل.
(١٢٧٤) واتە مەمخەڵەتێنە و پاڵم پێوەمەنێ بۆ هەڵە.
(١٢٧٥) واتە دوو شت بە ڕەگەز و بە جۆر و بە سروشت جیا بێت پێویست ناکات لە یەك شوێنا بن.
(١٢٧٦) واتە ئەو کارە باشە و بیکە و لێی مەوەستە.
(١٢٧٧) کەواتە وەفای مێردی بەراورد کردووە بە سێبەری بەردێك کە هەتا هەتاو بمێنێت.

# پیتی ( ش )

**شا ڕێی دەکەوێتە گەدا، گەدا ڕێی دەکەوێتە شا.[١٢٧٨]**
**شاباشی خۆم دەدەم و قنج هەڵدەپەڕم.[١٢٧٩]**
**شا بێ شالیار نابێت.[١٢٨٠]**
**شا بە سەپان نازانێت.[١٢٨١]**
**شاخی لێ ڕواوە.[١٢٨٢]**
**شاخێك ڕووخا، کەندەڵانێکی پڕ کردەوە.[١٢٨٣]**
**شاد مەبە بە بوونی، شاد بە ژینی.[١٢٨٤]**

---

(١٢٧٨) واتە مرۆڤ چەند گەورە بێت پێویستی بە بچووك دەبێت، هەروەها بچووکیش کاری بە گەورە هەڵدەسووڕێت.
(١٢٧٩) واتە نامەوێت و نابێت مافی هیچ کەس بە لای مندا بێت بە حەقی خۆم کاری خۆم بە ڕێ دەکەم.
(١٢٨٠) واتە هیچ کارێك بەبێ تەگبیری گەورە سەرکەوتوو نابێت، یان هەموو کارێك پێویستی بە ڕا وەرگرتنی گەورە هەیە.
(١٢٨١) واتە ئەوەندە سەربەخۆ کار دەکات و متمانەی بە خۆیەتی پرس بە گەورە ناکات.
(١٢٨٢) واتە کارێکی ئەوەندە شازی کردووە، خەڵکیی بە سەر سوڕمانەوە سەیری دەکات.
(١٢٨٣) واتە بە کەوتنی کەسێکی گەورە، خەڵکێکی دیکە بەرز دەبنەوە و دێنە ڕوو.
(١٢٨٤) بە کەسێك یان دایکێك دەوترێت منداڵی دەبێت.

**شاری بێ حاکم وێران بێت.**[١٢٨٥]
**شاران لە عەزرەت بەغدا ناونرا، بەغداش ئاو بردی.**[١٢٨٦]
**شامە ڕێی بری نەگەیشت بە شام.**[١٢٨٧]
**شاناخسێ بەپاڵ مروپێوەیە.**[١٢٨٨]
**شانامەی ڕۆستەمی زالە.**[١٢٨٩]
**شانسی نییە و نمەکی سوێرە.**[١٢٩٠]
**شانی دا داوە.**[١٢٩١]
**شان و شەوکەتی نایهێنێت.**[١٢٩٢]
**شانی دایە بەری.**[١٢٩٣]

---

(١٢٨٥) بە شارێك دەوترێت هیچ یاسا و ڕێسای تیادا نەما بێت.
(١٢٨٦) زۆر کەس لە خۆشەویستیی کەسێك ناوی منداڵەکەی دەنێت، کەچی ئەو کەسە بێ بەها و ناو زەڕ ناو دەبرێت.
(١٢٨٧) واتە زۆر هیلاك بوو بە کارەکەیەوە نەگەیشتە ئەنجام.
(١٢٨٨) شاناخسێ و مەروێ دوو دێی کوردستانن بەپاڵ یەکەوەن بە دوو کەس دەوترێت هەمیشە بەیەکەوە بن و لەپشت یەك بن.
(١٢٨٩) بە کارێك و گرفتێکی دوور و درێژ دەوترێت زۆر بوترێتەوە.
(١٢٩٠) بە کەسێك دەوترێت هەموو ڕەنجی خۆی دەرخواردی خەڵك بدات و هیچ کەس منەتی لێ نەزانێت.
(١٢٩١) بە کەسێك دەوترێت ڕازی بووبێت و بێزار بووبێت و کۆڵی دابێت لە ئەنجامی گرفتێکدا.
(١٢٩٢) بە کەسێك دەوترێت پلەوپایەی وەرگرتبێت و لێتەهاتوو بێت و قابیلی نەبێت.
(١٢٩٣) بە کەسێك دەوترێت بە ناچاری ڕەزامەندیی خۆی دەرخات.

**شانی لیٚ دەخوریٚت.**(١٢٩٤)
**شانی هەڵی گرتووە.**(١٢٩٥)
**شایی شاییگەرانە، خرووی دراوسیٚیانە.**(١٢٩٦)
**شتن رەنگ و رووە، خواردن گەند و گووە.**(١٢٩٧)
**شتی چاك خۆی هاوار دەكات.**(١٢٩٨)
**شتیٚك زانایەك بیشاریٚتەوە، بە هەزار نەزان نادۆزریٚتەوە.**(١٢٩٩)
**شتیٚك بكە گۆشتی پیٚ بگریت، نەك گۆشتی پیٚ دانیٚیت.**(١٣٠٠)
**شتیٚكت خوارد بە شیری تەركی نادەیت بە پیری.**(١٣٠١)

---

(١٢٩٤) واتە حەز بەو كارە دەكات.
(١٢٩٥) بە كەسیٚك دەوتریٚت ڕازی بیٚت بە كاریٚكی ناپەسەند.
(١٢٩٦) هەموو كاریٚكی دراوسیٚ شایی بیٚت یان شین كاردانەوەی هەیە بەسەر دراوسیٚیەكانیەوە.
(١٢٩٧) پاك و خاویٚنی و خۆشتن ڕووكەشیٚكی جوان بەمرۆڤ دەبەخشیٚت بەڵام خواردن هەر چۆنیٚك بیٚت كەس نایبینیٚت لەناو سكتدا، واتە ڕووكەش بۆ خەڵكیی و خواردن ئارەزووی خۆتە بۆ خۆتە.
(١٢٩٨) شتی جوان و باش پیٚویستی بە پڕوپاگەندە نییە.
(١٢٩٩) واتە جیاوازیی زۆرە لەنیٚوان زانا و نەزاندا وەكو لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمویٚت:(هل یستوی الژین یعلمون والژین لایعلمون)
(١٣٠٠) بە كەسیٚك دەوتریٚت ئاگای لە كار و كردەوەكانی بیٚت و تووشی گرفتی نەكات لەبری ئەوەی قازانج بكات.
(١٣٠١) واتە پەروەردەی منداڵ لە سەرەتاوە گرنگە، نەك بە گەورەیی كار لە كار بترازیٚت.

**شڵقەی مەشکە و چزەی تاوە، بۆ ژنی لێوەشاوە.**(١٣٠٢)

**شمشێر نایبڕێت.**(١٣٠٣)

**شوان بە شوانیی عار نییە، بە نانچنینەوەی عارە.**(١٣٠٤)

**شوان تا دانیشێت، گەلەی دوور دەکەوێتەوە.**(١٣٠٥)

**شوانی ناپاك لە گورگ ناپاکترە.**(١٣٠٦)

**شوست و شۆی لێ بڕی.**(١٣٠٧)

**شوێن کڵاوی بابردوو مەکەوە.**(١٣٠٨)

**شوێنی شێرە، ڕێوی لێی دەکات گێرە.**(١٣٠٩)

---

(١٣٠٢) لە کۆندا لەبەر ئەوەی کاری ڕۆژانەیان بەو ئیشانە ڕۆشتووە ژنی لێهاتوو لێوەشاوەیان ویستووە ئەو کارانە بزانێت.

(١٣٠٣) بە کەسێك دەوترێت زۆر بەهێز و بەجەرگ بێت لە شمشێر نەترسێت و سڵ نەکاتەوە.

(١٣٠٤) شوان شوانیی بەلاوە نەنگ نییە، بەڵام ناچنینەوەکەی بەلاوە نەنگە.

(١٣٠٥) واتە بەرپرسیار دانیشێت و خەڵکەکە بخاتە لاوە، میللەتی لێ دوور دەکەوێتەوە.

(١٣٠٦) واتە کارمەند و کارگێڕ بە ناپاکیی کار بکەن و هەست بە لێپرسینەوە نەکەن، زەرەرمەندن بۆ سەر گیانی ئەو گەلە.

(١٣٠٧) واتە دەقی شکاند و ڕیسوای کرد.

(١٣٠٨) واتە دوای شتێك مەکەوە لە دەست چوو بێت.

(١٣٠٩) بەو شوێنە دەوترێت پێشتر کەسێکی بە پلەوپایە گەورە تیایە بووبێت ئێستا ئەو نەما بێت و کەسانێکی پڕوپووچ لە جێی نزرگەی دانیشتبن.

شووڵ بە تەڕی نەبێت ناچەمێتەوە.(١٣١٠)
شوولی لێ هەڵکێشاوە.(١٣١١)
شیاکەی تێهەڵسوو، بیکەرە گاگەل.(١٣١٢)
شیری بەری داپکی هێنایەوە.(١٣١٣)
شێر لەبەر قەلغاندا خۆی ناگرێت.(١٣١٤)
شیر کە دۆشرا ناچێتەوە گوان.(١٣١٥)
شیری حوشتر و دیاری عەرەب.(١٣١٦)
شین و شایی، دەستەوایی.(١٣١٧)
شێر بە گوێ دەگرێت.(١٣١٨)

---

(١٣١٠) دەبێت هەر کەسێك و هەموو شتێك لە ساواییەوە، جوان پەروەردە بکرێت.
(١٣١١) بە کەسێك دەوترێت سنوور بەزێن بێت و بەکاری ناشیرین هەستێت.
(١٣١٢) بە کەسێك دەوترێت زۆر بێ عەقڵ و نەزان بێت، جیاوازیی نەبێت لە بیرکردنەوەدا لەگەڵ ئاژەڵدا.
(١٣١٣) واتە بە جۆرێك ئازاری پێگەیشتووە ناخ و مۆخی پێی زانیووە.
(١٣١٤) بە کەسێکی بێ هێز دەوترێت لەبەردەمی هێزێکدا خۆی نەگرێت.
(١٣١٥) قسەیەك یان ژوانێك کە درا جارێکی دیکە گەڕانەوەی نییە.
(١٣١٦) کەسێك دەیڵێت ئارەزوومەندی نە شیری حوشتر و نەبینینی عەرەب.
(١٣١٧) واتە شین و شایی قەرزە بەرامبەر دەبێت بدرێتەوە.
(١٣١٨) بەو مرۆڤانە دەوترێت ناترسن و بوێرن و سڵ لە هیچ کەسێك ناکەنەوە قسەی خۆیان دەکەن و کاری خۆیان بە جێ دەهێنن.

**شێر پیر بوو، دەبێتە گاڵتەچی کەران.**[١٣١٩]
**شێر بمشکێنێت، نەك ڕێوی بم خوات.**[١٣٢٠]
**شێر لە بێشە بێتەدەر، نێر بێت یان مێ هەر شێرە.**[١٣٢١]
**شێریماڵەوە و ڕێوی دەرەوە.**[١٣٢٢]
**شێرە بەفرینە کەس لێی ناترسێت.**[١٣٢٣]
**شەرعی مار بە دار.**[١٣٢٤]
**شەرم لە شا ناکات.**[١٣٢٥]
**شەریکیی و خەریکیی.**[١٣٢٦]

---

(١٣١٩) شێر هەر چەند پیر بێت هەر شێرە، پیاوی گەورەش پیر بێت گەورەیی پارێزراوە، با مرۆڤی هیچ و پووچ و بێ دڵ بەوە خۆشکەن.
(١٣٢٠) واتە مرۆڤ کەسێکی مەرد و بەرز قسەی پێبڵێت، نەك ترسنۆك و بێ دەسەڵاتێکی فێڵباز و بوودەڵە.
(١٣٢١) مرۆڤی گەورە و بە دەسەڵات و بەهێز ژن بێت یان پیاو ناوبانگ و ناونیشان و کاری لەگەڵ ڕەوتی تەمەنی کار دەکات.
(١٣٢٢) بە کەسێك دەوترێت تەنها لە ماڵەکەی خۆیدا ئازا بێت بەڵام لە دەرەوە بوودەڵە و ترسنۆك بێت.
(١٣٢٣) بە کەسێك دەوترێت بە قەوارە زلە و بە کەسایەتی بێ دەسەڵات و بێ توانا و بێ ڕۆحە و لە جێی نەبووانە.
(١٣٢٤) واتە کەسێك بزێو و زەرەرمەند بێت ئامانیان نییە مەگەر لێدان و مردن چارەسەریان بکات.
(١٣٢٥) بە کەسێك دەوترێت چاو قایم و بزێو و بێشەرم بێت.
(١٣٢٦) واتە لە هەرچی شتێکدا لەگەڵ هەر کەسێکدا شەریك بێت، خەریکت دەکات و ناپەرژێیتە سەر حاڵی خۆت.

**شەڕیکی دز و ڕەفیقی قافڵە.**(١٣٢٧)
**شەرابی موفت قازیش دەیخوات.**(١٣٢٨)
**شەرت هۆهۆ نییە، شەرت کۆکۆیە.**(١٣٢٩)
**شەڕ لە شێف و ئاشتیی لە خەرمان.**(١٣٣٠)
**شەڕ بە چەك و مامەلە بە پارە. بە کەسێك.**(١٣٣١)
**شەڕ شەڕی شەڕکەرانە، ناوبژیکەر ماڵ ویرانە.**(١٣٣٢)
**شەڕ کراو برایەوە، کەچەل بۆ دار خولایەوە.**(١٣٣٣)
**شەڕکەر وازی هێناوە، ناوبژیکەر واز ناهێنێت.**(١٣٣٤)

---

(١٣٢٧) بە کەسێك دەوترێت ئامانەتێکی پێ سپێرا بێت و بەڵام بۆ دەستکەوتی خۆی پشتی دز بگرێت.
(١٣٢٨) واتە شتی بەلاش پیاوە ئایینییەکانیش حەزی لێ دەکەن.
(١٣٢٩) واتە کردار شەرتە، نەك گوفتار.
(١٣٣٠) واتە لە کاتی بێکاری لە یەك زویر بوون گرنگ نییە، لە کاتی کار و فەرمان بە یەکبوون پێویستە.
(١٣٣١) کەوابێت کە شەرت کرد بێ چەك مەیکە و هیچ مامەڵەیەکیش بێ پارە مەکە.
(١٣٣٢) لەبەینی دوو شەڕکەردا هەموو گورزەکان بەر ناوبژیکەر دەکەوێت.
(١٣٣٣) بە شەڕێکی دوولایەن دەوترێت کەچەڵ سەیرکەر بووە، بە دڵی کەچەڵ شەڕ نەکراوە، بۆیە بۆ دار دەخولێتەوە بۆ ئەوەی سەرێك بشکێت، تا کەس ناوی سەرە کەچەڵەکەی ئەو نابات.
(١٣٣٤) شەڕکەر بە دڵی خۆی شەڕی کرد و هیلاك بوو، بەڵام زەرەرمەند ئێستا ناوبژیکەرە دەیەوێت حەقی خۆی بکاتەوە.

**شەڕکەر، ئاشتیت لە بیر بێت.**[١٣٣٥]
**شەڕ لە بەتاڵی چاکترە.**[١٣٣٦]
**شەڕ لە نیوەی بگەڕێتەوە چاکترە.**[١٣٣٧]
**شەڕ و نیوە شەڕ بڕان.**[١٣٣٨]
**شەڕ و نیوە شەڕ هەر شەڕە.**[١٣٣٩]
**شەڕی خۆترێن مەکە.**[١٣٤٠]
**شەڕی ئەو دۆڵە، مەهێنەرە ئەم کۆڵە.**[١٣٤١]
**شەڕ خۆش نییە، شەڕ نامەی خۆشە.**[١٣٤٢]
**شەڕ بە کۆنە قینەوە دەکرێت.**[١٣٤٣]

---

(١٣٣٥) تەوژم و تینی شەڕکەری قین لە دڵ دوایی لێك ناداتەوە بەڵام من پێی دەڵێم ئاشتیش خۆشە دوای شەڕ.
(١٣٣٦) واتە مرۆڤ نابێت بێکار و بەتاڵ و دەستسپی دانیشێت.
(١٣٣٧) واتە لە شەڕدا دەست و قاچێك بشکێت لە کوشتن و مردن چاکترە.
(١٣٣٨) واتە جنێو و پێکدادان و پەلاماردان بە نیازی شەڕ هەر شەڕە.
(١٣٣٩) کەسێك نیازی شەڕی بێت و بە پیر شەڕەوە بچێت ئەوە نیوەی شەڕەکەی کردووە.
(١٣٤٠) واتە شەڕێك مەکە لە تواناتدا نەبێت و بیدۆڕێنیت.
(١٣٤١) واتە ئەگەر ئەم شەڕە پەیوەندیی بە تۆوە نییە مەیخەرە کۆڵی خۆت و دەستی لێ هەڵگرە و وازی لێ بێنە.
(١٣٤٢) شەڕ ناخۆشە لەبەر ئەوەی خوێن و کوشتاری تیادا ڕوو دەدات بە گێڕانەوەی و کاردانەوە کتوپڕیەکانی باسکردنی خۆشە.
(١٣٤٣) کە وابێت ئەگەر کەسێك قین لە دڵ نەبێت، بە دڵی پاك و مێشکی ساردەوە شەڕی بۆ ناکرێت.

**شەڕ بۆ سەگ هاتووە.[١٣٤٤]**
**شەڕ پەشیمانیی لە دووایە.[١٣٤٥]**
**شەڕێك بێ و خێری منی تێدا بێت.[١٣٤٦]**
**شەڕ دەفرۆشێت.[١٣٤٧]**
**شرکە بێت و روونکە بێت.[١٣٤٨]**
**شەش بە تەشپیەکە، حەوتی ربەیەکە.[١٣٤٩]**
**شەق دەزانێت قۆناغ لە کوێیە.[١٣٥٠]**
**شەکر شیرینە، خاك شیرینترە.[١٣٥١]**

---

(١٣٤٤) مرۆڤ بە توانای هزری خۆی دەتوانێت هەموو ئاژەڵ گرفتێك چارەسەر بگات، زمانی تێگەیشتنی هەیە وەك ئاژەڵ نییە هەر پەلامار بدات.
(١٣٤٥) ئەوەی شەڕی هەبێت عەقڵ دەداتەوە، بەڵام دوای شەڕ پەشیمانبوونەوە عەقڵ دەهێنێتەوە بەر خۆی.
(١٣٤٦) بە کەسێك دەوترێت لە دوورەوە بوەستێت و خۆشحاڵ بێت بە شەڕ و بەگژداچوونی دووکەس.
(١٣٤٧) واتە کەسێکە و حەز و ئارەزووی لە شەڕە، بێ شەڕ هەڵناکات.
(١٣٤٨) واتە بەرگی مرۆڤ با تازەش نەبێت یا دڕاو بێت پێویستە پاك بێت.
(١٣٤٩) بە قسەیەك دەوترێت زۆر دووبارە بکرێتەوە هیچی تیا بەستە نەبێت، کەس لێی تێتەگات.
(١٣٥٠) هەندێکجار مرۆڤ بە ئاسایی نایەتە سەربار، دەبێت زۆری لەگەڵدا بەکار بهێنێت.
(١٣٥١) شەکر چەند شیرین بێت مرۆڤ دەتوانێت بیخاتە لاوە، بەڵام خاك ناخرێتە لاوە.

**شەلم، کوێرم، ناپارێزم.**[١٣٥٢]
**شەل نییە و پای شکاوە.**[١٣٥٣]
**شەلە باوان و کوێرە باوان.**[١٣٥٤]
**شەممە بە کەم کەس.**[١٣٥٥]
**شەممە کار و شەممە بار، هەر بووکی تیا مەکە سوار.**[١٣٥٦]
**شەمالە دەگرێتەوە، بەختی دەدۆزێتەوە.**[١٣٥٧]

---

(١٣٥٢) کەسێك دەڵێت گوێ نەداتە کەس بە هەموو لایەکدا زەرەر بات و دەست بوەشێنێت.
(١٣٥٣) بە کارێك یان شتێك دەوترێت جیاوازییان لەبەیندا ئەوەندە نەبێت، لە ڕووی شێوە و زەرەرەوە وەك یەکبن.
(١٣٥٤) بە کەسانێك دەوترێت لە کاتی لێقەوماندندا هەر ڕوو بکەنەوە ئەو کەسە گەورەیەی خۆیان.
(١٣٥٥) بە کەسێك دەوترێت بە نەردین کارێکی بۆ بکرێت و هەڵگرێت و پێی گەورە بێت و جێگای سەرسوورمان بێت.
(١٣٥٦) کورد بە پێی ئەزموونی خۆی بەلایەوە باش نییە بووکی تیادا بگوێزرێتەوە لە ڕۆژی شەممەدا، بەلام دەڵێت هەموو کارێکی تێدا بکە، دەلیلە بۆ گرفتەکەی.
(١٣٥٧) ئەوانەی گرفتێکی نامۆیان هەیە بە شەمالە وەری دەگرن، مرۆڤەکە سێ بەرد دەگرێت بە دەستەوە لە سەرەڕێگایەکی سێ ڕێگادا، هەر بەردێك بە ڕێگایەکدا هەڵدەدات، دوای نیازی دڵی و فاتحە خوێندن... هەر کەسێك هەر قسەیەك بکەن کە هاتن (١٣٥٨) بە و کوڕ و کچانە دەوترێت درەنگ هاوسەرگیریی دەکەن.

شەمەندەفەرەکە بە جێی هێشتووە.[1358]

شەن و کەو دەکات.[1359]

شەنە لە مەنە کەمتر نییە.[1360]

شەو شەوی براتێ، خوا دوو کور و کچێکتان باتێ.[1361]

شەو و رۆژ دەروات، قەزا ز بەلاّ ناروات.[1362]

شەو دەنووێت بە جلە گایە، رۆژیش دەڵێیت پاشایە.[1363]

شەیتان ناوبژیکەریان بێت.[1364]

**شەیتان پەلەی کرد، چاوێکی خۆی کوێر کرد.[1365]**

---

(١٣٥٩) واتە باش و خراپ یان گەورە لە بچووك جیا دەکاتەوە.

(١٣٦٠) واتە کەس لە کەس کەمتر نییە.

(١٣٦١) لە شەوانی بەراتدا منداڵان کە دەگەڕێن ئەوە دەڵێن ئەو کەسانەی هیوای منداڵبوونیان نەماوە، شتی باش بە منداڵان دەبەخشن وەکو وردە پارە و چەرەسی جوان و مێووژ و گوێز و چکلێت، کە دوعای منداڵان لەو شەوەدا بۆ گیرا بکات و بە ئاواتی خۆیان بگەن.

(١٣٦٢) شەو و ڕۆژ بەدوای یەکدا دەڕۆن بەڵام قەزا و قەدەر چارەنووسی هەر کەس بێت و لە ناوچەوانی نووسرا بێت دەبێت ببینێت.

(١٣٦٣) بە کەسێك دەوترێت زۆر گوێ نەداتە جلوبەرگی ماڵەوەی بەڵام پاشایانە جوانترین و بە نرخترین جل دەپۆشێت بۆ دەرەوە.

(١٣٦٤) واتە شەڕی نێوان ئەو دوو شەڕانییە تونتر بێت.

(١٣٦٥) کە وابێت هەموو کەسێك بە تەمای سەرکەوتن بێت دەبێت هێوەر بێت.

# پیتی (ع)

عاقڵ دووجار ناخەڵەتێت.[١٣٦٦]
عاقڵ کەر دەبێت، کەر عاقڵ نابێت.[١٣٦٧]
عەقڵ بە گەورە و بچووکیی نییە.[١٣٦٨]
عەقڵ هەموو جارێك میوان نییە.[١٣٦٩]
عەقڵ تاجێکی زێڕینە، لەسەری هەموو کەسێکدا نییە.[١٣٧٠]
عەباسە لە دیوەخان چ باسە.[١٣٧١]
عەیبی دەوڵەمەند جێ لەبانی، عەیبی هەژاریش عالەم پێی زانی.[١٣٧٢]

---

(١٣٦٦) مرۆچی عاقڵ بە ڕێکەوت دەخەڵەتێت واتە عەقڵ لەو هەڵخەڵەتاندنەش وەردەگرێت و دووبارە نابێتەوە.

(١٣٦٧) مرۆڤی عاقڵ جاروبار هەڵدەخزێت بەڵام مرۆڤی کەر عەقڵ چاوەڕێی لێ ناکرێت بۆ جارێکیش عاقڵ بێت.

(١٣٦٨) مرۆڤی عاقڵ لە سەرەتای تەمەنیەوە دیارە عاقڵە.

(١٣٦٩) مرۆڤ قابیلی هەڵەیە تەنها خوا هەڵە ناکات.

(١٣٧٠) عەقڵ وەکو تاجێکی زێڕین وایە پێی بەرز دەبێتەوە و دەتخاتە جێگای ڕێز و حورمەت لەناو خەڵکدا.

(١٣٧١) ئەمە چیرۆکی دایکێکی بێوەژنە چاوەڕوانی خوازبێنیکەرێك دەکات دوای هەموو میوانێك ئەو پرسیارە لە کورەکە دەکات.

(١٣٧٢) کەوابێت دەوڵەمەند عەیبەکەی داپۆشراوە بە هۆی دەوڵەتەکەیەوە بەڵام عەیبی هەژار دەهۆڵی بۆ لێ دراوە و کەس بۆی ناپۆشێت.

**عوزر لە قەباحەت خراپترە.**[١٣٧٣]
**عومری درێژ شەرمی لە کەس نییە.**[١٣٧٤]
**عومری پیرە مەرێکی ماوە.**[١٣٧٥]

---

(١٣٧٣) بە کەسێك دەوترێت کارێکی هەڵەی کرد بێت دوایی پساوی بۆ هەڵەکەی هێناوەتەوە لە هەڵەکەی ناشیرینتر بووە.
(١٣٧٤) کەوابێت کە تەمەن درێژ و مردن بە دەست خوا بێت، دەبێت هەمووومان رێز لە تەمەن درێژ و پیرەکان بگرین چونکە خۆشمان پیر دەبین.
(١٣٧٥) بە کەسێك دەوترێت تەندروستیی رووخا بێت و تەمەنی زۆر ببێت.

## پیتی (ف)

فارس بە دەنگ، تورك بە رەنگ، کورد بە پەند.(١٣٧٦)
فەخر بەرەی ناو دراوە.(١٣٧٧)
فەقیری خۆشە، قۆرتەکانی ناخۆشە.(١٣٧٨)
فەقیانە سپی سەڵتە بابردوو، تۆ لە ژنت چی لە برسامردوو.(١٣٧٩)
فروج گۆشتت چی و گۆشتاوت چی...؟(١٣٨٠)
فرۆشتن لە خواستن چاکترە.(١٣٨١)

---

(١٣٧٦) هەموو نەتەوەیەك بەپێی شوێن و نەژادیان خەسڵەتی خۆی هەیە. وەکو فارس و تورك و کورد.

(١٣٧٧) کەوابێت هیچ کەسێك شانازیی نەکا بە خۆیەوە، هەموو کەسێك تووشی گرفت دەبێت قاچی لەو بەرە ناو دراوە هەڵدەنوێت.

(١٣٧٨) هەموو کەس بە بەشی خۆی ڕازییە ئەگەر کەمیش بێت بەڵام دەرەقەتی قۆرت و گرفتەکانی نایەت.

(١٣٧٩) بە کەسێکی خۆ دەرخەری هیچ لە بارە نەبوو دەوترێت کە خۆیشی پێ بەخێو نەکرێت و خەریکی دەستبڕینی کچان بێت.

(١٣٨٠) بە کەسێکی نابووتی بوودەڵە دەوترێت خۆی زۆر بە شت بزانێت و کەس بە هیچ نەزانێت.

(١٣٨١) کاتی پێویست و تەنگانەدت چاك وایە شتێکی خۆت بیفرۆشیت، نەك لەم و لەو بخوازییت.

**فیتنە هەوێنی نۆ قازان شیرە.**[١٣٨٢]
**فیکە بەبێ لێو دەسپێرن.**[١٣٨٣]
**فیکەی خۆی دەناسێت.**[١٣٨٤]
**فوو لە دۆ ناکات.**[١٣٨٥]

---

(١٣٨٢) بە کەسێکی دووڕوو دووزمان دەوترێت کە دۆست و هاوڕێ و خزم لە یەکتر دەکات.
(١٣٨٣) واتە کار نەدرێتە دەستی کەسی ناشی و نەشارەزا و لێنەهاتوو.
(١٣٨٤) واتە ئەو قسەیە یان ئەو کارە ئەو خەتایەی کە خۆی کردوێتی دەیناسێتەوە لە هەر شوێنێك بوترێت.
(١٣٨٥) بە کەسێك دەوترێت جنێو فرۆش و بێ چاو و ڕوو بێت.

# پیتی (ق)

**قازانج سەر مایەی خوارد.**[1386]

**قەت چاکە مەکە لەگەڵ ناپیاوا، پشتی تێکردی دەیدا بە ئاوا.**[1387]

**قەدری مانگ لە شەو دایە.**[1388]

**قەدری زێڕ لای زەڕەنگەرە.**[1389]

**قەدری ددان بە لێوەوەیە.**[1390]

**قەرزار قەرزاری نەکوشتووە.**[1391]

---

(١٣٨٦) بە دوکاندارێك یان شتفرۆشێك دەوترێت قازانجی شتەکانی لە مایەکەی زیاتر بێت لە خواردنیدا زیادەڕۆیی لێ بکات تا ئیفلاس دەکات.

(١٣٨٧) کەوابێت چاکەکردن لەگەڵ ناپیاودا سوودی نییە و بە هەدەر دەڕوات.

(١٣٨٨) واتە کاتێك یارمەتیی کەسێك بدە پێویستیی پێت بێت و بە لایەوە گرنگ بێت وەکو چۆن تاریکیی شەو پێویستی بە ڕوناکیی مانگە.

(١٣٨٩) کەواتە شتێکی بە نرخ لای خاوەنە ئەسڵییەکەی بە نرخە ئەوەی کە دەزانێت مامەڵەی پێ بکات.

(١٣٩٠) واتە قەدری بچووك و خێزان بە گەورەکەیانەوەیە کە هەموو عەیب و نەهێنییان دادەپۆشێت وەکو لێو چۆن ددانەکانی داپۆشیوە.

(١٣٩١) قەرزدان بە هەموو کەس خێر و پیاوەتییە، ئەوەی وەریگرتووە دەبێت بە سوپاسەوە بیگەڕێنێتەوە، چونکە قەرز دوو ماڵ ئاوا دەکاتەوە.

قەرز دوو ماڵ ئاوا دەکاتەوە.[(١٣٩٢)]
قەرزکردن خۆشە، دانەوەی ناخۆشە.[(١٣٩٣)]
قەرز کۆن دەبێت، نافەوتێت.[(١٣٩٤)]
قەرز دانەوەی دەوێت.[(١٣٩٥)]
قەرز لە ئاسن قورسترە.[(١٣٩٦)]
قەرز کوێرە.[(١٣٩٧)]
قەرزی بێنە و نییە...![(١٣٩٨)]
قەزای دیزە کەوت لە گۆزە.[(١٣٩٩)]

---

(١٣٩٢) قەرز لە پێویستیدا دەدرێت بە سەرڕاستیی دەگەڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی.
(١٣٩٣) قەرزکردن خۆشە لەبەر ئەوەی لە تەنگانەدا مرۆڤ ڕزگار دەکات بەڵام بۆ گەڕانەوەی بۆ ئەوەی سەرڕاست بیت گوشار دەخەیتە سەر خۆت.
(١٣٩٤) قەرز چەند بمێنێتەوە دەبێت هەر بۆ خاوەنەکەی بگەڕێتەوە.
(١٣٩٥) قەرز دەبێت نەخرێت پشتگوێ، بیر لە گەڕانەوەی بکرێتەوە.
(١٣٩٦) لە پەندێکدا دەڵێت: زۆرم لە ئاسن و بەرد بە شان گواستەوە لە قەرز قورستر نەبوو.
(١٣٩٧) بە کەسێك دەوترێت کە بە پاڕانەوە قەرزێك وەردەگرێت بەڵام دانەوەکەی پشتگوێ دەخات.
(١٣٩٨) بەو قەرزە دەوترێت دوای وەرگرتنی قەرزەکە، قەرزدارەکە بە هیچ جۆرێك لە توانایدا نییە بۆ خاوەنەکەی بگەڕێنێتەوە.
(١٣٩٩) بە کەسێك دەوترێت خەتایەك بکات بەسەر کەسێکی دیکەیدا بێنن، یان بەردێك هەڵدەن بۆ کەسێك بەردەکە بەر سەری کەسێکی دیکە بکەوێت.

**قەل بە قەلی وت، رووت رەش بێت.[١٤٠٠]**

**قەڵای مەریوان پاڵمدا پێوە، قەڵاکەم رووخا پاڵبەم بە کوێوە.[١٤٠١]**

**قسە کەوتە زارێك، دەکەوێتە شارێك.[١٤٠٢]**

**قسە ببەستەرەوە، مەیگواستەرەوە.[١٤٠٣]**

**قسە لە دەمیا ناوەستێت.[١٤٠٤]**

**قسە لە قافا خۆشە.[١٤٠٥]**

**قسە قسە دەهێنێت.[١٤٠٦]**

**قسە بوو بە دوو دەبێت بە گوو.[١٤٠٧]**

**قسە هەزارە هەموو کەس پێی دەوێرێت.[١٤٠٨]**

**قسە یان لە شێت یان لە منداڵ.[١٤٠٩]**

---

(١٤٠٠) دوو کەس تاوانیان وەك یەك وایە بەلاّم هەریەکەیان خەتا و خەجاڵەتی بۆ ئەوی دیکە دەوێت.

(١٤٠١) کەسێك دەیلێت کە لە سایەی پیاوێکی گەورە وز پایە بەرزەوە حەسا بێتەوە دوایی بمرێت یان لە دەستی بچێت.

(١٤٠٢) واتە قسە دەماودەم دەروات و ناوەستێت.

(١٤٠٣) واتە قسە لای خۆت بپارێزە، ئەملاولای پێ مەکە.

(١٤٠٤) واتە کەسێکی دەمشرە.

(١٤٠٥) واتە قسە لە جێی خۆیدا بکە، نەك لە پاشملە.

(١٤٠٦) واتە قسە قسەت بیر دەخاتەوە.

(١٤٠٧) واتە هەندێك قسە هەیە یەکجار بوترێت چاکە بۆ ئەوەی ئاژاوەی لێ نەکەوێتەوە.

(١٤٠٨) واتە هەموو کەس دەتوانێت هەموو جۆرە قسەیەك بکات.

(١٤٠٩) واتە منداڵ و شێت قسە وەك خۆی دەڵێن فێڵ و گۆرین نازانن.

قسه بچێژه، بینێژه، ئینجا دەریهاویژه.[1410]
قسه هەزاره و دووانی به کاره.[1411]
قسه هیچی تێ ناچێت.[1412]
قسه له پاش حەوت کێو، دەگاتەوه به خێو.[1413]
قسه گەوهەره مەیدۆڕێنه.[1414]
قسه ناچێته گیرفانەوه.[1415]
قسه هاته ڕوو نامێنێت ئەرجوو.[1416]
قسه وەك گۆلله وایه، با دەرنەچێت به هەوایا.[1417]
قسەت به دەم زەویا بچێته خوارەوه.[1418]

---

(١٤١٠) پێویسته هەموو کەسێك تامی قسەکه بچێژێت و ئینجا بیری لێ بکاتەوه و دواتر بیکات بۆ ئەوەی گرفتی بۆ دروست نەکات.
(١٤١١) کەوابێت قسه زۆره، ئەوەی کاریگەره بوترێت چاکه.
(١٤١٢) واته قسه به پاره ناکڕێت، کەس پارەی پێ نەداوه.
(١٤١٣) واته قسه له دووریشەوه بکرێت هەر دەگاتەوه به خاوەنی.
(١٤١٤) مرۆڤ دەبێت بزانێت کام جۆره قسه دەکات، ئەگەر کردی با گەوهەر بێت نەدۆڕێت.
(١٤١٥) واته قسه له عەقڵدا بەراورد دەکرێت، نەك له گیرفاندا.
(١٤١٦) کاتێك قسه هاته ڕوو مەپارێزەوه، ڕاست و حەق ئاراستەی ئەو کەسەی بکه که بەرامبەرت دەدوێت.
(١٤١٧) ئاگات له قسه و وتەی خۆت بێت بەبێ بەها دەرنەچێت.
(١٤١٨) ئەمه قسەیەکی گرنگه یان مەترسییه نابێت له سنووری خۆیان دەرچێت به متمانه دەوترێت بۆیه له بەینی خۆیاندا دەینێژن.

قسەکردن بە پارە بووایە کەس نەیدەکری.[1419]
قسەکانی لە قوتووی هیچ عەتاریکدا نییە.[1420]
قسەکەت لە دەما بە شەکر بێت.[1421]
قسەکەت بە جێیە، کارەکەمان شامە ڕێیە.[1422]
قسەیەك گۆشتی پێ نەگریت، بە دوایدا نەگریت.[1423]
قسەیەك گۆشتی پێ نەگریت، گۆشتی پێ دامەنێ.[1424]
قسەی خۆش بەرد نەرم دەکات.[1425]
قسەی خۆش لە بەهەشتەوە هاتووە.[1426]
قسەی خۆش مار لە کون دەهێنێتە دەر.[1427]
قسەی حەق ڕەقە.[1428]

---

(١٤١٩) واتە قسە هەر چەند بێ پارەیە بەڵام بەنرخە.
(١٤٢٠) بە قسەیەك دەوترێت چارەسەر نییە بۆ هیچ دەردێك واتە بێ کەڵکە.
(١٤٢١) کاتێك ئەمە دەوترێت کە کەسێك قسە بە کەسێکی قسەکەر دەبڕێت قسەکانیشی بە دڵیتی.
(١٤٢٢) واتە قسەی بەرامبەرەکەی بە دڵیتی بەڵام وەڵامەکەی دوورە.
(١٤٢٣) قسەیەك بۆت سوودبەخش نەبێت بە دوایدا مەگری و مەڕۆ.
(١٤٢٤) قسەیەك بکە بۆت سوودمەند بێت، نەك زەرەرمەند بێت بۆت.
(١٤٢٥) واتە قسەی نەرم و باش هەموو کەسێکی خراپ دەهێنێتە سەر ڕێی چاك.
(١٤٢٦) قسەی خۆش لە مرۆڤی پاك و دڵفراوان و چاك دەبێتەوە و دەوەشێتەوە.
(١٤٢٧) واتە بە قسەی خۆش دوژمن دەبێت بە دۆست.
(١٤٢٨) هەموو قسەیەکی حەق لە جێی خۆیدا وەکو بەرد و گوللە وایە.

**قسەی سوارە.**(١٤٢٩)

**قسەی گوێ ئاگردان، ناخرێتە گیرفان.**(١٤٣٠)

**قسەم حەقە بۆیە ڕەقە.**(١٤٣١)

**قسەی وەك قوری زستانی لێهاتووە.**(١٤٣٢)

**قسەی وەك نەخشی بەردە.**(١٤٣٣)

**قسەیەکی حەقیش با بۆ دز بکەین.**(١٤٣٤)

**قسە مەکە بۆ دۆستێ وێت، نەوەك ئەویش دۆستێکی بێت.**(١٤٣٥)

**قفڵ بۆ حەڵاڵزادە کراوە.**(١٤٣٦)

**قفلی لە دەمی خۆی داوە.**(١٤٣٧)

**قورقوشمی کرد بە قوڕگیا.**(١٤٣٨)

---

(١٤٢٩) بە کەسێك دەوترێت قسەی ڕەواجی هەبێت و قسەی بڕوات لەناو کەسوکاریدا...

(١٤٣٠) واتە قسەی کۆش و بەرژەوەندی خۆ سوودمەند نییە بۆ کەس.

(١٤٣١) هەموو قسەیەکی ڕاست و حەق کە ڕەچاوی تێدا نەبێت ڕەقە.

(١٤٣٢) واتە قسەکانی هیچ بەها و نرخی نییە.

(١٤٣٣) واتە قسەکانی گەوهەرە و گرنگە نرخی زۆرە و بە بەهایە و ڕاستە.

(١٤٣٤) واتە هەموو کەسێك هۆیەك هەیە بۆ تاوان و کارە نارەواکانی ئەگەر بچینە بنج و بناوانی.

(١٤٣٥) باسی دۆستی خۆت مەکە، نەوەك هەمان دۆست دۆستی ئەویش بێت.

(١٤٣٦) واتە ئەوەی دز بێت و بیەوێت دزی بکات قفڵەکەش دەشکێنێت.

(١٤٣٧) بە کەسێك دەوترێت بە هیچ جۆرێك بەشداریی قسەوباس ناکات و دەمی داخستووە و هەر سەیر دەکات.

(١٤٣٨) واتە دەردێکی وای دایە تا هەیە بیری نەچێتەوە.

قوراوی دنیای پیاهەڵپڕاوە.[١٤٣٩]
قوڕی بۆ گیراوەتەوە.[١٤٤٠]
قوڵفی کەعبەی گرتووە.[١٤٤١]
قوڵفی کەعبەی کەچ نەکردووە.[١٤٤٢]
قومارچی دۆڕاو نەڵێت بە گونمەوە شەق دەبات.[١٤٤٣]
قۆڵی لەبنا بڕیوە.[١٤٤٤]
قۆناغی ناخۆشماڵی خۆیەتی.[١٤٤٥]

---

(١٤٣٩) بە دوو کەس دەوترێت یەکەمیان زۆر بەر هیلاکیی ژیان کەوتبێت، دووەم زۆر ڕێکەوتی شتی ناشیرینی کردبێت.
(١٤٤٠) بە کەسێك دەوترێت تووشی گرفتێکی ئەوەندە گەورە بووبێت سەری لێ دەر نەکات و ڕزگاربوونی مەحاڵ بێت.
(١٤٤١) بە کەسێك دەوترێت دوای حەجکردن خۆی بپارێزێت لە هەموو جۆرە هەڵەیەك و زمانی خراپ.
(١٤٤٢) واتە ئەو کارەی کردوویەتی ئەوەندە زل نەبووە، کە لەو جۆرە تاوانەی بخرێتە پاڵ.
(١٤٤٣) بە کەسێك دەوترێت کاتێك دۆڕا یان خەسارەیەکی لێکەوت یان زەرەرمەند بوو بێچاری خۆی نیشان دەدات، خۆی ناشکێنێت بۆ ئەوەی گاڵتەی پێ نەکەن
(١٤٤٤) بەو کەسانە دەوترێت کە کەسێکی ساختەچی زەرەرمەندی کردوون و هیچیان بە دەستەوە نەماوە.
(١٤٤٥) بە کەسێك دەوترێت هەموو حەز و ئارەزووەکانی و کاتی لە دەرەوەی ماڵی خۆیدا بەسەر بەرێت.

**قۆنەرەكانی جیرەی دێت، ناوسكی قۆڕەی دێت.[1446]**
**قین دوو ماڵ وێران دەكات.[1447]**

---

(١٤٤٦) بە كەسێك دەوترێت زۆر حەز و ئارەزووی لە پێڵاو و جلی جوان و فەنتازییە بەڵام گوێ ناداتە خواردن.
(١٤٤٧) واتە ماڵی ئەو كەسە خۆی و ماڵی بەرامبەرەكەی وێران دەكات.

# پیتی (ك)

**کابان یان بیبەشە یان رووڕەشە.[1448]**
**کا بۆ خۆم و جۆ بۆ کەرەکەم.[1449]**
**کابرا ناویان نەدەبرد، گووی لە سەرەڕێدا دەکرد.[1450]**
**کابرایەکی قەرز کوێرە.[1451]**
**کات لە زێڕ بە نرخترە.[1452]**
**کات تیغە نەیبریت دەتبریت.[1453]**
**کاری ئەمڕۆ مەخەرە سبەینێ.[1454]**

---

(١٤٤٨) کەییانو بە یەکسان شتێك دابەش بکات خۆی بێبەش دەبێت، یکسانیش نەبێت خۆی رووڕەش دەبێت.
(١٤٤٩) بە کەسێك دەوترێت لەپێشدا هەوڵی خۆی بدات و ئینجا هەوڵی کەسێکی دیکەیش بدات لە ترسا بێت یان لە خۆشەویستیدا بێت.
(١٤٥٠) بە کەسێك دەوترێت کەس ناوی نەبات و گرنگیی پێ نەدرێت، بەڵام خۆی دەیەوێت بە هەر چی جۆرێك بێت ناوی هەربەرن ئەگەر بە کارێکی خراپیش بێت.
(١٤٥١) بە کەسێك دەوترێت قەرز دەکات بەڵام لە بیر خۆی دەباتەوە.
(١٤٥٢) واتە زێڕ لە دەستت بچێت دەیکڕیتەوە بەڵام کات کە تێپەڕ بوو گەڕانەوەی نییە.
(١٤٥٣) کەوابێت کات وەکو شمشێرێك وایە لەگەڵی نەڕۆیت بە جێت دەهێڵێت و زەرەرمەند دەبیت و پێی ناگەیتەوە.
(١٤٥٤) کار و ئیشەکانت لە کاتی خۆیدا جێبەجێ بکە دوای مەخە.

**کار لە کار ترازا برا بوو بە برازا.**[1455]
**کالا لە قەد بالا.**[1456]
**کاری زل بە بچووك مەسپێرە.**[1457]
**کاری خێر لە هەتاو مەیخەرە سێبەر.**[1458]
**کارێکی پێ کردووە، با بە دەواری شری نەکردووە.**[1459]
**کای کۆن بە با مەکە.**[1460]
**کایەکە هی خۆت نییە، کایانەکە هی خۆتە.**[1461]
**کچ وەك دارگوێز وایە هەموو کەس پلاری تێ دەگرێت.**[1462]
**کچ قەلایە و ناگیرێت.**[1463]

---

(١٤٥٥) واتە کەسایەتی بەهۆی نەوەوە دوورکەوێتەوە، ئەو خۆشەویستیی و کەسایەتییە دوور دەکەوێتەوە یان نامێنێت.
(١٤٥٦) واتە هەموو شتێك بە قەد خۆی زیادەڕۆیی نەکرێت.
(١٤٥٧) هەموو شتێك بەپێی توانا و تەمەن جوانە.
(١٤٥٨) کاری خێر دوانەخرێت و دەستاودەستی پێ نەکرێت و زوو جێبەجێ بکرێت.
(١٤٥٩) بەوە دەوترێت لە حەق و لە ناحەق ئەوەی نەشێت بە کەسێکی بکەیت و بیلێیت.
(١٤٦٠) واتە قسە و گرفتی کۆن تازە مەکەرەوە.
(١٤٦١) واتە زۆر مەخۆ ڕەحم بە گەدەت بکە ئەگەر خواردنەکەش هی خۆت نەبێت.
(١٤٦٢) واتە کچ هەموو کەس داوای دەکات و تەماعی بۆی هەیە.
(١٤٦٣) کچی مەرد قەلایە بە هەموو کەس ناگیرێت و دەست ناکەوێت بە ئاسانیی.

کچ تەشییەکەی دایکی دەڕێستێت.[١٤٦٤]
کچم لەگەڵ تۆمە و بووکێ تۆ گوێت لێ بێت.[١٤٦٥]
کچی خۆم ناکەم بە قوربانی کوڕی خەڵکیی.[١٤٦٦]
کچێك دایك مەدحی بکات، دەبێت خاڵوان بیخوازێت.[١٤٦٧]
کتك و مشك، بوون بە خوشك.[١٤٦٨]
کتێب بۆ ئاخری دەگرێتەوە.[١٤٦٩]
کردن هەتا مردن.[١٤٧٠]
کردەی ئەوە و بردەی شەیتان.[١٤٧١]
کردەی منە و بردەی تۆ.[١٤٧٢]

---

(١٤٦٤) واتە کچ لە دایکی خۆی دەکات (دایە ببینە و دۆتە بخوازە).

(١٤٦٥) واتە لەگەڵ کچەکەتدا ڕادەبینیت هەموو شتێك بڵێت بەڵام لەگەڵ بووکدا ڕاستەوخۆ قسە ناکرێت.

(١٤٦٦) واتە هەموو کەسێك ڕەنجی خۆی بە لایەوە گرنگە و خۆشەویستە.

(١٤٦٧) واتە کچی چاك ئەوەیە خەڵکیی پەسەندی بکات، نەك خاڵوان.

(١٤٦٨) بە یەکبوونی دوو کەس دەوترێت کە بە سروشت هەرگیز یەك ناکەون.

(١٤٦٩) بە کرداری کارێکی نابەدڵ دەوترێت، کە کاردانەوەی دوارۆژی باش نەبێت.

(١٤٧٠) واتە مرۆڤ تا دەمرێت دەبێت لە کار و ڕەنج و دوانەکەوێت.

(١٤٧١) بە کەسێك دەوترێت زۆر ڕەنج بدات بەڵام خاوەنی هیچ نییە لەبەر ئەوەی نازانێت چۆن سەرفی دەکات.

(١٤٧٢) بە یەکێك دەوترێت زۆر ڕەنج بدات بەڵام کەسێکی دیکە لە دەستی دەردەهێنێت.

کردەی ئێمە و بردەی خەڵکە.[١٤٧٣]
کردەی گایە و خواردەی کەر.[١٤٧٤]
کردوویەتی بە شاییەکەی بناویلە.[١٤٧٥]
کراسی قورئان لەبەر کات، پێت باوەر ناکەن.[١٤٧٦]
کراسێك بدرێت بە پیسیی، هەزار بدرێت بە پاکیی، هەر پیسیت.[١٤٧٧]
کردی بە بنێشتە خۆشەی ژێر ددانی.[١٤٧٨]
کڕین و مامەڵە سەنگی مەحەکە.[١٤٧٩]

---

(١٤٧٣) بە کۆمەڵێك دەوترێت زۆر هیلاکن لە کارەکانیاندا بەڵام بە هەدەر لە دەستییان سەندراوە و مایە پووچ بوون.

(١٤٧٤) واتە ڕەنج و هیلاکیی تەنها کەسێکە بەڵام مرۆڤێکی بێ بەها و هیچوپووچ و بێ عەقڵ دەیخوات.

(١٤٧٥) بە کارێك دەوترێت ئەوەندە دووبارە بکرێتەوە لە شەو و ڕۆژێکدا تامی تێدا نەمێنێت دەوروبەرەکەی بێزار بکات و هەرچی هەڵدەستێت دەستی تێوەردات.

(١٤٧٦) بە کەسێکی درۆزن دەوترێت کە هیچ متمانەی نەماوە لای خەڵك.

(١٤٧٧) کار و کردەوەی مرۆڤ لە کاوی دەکات دەبێتە مۆری ناوچەوان.

(١٤٧٨) بە کەسێك دەوترێت بەسەرهات و گرفت زۆر کاری تێ دەکات و زۆری دەڵێتەوە.

(١٤٧٩) واتە لەگەڵ هەر کەسێك کڕین و فرۆشتن و مامەڵە بکەیت بۆت دەردەکەوێت سەنگ و قورسایی و عیارەی ڕوون دەبێتەوە.

**کاسەی پڕ ئاشتیی ماڵە.[(١٤٨٠)]**

**کاسە پڕ بوو لێی دەڕژێت.[(١٤٨١)]**

**کشە، کشە، پۆپنەڕەشە، میوان ڕۆژێك دوو ڕۆژ خۆشە.[(١٤٨٢)]**

**کاغەزی سپی دەخوێنێتەوە.[(١٤٨٣)]**

**کفنەکەی پێ نەبرا.[(١٤٨٤)]**

**کل لە چاو دەفرێنێت.[(١٤٨٥)]**

**کلکی لە ڕێوی کەمترە.[(١٤٨٦)]**

**کلکی کەر بە دەستەسڕ دەگرێت.[(١٤٨٧)]**

---

(١٤٨٠) بە ماڵێك دەوترێت زۆریان هەبێت و لە هیچیان کەم نەبێت ئەندامەکانی خۆشبەخت و خۆشژیان بن.

(١٤٨١) بە وانە دەوترێت زۆر زوڵم و زۆرداریيان لێ بکرێت، لەدوایدا هەڵچن بە ڕووی بەرامبەرەکەیاندا و حەقی خۆیان بکەنەوە.

(١٤٨٢) بە میوانێك دەوترێت زیاد لە ڕۆژێك دوو ڕۆژبمێنێتەوە و خاوەن ماڵەکە بێزار بێت لە تاوا ڕوو بکاتە مریشکەکانی ئەو قسەیە بکات، کەواتە بە ناڕاستەوخۆ میوانەکە دەربکات.

(١٤٨٣) بە کەسێك دەوترێت زۆر زیرەك و هەستیار بێت.

(١٤٨٤) بە کەسێك دەوترێت زۆر ڕەنجی داوە یان زۆر ڕەزیل بووە یان بەسەرهاتی زەمان کارێکی کردووە بە پارەی خۆی کفنەکەی پێ نەبڕاوە.

(١٤٨٥) بە کەسێك دەوترێت زۆر بە هەڵپە و دز و جەردە بێت لە چاوترکاندنێکدا دزی خۆی بکات.

(١٤٨٦) بە یەکێك دەوترێت زۆر فێڵباز و کەڵەکباز بێت.

(١٤٨٧) بەو کەسانە دەوترێت زۆر پاك و خاوێنن یان زۆر فیزیان زلە.

کاڵەك بە ئەژنۆی خۆی دەشکێنێت.[١٤٨٨]
کاڵەك خۆریت یان بێستانرن.[١٤٨٩]
کڵاوسووری بەر لە شکر.[١٤٩٠]
کڵاوی ئەحمەد دەکاتە سەر مەحمود.[١٤٩١]
کنگر و ماست بە وادەی خۆی.[١٤٩٢]
کانییەك ئاوت لێ خواردەوە بەردی تێ فرێ مەدە.[١٤٩٣]
کوتەك لە بەهەشتەوە هاتووە.[١٤٩٤]
کورد بدوێنە شەرحی خۆی دەکات.[١٤٩٥]
کورد باوانی کوردە، چەند باوان وێرانیش بێت.[١٤٩٦]

---

(١٤٨٨) بە یەکێك دەوترێت کاتێك هەڵەیەك دەکات و دوایی زۆر پەشیمانە.
(١٤٨٩) بە کەسێك دەوترێت بیەوێت دەست بخاتە ناو کاری خەڵکییەوە و هیچ پەیوەندیی بەو کارەوە نەبێت.
(١٤٩٠) بە مرۆڤی هار و وریا و بێ شەرم و بێ چاو و ڕوو دەوترێت.
(١٤٩١) بەو کەسانە دەڵێن هیچ شەرم ناکەن بە ئارەزووی خۆیان یاری بە کەسێتیی و کەسایەتی خەڵکەوە دەکەن.
(١٤٩٢) دوای ڕوودانی گرفت و دڵ ئازاردانی یەکتر کەسێك بە کەسێکی دیکەی دەڵێت: (کاتێك هەر دێت بۆ یەکلاکردنەوەی ئەم کارە).
(١٤٩٣) واتە هەر چی شتێك سوودمەند بوو بۆت، زەرەرت بۆی نەبێت، نرخی بزانە و بە وەفا بە بۆی.
(١٤٩٤) واتە ئەگەر کەسێك پێویستیی سەرشانی خۆی بە جێ نەهێنا دەبێت گوشاری بخرێتە سەر.
(١٤٩٥) کورد ئەوەندە حەقانیی و دڵپاکە هەتا ڕاستیی لەسەر خۆشی دەڵێت.
(١٤٩٦) کورد پەنا هەر بۆ کورد دەبات چەند یەکتر لە تەنگانەشدا ببینن.

کوڕ دەبێت کوڕ بێت، لە ئاشان نۆرەبڕ بێت.[١٤٩٧]
کوڕی باوکی خۆیەتی.[١٤٩٨]
کوڕی سەگە و گورگ دەخنکێنێت.[١٤٩٩]
کوڕی خۆم و ناخۆری خەڵکیی.[١٥٠٠]
کوڕی کاتە.[١٥٠١]
کوڕی کۆڕە.[١٥٠٢]
کۆستی کەوتووە.[١٥٠٣]
کۆنە دەفرۆشێت بە نرخی تازە، هێندە جامبازە.[١٥٠٤]
کون بە سەهۆڵ ناگیرێت.[١٥٠٥]
کون لە جەرگیا نییە.[١٥٠٦]

---

(١٤٩٧) واتە کوڕ و ئازایەتییان وتووە.
(١٤٩٨) دەبێت کوڕ لە باوکی خۆی بکات.
(١٤٩٩) بە کوڕی پیاوێکی ستەمکار دەوترێت کە پیاوێکی زۆردار خەرکەمان بدات.
(١٥٠٠) ئەمە باوکێك دەیلێت کە کوڕەکەی گەورە کردووە و بووە بە خزمەتکاری خەڵکیی و خزمەتی باوکی ناکات.
(١٥٠١) بەو کەسانە دەوترێت لەگەڵ خۆشی کات و زەماندا دەگەڕێن نایانەوێت ئاو بچێتە ژێریان و زەرەر بکەن.
(١٥٠٢) بە کەسێك دەوترێت بگونجێت لەگەڵ هەموو کۆڕ و کۆمەڵێکدا.
(١٥٠٣) واتە خەم و خەفەت دایگرتووە و دنیای بە دڵ نییە.
(١٥٠٤) کەسێکە فرتوفێڵی زۆرە و خەڵکیی چەواشە دەکات.
(١٥٠٥) هەموو کار و گرفتێك بە سەرراستیی دەبێت کۆتایی بێت.
(١٥٠٦) بە یەکێك دەوترێت زۆر ئازا بێت لە هیچ نەترسێت.

**کونه مشکی لیٚ بووه به قەیسەری.**[١٥٠٧]
**کویٚر تا دەمریٚت بە تەمای چاوە.**[١٥٠٨]
**کویٚره چیت دەویٚت؟ دوو چاوی ساغ.**[١٥٠٩]
**کویٚره باوان و شەله باوان.**[١٥١٠]
**کویٚر کویٚر نابات بە ریٚوه**[١٥١١]
**کیسەیٚ بۆ هەڵدرووه.**[١٥١٢]
**کیسەلیی دەروات.**[١٥١٣]
**کیژه کوردەکەی ماڵ لە نۆ هەوار، ماچیٚکم بەریٚ و گاکەت بۆ بکەم بار.**[١٥١٤]

---

(١٥٠٧) به یەکیٚك دەوتریٚت دوای هەڵەکردنی زۆر ترسی لیٚ نیشتووه، نازانیٚت خۆی چۆن دەرباز بکات.
(١٥٠٨) به کەسیٚك دەوتریٚت زۆر به ئاواتی شتیٚکەوه بیٚت لە ژیانیدا بە دریٚژایی تەمەنی چاوەڕوانی دەکات.
(١٥٠٩) هەموو مرۆڤیٚك حەز دەکات و ئاواتەخوازه لە ژیانیدا و لە دنیادا هەموو شتیٚکی بۆ بیٚتەدی.
(١٥١٠) بەو کەسانە دەوتریٚت لە هەموو بەسەرهات و نەهامەتییەکدا ڕوو هەر دەکەنەوه کەسی گەورە و باوان.
(١٥١١) کەسی نەشارەزا و بیٚ توانا ناتوانیٚت ڕیٚ نیشاندەر بیٚت.
(١٥١٢) بەو پیاوانە دەڵیٚن کە کچ دەدەن بە شوو بە مارەییەکی زۆر.
(١٥١٣) واتە زۆر بە هیٚواشی دەڕوات یان کارەکەی زۆر زۆر خاو ئەنجام دەدات.
(١٥١٤) دەگیٚڕنەوه کیژه کوردیٚك گایەکی بارکراوی پیٚ دەبیٚت لە بەینی دوو دیٚدا بارەکە دەخزیٚتە خوارەوه و ناتوانیٚت بیخاتەوه سەر پشتی گاکە، لەو کاتەدا ڕیٚبواریٚك تیٚپەڕ دەبیٚت و پیٚی دەڵیٚت بەو شیٚوەیە و کیژەکەش بەو جۆرە وەڵامی دەداتەوه.

دەك خوا بیبڕێت سوار و خاوەنبار، چەفتەی حەوت برا بۆ تۆ ناكەم.

كێ دەیكات و كێ بردی.[١٥١٥]

كێ كردی و كێ بردی.[١٥١٦]

كێ كێشای جەور و جەفا، كێ كردی سەیروسەفا.[١٥١٧]

كێو بە كێو نەگات، ئادەم بە ئادەم دەگات.[١٥١٨]

كێویك دەرووخێت، كەندەلانێك پڕ دەكاتەوە.[١٥١٩]

كێچ كەوتۆتە كەولی.[١٥٢٠]

كێچێك بە گایەك دەفرۆشێت.[١٥٢١]

---

(١٥١٥) واتە كەسێك هیلاكە و كەسێكی دیكە دێتە سەر حازری و دەیخوات.

(١٥١٦) واتە كەسێك كردوویەتی و ماندوو بووە بەڵام كەسێكی دیكە خستوویەتییە گیرفانیەوە.

(١٥١٧) واتە كەسێك تاڵاوی چێشتووە و كەسێكی دیكە بە خۆشی و سەیروسەفاوە خواردی.

(١٥١٨) بە كەسێك دەوترێت ئاگای لە قسە و كرداری بێت مرۆڤ هەر دەگاتەوە بە مرۆڤ، ڕووبەڕووی یەك دەبنەوە تەنها كێو ناگات بە كێو.

(١٥١٩) واتە بە نەمان و مردنی پیاوێكی گەورە و پایەبڵند و ناسراو، كەسێكی نەناسراو بێ پایە بەرز دەبێتەوە و سەر دەردەكات.

(١٥٢٠) بە یەكێك دەوترێت بیرۆكەیەك دەكەوێتە سەریەوە، دەبێت هەر بیكات ئەگەر كاتی ئەو كارەش نەبێت.

(١٥٢١) بە كەسێك دەوترێت شتەكانی خۆی زۆر بە لاوە گرنگ بێت و زۆر ڕەزیل و گرانجانە.

**کیژچیکی لا بە گایەکە.**[1522]
**کە پارەت دا مەلا لە مزگەوت دەر دەکەیت.**[1523]
**کە پیاو زۆری وت، چاکیش دەڵێت و خراپیش دەڵێت.**[1524]
**کە تازە هات کۆنە خەڵاتە.**[1525]
**کەتنەکەی ئەلە بە ریشم، ئەگەر لێرە دانیشم.**[1526]
**کەچەڵ بە بەختە.**[1527]
**کەچەل دەرمانکەر بووایە، تیماری سەری خۆی دەکرد.**[1528]
**کە چوویتە شاری کوێران، دەبێت دەست بە چاوتەوە بگریت.**[1529]

---

(١٥٢٢) بە کەسێك دەوترێت زۆر دەستنوقاوو ڕەزیل بێت و شتی خۆی بە لاوە زۆر گران و گرنگ بێت.
(١٥٢٣) واتە پارە ڕۆڵێکی گەورە دەبینێت بۆ کاری خێر و شەڕ.
(١٥٢٤) پێویستە هەموو کەس قسە بجوێ و بنێژێ ئینجا دەریهاوێژێ، بۆ ئەوەی نە خۆی سووك بکات نە کەس بێزار بکات.
(١٥٢٥) بە وانە دەوترێت کە دەبنە خاوەنی شتێکی نوێ ئەگەر ژنی یەکەم بێت یان جلوبەرگی بێت ئیتر شتی کۆن بە لاوە دەنێت و دەیبەخشێت.
(١٥٢٦) بە کەسێك دەوترێت زۆر بێزار بێت لە شوێنی خۆی و بیەوێت بە جێی بهێڵێت گوێ نەداتە بەرژەوەندیی خۆی و دوارۆژی.
(١٥٢٧) واتە مرۆڤی کەچەڵ بەختی باشە، شتی باشی بە نسیب دەبێت .
(١٥٢٨) بە کەسێك دەوترێت خۆی هەڵدەقورتێنێتە ناو کاری خەڵکیی بەڵام داماوە لەگەڵ کاری خۆیدا هیچی پێ ساز ناکرێت.
(١٥٢٩) واتە هەر کەسێك چووە هەر شوێنێك یان ناو هۆز و نەتەوەیەك دەبێت وەکو ئەوان هەڵسکەوت بکات بە مانای ئەوە کەسێك ئاسانە خۆی بگۆڕێت بەڵام کۆمەڵ و نەریت بەو ناگۆڕێت.

**که خوا دایتێ پێغەمبەریش چنگێکی دەخاتە سەر.[١٥٣٠]**
**که خوا دایتێ نا پرسێت کوری کێیت.[١٥٣١]**
**که خوا دای لەقەی لێ مەدە.[١٥٣٢]**
**که خوا غەزەبی لە مێروولە گرت، کاتێك دەزانی دەڵێن باڵی گرت.[١٥٣٣]**
**که خەوت هات پێخەفت ناوێت، که برسیت بوو پێخۆرت ناوێت.[١٥٣٤]**
**که هەتیووچە سوار دەبێت، لای لفکەی خوار دەبێت، گەر نەیگریت هار دەبێت.[١٥٣٥]**
**کەری ئەو بارە نیم.[١٥٣٦]**
**کەر بارەکەی شمشێریش بێت، گورگ هەر دەیخوات.[١٥٣٧]**

---

(١٥٣٠) واتە کە تۆ ڕووت کردە خوا پێغەمبەریش لێت ڕازییە.
(١٥٣١) خوا خۆی فەرموویەتی: (یرزق من یشاء).
(١٥٣٢) کە زۆری پێ بەخشیت لووت بەرزی لەئاستیا مەکە.
(١٥٣٣) پێویستە مرۆڤ کارێك نەکات، خوا لێی بڕەنجێت، چونکە بە باری ناهەموار و ناخۆشدا تێپەڕ دەبێت.
(١٥٣٤) هەموو کەسێك کە هەلمەت و شتێکی زۆری بۆ بێت بە ئاسایی مل دەنێت، مەرجی تێدا نامێنێت، کاتی برسێتیش ڕازیت بە هەموو شتێك.
(١٥٣٥) بە کەسێکی هیچ نەدیوو نائەسڵ دەوترێت کە پێدەگات و پلەوپایە وەردەگرێت فێری کرداری ناشیرین دەبێت، ئەگەر لووتی نەهێنیتەوە بەرخۆی دەکەوێتە ملۆزمیش.
(١٥٣٦) واتە من ئەو کارەم پێ هەڵناسوورێت و لە توانامدا نییە.
(١٥٣٧) بە کەسێك یان میللەتێك دەوترێت کە زانا و ژیر نەبن چونکە هەر بە عەقڵ دەتوانێت شمشێر و تفەنگ بەکاربهێنێت.

**کەر بارەکەی کتێب بێت، هەر کەرە.**[١٥٣٨]
**کەر چووە بەغدا، نەبوو بە ئێستر.**[١٥٣٩]
**کەر قەڵەویش بێت، گۆشتی ناخورێت.**[١٥٤٠]
**کەر کوڕی بوو.**[١٥٤١]
**کەر لە کوێ کەوتووە و کوندە لە کوێ دراوە.**[١٥٤٢]
**کەر بە پەیژەدا سەرناکەوێت، بووك و خەسوو ڕێ ناکەوێت.**[١٥٤٣]
**کەر لە ماڵیان بکەوێت ددانی دەشکێت.**[١٥٤٤]
**کەر بە کاروان قەڵەو نابێت.**[١٥٤٥]
**کەر بە جۆ بمرێت شەهیدە.**[١٥٤٦]

---

(١٥٣٨) بەو کەسانە دەوترێت نە خوێندەوارن، سوود وەرنەگرن لە کتێب و بیخوێنندنەوە، ئەگەر کتێبیشیان هەبێت.

(١٥٣٩) واتە نەزان و نەخوێندەوار هەموو دونیا بگەڕێت جۆری ژیانیان ناگۆڕێت.

(١٥٤٠) کەواتە مرۆڤ زانا و دانا نەبێت کەس گوێی لێ ناگرێت.

(١٥٤١) بە کەسێکی بێ عەقڵ دەڵێن کە نەوە لە وێنەی خۆی دەخاتەوە.

(١٥٤٢) بە دوو شت دەوترێت لە هەموو شتێکدا زۆر جیاواز بن.

(١٥٤٣) واتە ئەمە دوو کارە، هەرگیز گونجاندنیان پێکەوە نییە.

(١٥٤٤) بە ماڵێك دەوترێت زۆر نەدار و هەژار و هیچ خواردن و ڕاخەرێك شك نابەن.

(١٥٤٥) هیچ کەسێك بە جارێك و بە ڕێکەوت تێر ناخوات و سوودمەند نابێت، کە خۆی خاوەنی هیچ نەبێت و هەژار بێت.

(١٥٤٦) بە یەکێکی نەوسن دەوترێت کە دەم بژەنێتە خواردنێکەوە دەست هەڵ نەگرێت تا نەخۆشی دەخات.

کەری ئەم بارە نییە.[1547]
کەری خۆمە و گوێی ناڵ دەکەم.[1548]
کەری کێ تۆپیوە.[1549]
کەری تۆپیو جۆ ناخوات.[1550]
کەری دێز تۆپینی خۆیی و زەرەری خاوەنی دەوێت.[1551]
کەری خۆی بەستۆتەوە.[1552]
کەری بێ خاوەن، بارکێشی دەورانە.[1553]
کەرێك بە پارەی بەفر بکڕیتن دەبێت ئاو بیبات.[1554]

---

(١٥٤٧) بە کەسێك دەوترێت ڕاسپاردەیەکی بدرێت بەسەردا لە توانایدا نەبێت بیکات.
(١٥٤٨) کەسێك دەیڵێت هەستێت بە کارێك و سەرزەنشتی بکەن.
(١٥٤٩) بە کەسێك دەوترێت لە ژیانیدا چاکەی لە دەست نەبووبێتەوە، بە ڕێکەوت یەکجار چاکەی کردووە جێی سەرسوورمان بووە.
(١٥٥٠) بە یەکێك دەوترێت کە توانای خواردنی نەما بێت.
(١٥٥١) بەو کەسانە دەوترێت خۆشیان نازانن چۆن ڕەفتار دەکەن و بیرکردنەوەیان کەمە لە کار و کردەوەیاندا ئەنجامیان مردنی خۆیان زەرەری خاوەنیان.
(١٥٥٢) ژن یان پیاو ئەوە دەڵێن دوای هاوسەرگیریی بە مانای ئەوەی هەردووکیان بەستراون بە گرێبەستەوە.
(١٥٥٣) بە کەسێکی بێ خاوەن و ژن و منداڵ و دەوترێت کە هەموو کەس کاری هیلاکیی پێ بکات و هەڵیسووڕێنێت بە ئارەزووی خۆیان.
(١٥٥٤) هەر شتێك بە پارەی حەرام بکڕێت خێر ناداتەوە.

**کەریکم دا بە کەرێ، سنگان لە بنەگوێی دەرێ.**[١٥٥٥]

**کەرم بە قەزاوە دەوێت.**[١٥٥٦]

**کەرویشك بە کلاو دەگریت.**[١٥٥٧]

**کە ڕیش بوو بە تووشەوە، دەبێت شانەی بۆ هەڵگریت.**[١٥٥٨]

**کە زۆر هات قەواڵە بە تاڵە.**[١٥٥٩]

**کە سەر بوو رزقیش دەبێت.**[١٥٦٠]

**کە کەس نەبوو شوو دەکات بە من.**[١٥٦١]

**کەس بە گلەیی نەمردووە.**[١٥٦٢]

**کەس لە سکی دایکییەوە نەیهێناوە.**[١٥٦٣]

---

(١٥٥٥) کەسێك ئەم قسەیە دەکات کە بە گۆڕینەوە و سەربەسەر کارێك بکات بەڵام هیچ چاکە و قازانجی دیار نەبێت.

(١٥٥٦) ئەوانە دەیڵێن کە کچی ماڵی دەوڵەمەند دەخوازن بە ئاڵتون و سەروەتەوە بێنە ماڵەوە بۆیان.

(١٥٥٧) بە کارێك دەوترێت مەحاڵە نییە و جێی سەرسوورمانە.

(١٥٥٨) کە شتێك هاتە ڕێ دەبێت بە ئارام بیت خۆت بگونجێنیت لەگەڵیا.

(١٥٥٩) کاتێك بە زۆر کارێکیان پێ کردی چار نامێنێت دەبێت مل بدەیت و بیکەیت.

(١٥٦٠) خوا سەری کەسی بێ رزق نەکردووە لە شیری دایکییەوە تا ئەو کەسە خۆی نان بۆ خۆی پەیدا دەکات.

(١٥٦١) کەسێك دەیڵێت هیچ کەسێکی پێ ڕازی نەبێت.

(١٥٦٢) واتە گلەیی سابوونی دڵە و نیشانەی ئاشتبوونەوەیە.

(١٥٦٣) واتە هەموو شتێك دوای ڕەنج و هیلاکیی بە دی دێت و بەرهەم دێت.

**کەس بە دەسنگە تێر ناخوات.**[1564]
**کەس کوێریی بۆ چاوی خۆی ناوێت.**[1565]
**کەس پێی نالێت کەرت بە چەند.**[1566]
**کەس لە دەردی کەس ئاگادار نییە.**[1567]
**کەس کەسی تەنگانەیە.**[1568]
**کەس کەس ناباتە بەهەشت.**[1569]
**کەس گۆشتت بخوات، ئێسقانت ناشکێنێت.**[1570]
**کەس گوو بە کڵاوی کەس ناپێوێت.**[1571]
**کەس بە کار و کردەوەی باش نائومێد نابێت.**[1572]
**کەس بە دۆی خۆی نالێت ترشە.**[1573]

---

(١٥٦٤) کەس بە خێر و خوایشت و دەسنگە تەمەن ناباتە سەر.
(١٥٦٥) واتە کەس زەرەری بۆ خۆی ناوێت.
(١٥٦٦) بە کەسێك دەوترێت نرخ و بەهای بۆ دانەنرێت.
(١٥٦٧) واتە هیچ کەسێك لە ژیانیدا بێ گرفت و ئازار نییە.
(١٥٦٨) واتە ئەو کەسە کەستە لە تەنگانەدا لێت ئەپرسێت و بە هاناتەوە بێت، نەك لە کەسی سەر سفرە.
(١٥٦٩) کاری دنیایی کاردانەوەی هەر لەم دنیادا هەیە، بەڵام ڕۆژی قیامەت هەموو کەس لە کار و کردەوەی خۆی بەرپرسیارە.
(١٥٧٠) واتە هەر کەسی خۆت چاکترە لە بێگانە.
(١٥٧١) واتە کەس پرس و ڕای خۆی ناداتە دەست هیچ کەسێك.
(١٥٧٢) هەموو کەسێك بە کار و کردەوەی جوان سەربەرز دەبێت و جێی خۆی دەکاتەوە لە کۆڕ و کۆمەڵدا.
(١٥٧٣) واتە کەس هەست بە هەڵەی خۆی ناکات یان خۆی ناشکێنێت.

کەس ناچێتە قەبری کەس.[1574]
کەس لە پڕێ نابێتە بە کوڕێ.[1575]
کەس کاغەزی کەس ناخوێنێتەوە.[1576]
کەس لە برسا نەمردووە.[1577]
کەس بە وەسێت نامرێت.[1578]
کەس نازیشی هەیە و گازیشی هەیە.[1579]
کەس لە لەشی ساغ نانالێنێت.[1580]
کەس ناتوانێت پێی بلێت بەری چاوت کلی پێوەیە.[1581]
کەسێك بە پیری فێری پلاو خواردن بێت، دەست بۆ لووتی دەبات.[1582]

---

(١٥٧٤) واتە کەس گوناهی کەس هەڵناگرێت هەر یەك لە گوناهو کار و کردەوەی خۆی بەرپرسیارە دوای مردنی.
(١٥٧٥) واتە هیچ کەس کتوپڕ پێ ناگات و بە ئاسانیی گەورە نابێت.
(١٥٧٦) واتە هیچ کەس بە ڕێنمایی کەسانی دیکە ناڕۆن.
(١٥٧٧) هەموو کەس خوا مردنی لە ناوچەوان نووسیوە، بەڵام ڕەنج بدات قەت لە برسا نامرێت.
(١٥٧٨) مردن لە مووی لووت نزیکترە، بەڵام وەسێت کەسی نەکوشتووە.
(١٥٧٩) کەس چاکەشی هەیە و خراپەشی هەیە.
(١٥٨٠) کەسێك گرفتی نەبێت لە خۆیەوە ناتوانێت باسی هیچ گرفتێك بکات.
(١٥٨١) واتە کەسی پا ك و چاك کەس ناتوانێت لەکەداری بکات.
(١٥٨٢) ئەمە پەندێکە لە کوردەواریدا وتراوە، کەوابێت هەرچی شتێك لە منالییەوە دەقی لەسەر بگرێت بە جوانیی، جوانە.

کەسێك کەسە ئەلفێکی بەسە.[١٥٨٣]
کەسێك بە کەم نەزانێت، بە زۆریش نازانێت!.[١٥٨٤]
کەشکیش برای دۆیە.[١٥٨٥]
کە فێرت کرد تێری بکە.[١٥٨٦]
کە گلۆڵەت کەوتە لێژێ، کەس خاست پێ نایژێ.[١٥٨٧]
کە لە دەست من چوو، با سەر بنێت بە هەزارەوە.[١٥٨٨]
کەڵەشێریش نەخوێنێت، رۆژ هەر دەبێتەوە.[١٥٨٩]
کەم دەخۆم، کز دەنیشم.[١٥٩٠]

---

(١٥٨٣) واتە نابێت زۆر بڵێی لەگەڵ هیچ مرۆڤێکدا، بوترێت مرۆڤی عاقڵ ئیشارەتێکی بەسە.
(١٥٨٤) بە کەسێك دەوترێت هەرچی چاکەیەکیشی لەگەڵ بکەیت پێی نازانێت کەم و زۆری لا نییە.
(١٥٨٥) بە کەسێك دەوترێت خزم و کەسی زەلامێکی خراپ سروشت بێت، واتە جیاوازیی نییە لە بەینیانە وەك یەکن.
(١٥٨٦) واتە خۆت شل مەکە بۆ کەسانێك تەنها فێری وەرگرتن بن، چونکە دەست هەڵناگرێت، با فێری یەکسانیی بن، فێری با فێری چاوشۆریی نەبن.
(١٥٨٧) واتە هەر مرۆڤێك تووشی گرفتەکانی ژیان هات و ڕوو لە سەرکەوتن نەبوو، هەرچی هەڵدەستێت بەردێکی تێ دەگرێت.
(١٥٨٨) بە شتێکی بەنرخ دەوترێت بەڵام کاتێك لە دەست دەرچوو تۆش قیروسیا لە بەها و نرخی دەکەیت و دەستی لێ دەشۆیت.
(١٥٨٩) کەسێك دەیڵێت هیوای بە یارمەتیی کەسێکی دیکە نەمێنێت و تەنها بە تەمای خوا بێت و چاوەڕوانی بێت.
(١٥٩٠) واتە بە پێی حاڵی خۆم دەژیم.

**کەم بڵێ و زۆر ببیستە.**(١٥٩١)

**کەم خۆری دائیم خۆر.**(١٥٩٢)

**کە بژی و کەڵ بژی.**(١٥٩٣)

**کەم چیکڵدانە.**(١٥٩٤)

**کە ماری بەستوو کەوتە بەر هەتاو، ئامانی نییە بۆ ژن و بۆ پیاو.**(١٥٩٥)

**کەماڵت بوو کەماڵ بوو، کە ماڵ چوو کەماڵ چوو.**(١٥٩٦)

**کەم بخۆ زۆر بژییت.**(١٥٩٧)

**کەو ئەو کەوەیە بەرامبەر بە کەو بخوێنێت.**(١٥٩٨)

---

(١٥٩١) واتە زۆر گوێ بگرە و کەم قسە بکە.

(١٥٩٢) واتە ئەوەندە بخۆ برسیت نەبێت، کاتی برسیتیی زۆر مەخۆ.

(١٥٩٣) واتە بە سەرشۆڕیی مەژی لە پێناو تەمەندا

(١٥٩٤) بە کەسێك دەوترێت بە درێژایی ژیانی تووڕە بێت و قسەی لەگەڵ نەکرێت.

(١٥٩٥) بەو کەسانە دەوترێت لە سەرەتای هاوڕێیەتییان زۆر بێدەنگن و مەنگ و بێ زیانن، بەڵام کە دەکرێنەوە، شەرم لە کەس ناکەن و هەنگاوی ناپەسەند دەنێن.

(١٥٩٦) مرۆڤ کاتێك ماڵ و حاڵی خۆی هەبێت خاوەنی کە ماڵی نەفسی خۆیەتی، بەڵام کەماڵ و حاڵی لە دەست چوو کە ماڵی نامێنێت لای هیچ کەسێك.

(١٥٩٧) واتە زیادخۆریی مەکە با لە پزیشك و حەکیم و چارەسەریی دووربیت.

(١٥٩٨) کەواتە مرۆڤ ڕوو بە ڕوو قسەی خۆی بکات ، نەك لە پاشملە.

کەوتۆتە سەر ساجی عەلی.[1599]
کەوانی من و تیری ئەویان نەوتووە.[1600]

---

(١٥٩٩) بە کەسێك دەوترێت دوای کار و کاسبییەك پارە و پوولی لە گیرفاندا نەمێنێت، خۆی پێ نەبرێت بە ڕێوە.
(١٦٠٠) بە یەکێك دەوترێت لەیەك ئاستدا نەبن لە هیچ بار و ڕوویەکەوە.

# پیتی (گ)

**گا بده بە گامردە، ژن بدە بە ژن مردە.**(١٦٠١)
**گا بە تەنیا گێرە ناکات.**(١٦٠٢)
**گا بە گون دەناسێت.**(١٦٠٣)
**گا رەنگی گا ناگرێت، خووی دەگرێت.**(١٦٠٤)
**گازێشی هەیە و نازیشی هەیە.**(١٦٠٥)
**گا گێرەی کرد و کەر خواردی.**(١٦٠٦)
**گا لە گاگەل بە جێ بمێنێ، شاخی خۆی دەشکێنێ.**(١٦٠٧)
**گا گوراوە و کلکی ماوە.**(١٦٠٨)

---

(١٦٠١) بە کەسێك دەوترێت شتێك گرنگ بوو بێت بە لایەوە و لە دەستی دەرچوو بێت هەروەها ژنی چاك کە پیاوەکەی قەدری زانیووە.

(١٦٠٢) واتە هیچ کارێك بە تەنها بە مرۆڤ پێی هەڵناسوورێت و ناکرێت.

(١٦٠٣) بە کەسێك دەوترێت زۆر گێل بێت.

(١٦٠٤) هەر کەسێك هاورێیەتی پیاو خراپ بکات خووی دەگرێت، نەك رەنگی بگرێت.

(١٦٠٥) واتە خراپەیشی هەیە و چاکەیشی هەیە.

(١٦٠٦) واتە کەسێکی رەنجدەر هیلاك بووە و نەزانێك و کەمهۆشێك خواردی.

(١٦٠٧) واتە هەموو مرۆڤێك لەگەڵ هەنگاوەکانی میللەتەکەیدا بروات و لە کۆمەڵی خۆی دووا نەکەوێت و هەڵگەرێتەوە.

(١٦٠٨) بە کارێك دەوترێت جێبەجێ بووبێت تەنها کەمێکی ما بێت.

**گا گووی کرد، دنیای پیس کرد.**[١٦٠٩]
**گا لە کلاورۆژنەوە سەر دەخات.**[١٦١٠]
**گای یەك ئاخورن.**[١٦١١]
**گالیش زادی خوایە؟**[١٦١٢]
**گا لە گاگەل دواکەویت گورگ دەیخوات.**[١٦١٣]
**گرەو لە شەیتان دەباتەوە.**[١٦١٤]
**گریی بەختی کرایەوە.**[١٦١٥]
**گزگل بکەیت بە گویزەبانە.**[١٦١٦]
**گشت شتیك فەرزە، شایی و شین قەرزە.**[١٦١٧]

---

(١٦٠٩) بە کەسیك دەوتریت چاوەروانی فەرمایشتەکەی بکەن بەلام قسەیەکی ناپەسەند دەردەپەرینیت.
(١٦١٠) واتە دزیکی زۆر چالاك و شارەزایە.
(١٦١١) بە دوو کەس دەوتریت هەموو کار و کردەوە و سروشتیان وەك یەك بیت.
(١٦١٢) کەسیك بە کەسیك دەلیت کە بە چاوی سووك سەیری خزمی خۆی نەکات.
(١٦١٣) واتە هەر کەسیك لە ریرەوی میلەتەکەی خۆی دووا نەکەویت بۆ ئەوەی زەرەر نەکات.
(١٦١٤) بە کەسیك دەوتریت زۆر فیلباز و کەلەکچی بیت.
(١٦١٥) زیاتر بەو کەسانە دەوتریت کە ژن دەهینن یان شوو دەکەن.
(١٦١٦) بە کەسیك دەوتریت بە ریکەوت کاریکی چاکەی لە دەست بیتەوە.
(١٦١٧) واتە هەموو کار و پەیوەندییەکی مرۆڤ ئاساییە بەلام شایی و شین دەبیت لەگەل یەکتردا بە بەرامبەر بیت.

**گلەیی سابوونی دڵە.**[1618]
**گلی گرتووە.**[1619]
**گڵی دوور دەرمانە.**[1620]
**گڵی ژن و مێرد لە گڵنجانێك هەڵدەکەندرێت.**[1621]
**کە گڵۆڵەت کەوتە لێژێ، کەس خاست پێ نایژێ.**[1622]
**گڵەبانی کردووە.**[1623]
**گوڵ لەسەر لق ڕەنگینە، بەرد لە جێی خۆی سەنگینە.**[1624]
**گوڵە عاشقە لە خۆی بە شکە.**[1625]
**گوڵە ژاڵە جوان و ئاڵە بەڵام تاڵە.**[1626]

---

(١٦١٨) کە سانێك گلەیی دەکەن حەزیان لە شەڕ و ئاژاوە نییە داوای پاساوێك لە بەرامبەرەکەیان دەکەن دڵیان پاك بێتەوە.
(١٦١٩) واتە ملی ناوە بۆ خراپەکاریی و بە قسەی کەس ناکات.
(١٦٢٠) بە کەسێك دەوترێت کە بڕوایان بە دەرمان و شتی دوور و بێگانە بێت.
(١٦٢١) دەبێت ژن و مێرد هاوبیر و هاو سروشت بن.
(١٦٢٢) بە کەسێك دەوترێت کە باری دەگلێت ژیانی سەرەوخوار دەڕوات خەڵکیی دەکەوێتە زەمی و مەدحی ناکەن.
(١٦٢٣) بە شتێك دەوترێت بە شتێك ڕووکەشی داپۆشرا بێت.
(١٦٢٤) واتە هەموو کەسێك بە بەرزیی و بڵندیی جوانیی دەنوێنێت و هەموو کەسێکیش سەنگ و حورمەتی لە شوێنی خۆیدا هەیە.
(١٦٢٥) بە کەسێکی عاشق دەوترێت لە هەر شوێنێك باسی عەشق بکرێت وا تێ دەگات باس هەر باسی ئەوە.
(١٦٢٦) واتە ڕووکەش جوانیی مەرج نییە بۆ مرۆڤ، سوود و خێر مەرجە.

**گول گولیی مەروانە، لە هەوڵ و گوڕی بڕوانە.**[1627]
**گونی گوندار دەردەهێنێت.**[1628]
**گونی خوێی و گێزەر جیا ناکاتەوە.**[1629]
**گونی بۆ دەدات لە خوم.**[1630]
**گورگ دەڵێت نا دیارم...! لە کاری خۆم شەرمەزارم.**[1631]
**گوێی دەڵێیت گوێی مشکە.**[1632]
**گورچکی پڕە.**[1633]
**گوریس لە کوێدا پچڕا گرێی بدەرەوە.**[1634]
**گوریس لە باریکیدا دەپچڕێت، زوڵم لە ئەستووریدا.**[1635]
**گوریسێکی داخستووەن دنیای هەموو تێخستووە.**[1636]

---

(١٦٢٧) وا تێ مەگە کەسێك بە قەوارە و باڵا نابووت بێت لە هەموو شتێکدا بێ دەسەڵاتە ئەمڕۆ بیر و خوێند و زانین لە ئارادایە.
(١٦٢٨) بە کەسێك دەوترێت نەترس و ئازا و جەربەزە بێت.
(١٦٢٩) بەو کەسانە دەوترێت زۆر گەمژەڵ و گێل بێن.
(١٦٣٠) بە کەسێك دەوترێت نرخ بۆ مردووەکەی دانانێت.
(١٦٣١) بە کەسێك دەوترێت کارێکی ناشیرین و ناپەسەندی کرد بێت، ڕووی ناو خەڵك و مەجلیسی نەبێت.
(١٦٣٢) بە کەسێك دەوترێت زۆر هەستیار و زیرەك و وریا بێت.
(١٦٣٣) واتە تێرە و کەسی بە خەیاڵدا نایەت.
(١٦٣٤) واتە کە تووشی گرفتێك بوویت مەیهێڵەرەوە زوو چارەسەری بکە.
(١٦٣٥) هەموو شتێك لە باریکیدا دەپچڕێت بەڵام زوڵم و زۆرداری هەموو کەس بەرەنگاری دەبێتەوە بە ستەمی دەزانن و نایهێڵن.
(١٦٣٦) بە پیاوی چاوچنۆك و حەرامخۆر و تەماعکار دەوترێت.

**گوێزی بەسەر گومەزدا هەڵدەدات.**[١٦٣٧]
**گوێز بە ژمارە، مایەی دیارە.**[١٦٣٨]
**گوێی لێ خەفاندووە.**[١٦٣٩]
**گووی کردە کاسە.**[١٦٤٠]
**گوو ناکات، نەوەکو برسی بێت.**[١٦٤١]
**گورەی داوێنی دێت.**[١٦٤٢]
**گورگ پیر بوو، دەبێتە گاڵتەچی سەگان.**[١٦٤٣]
**گورگ و مەڕ پێکەوە ئاو دەخواتەوە.**[١٦٤٤]
**گورگە و لە پێستی مەڕدایە.**[١٦٤٥]

---

(١٦٣٧) واتە قسەیەکی نابەجێ دەکات ناچێت بە عەقڵی کەسدا.
(١٦٣٨) واتە ئەو کەسەی لە کار و کاسبی خۆی بە ئاگا بێت ئەمانجی دیارە.
(١٦٣٩) بە کەسێك دەوترێت شتێکی پێ وتراوە و خۆی لێ کەڕ کردووە و نایەوێت جێبەجێ بکات.
(١٦٤٠) بەو کەسانە دەوترێت دوای ڕاوتەگبیر کارکردن بۆ شتێك، بە وشەیەك یان بە کردارێك هەموو تێك دەدەنەوە.
(١٦٤١) بە مرۆڤێکی زۆر ڕەزیل و چروك دەوترێت.
(١٦٤٢) بە کەسێکی گورجوگۆڵ و ئازا دەوترێت.
(١٦٤٣) بە کەسێکی زاڵم و زۆردار دەوترێت کاتێك پیر و بێ توانا دەبێت حەقی خۆیانی لێ دەکەنەوە.
(١٦٤٤) واتە ئەوەندە ئاشتەوایی و خۆشی جێگرە، دوژمن و دۆست بەیەکەوە دەژین.
(١٦٤٥) واتە دوژمنە و خۆی بە پیاوی چاك دەردەخات.

**گوێرەکەی بێگانە، گوێرەوسار دەپچڕێت.** [(١٦٤٦)]

**گوێزێك بشکێنە و بەختی لێ ببێنە.** [(١٦٤٧)]

**گۆڕ هەڵتەکێنە.** [(١٦٤٨)]

**گۆڕی گومە.** [(١٦٤٩)]

**گۆزەش برای دیزەیە.** [(١٦٥٠)]

**گۆزە هەموو جارێك لە کانیی بە ساغی ناگەڕێتەوە.** [(١٦٥١)]

**گۆشتی ڕانی خۆم بخۆم، لە منەتی قەساب چاکترە.** [(١٦٥٢)]

**گۆشتی بۆ تۆ و ئیسقانی بۆ من.** [(١٦٥٣)]

**گۆشتی ناخوات، گۆشتاوی دەخوات.** [(١٦٥٤)]

---

(١٦٤٦) واتە منداڵی بێگانە بەخێو مەکە، چونکە سفرە دڕ و سپڵە دەردەچێت.

(١٦٤٧) واتە پێش ئەوەی هەستیت بە کارێك بیری لێ بکەرەوە، کتوپڕ پەلاماری هیچ کارێك مەدە.

(١٦٤٨) بە کەسێك دەوترێت دوای ڕەنجێکی زۆر بمرێت، کەسێکی هیچوپووچ لە دوایەوە بیخوات و یاری پێ بکات.

(١٦٤٩) واتە دەمێکە دیار نییە و خۆی شاردۆتەوە.

(١٦٥٠) بە دوو کەس دەوترێت لە کردەوە و شێوە و سروشتدا جیاوازییان نییە.

(١٦٥١) واتە هەموو جارێك لە هەموو شتێکدا و سەفەرێکدا قازانج ناکرێت.

(١٦٥٢) کەسێك دەیلێت کە بە بەشی خۆی و ڕەنجی خۆی ڕازی بێت و چاوشۆڕ و سەرشۆڕ نەبێت لە ئاستی هیچ کەسێکدا.

(١٦٥٣) ئەمە ئەو خێزانە یان ئەو دایك و باوکانە دەیلێن کە لە ڕووی پەروەردەییەوە لاواز ز بێ دەسەڵاتن لە ئاستی منداڵەکانیان.

(١٦٥٤) کەسێك دەیلێت خۆی سوودمەند بێت لە شتێکدا بەڵام منەت نەزانێت.

**گۆشتی یەکتر بخۆن، ئێسقانی یەکتر ناشکێنن.[1655]**
**گۆشتیان پێکەوە بکوڵێت، ئێسقانیان جیا دەبێتەوە.[1656]**
**گۆم تا قووڵ بێت، مەلەی خۆشە.[1657]**
**گیا رەشە بە دەمی مەڕ خۆشە.[1658]**
**گیا لەسەر بنجی خۆی دەڕوێتەوە.[1659]**
**گیرفانی بۆ هەڵدرووە.[1660]**
**گیرفانی قووڵە.[1661]**
**گەرمیان و کوێستان دەکات.[1662]**
**گەرما ئاوی سارد دەخاتە برەو.[1663]**

---

(١٦٥٥) بە کەسانێك دەوترێت خزم و کەسی یەکتر بن، یەکتر بە هیلاك دەبەن بەڵام یەك نافەوتێنن و یەکتر ناکوژن.
(١٦٥٦) بە دوو کەس دەوترێت زۆر ناکۆك بن لەگەڵ یەکتردا.
(١٦٥٧) واتە گرفت چەند گەورەتر بێت، دەتوانیت هەنگاو بنێیت.
(١٦٥٨) هەندێك کەس وا هەڵدەکەوێت زۆر خۆشەویست و مەبەست پەسەندە بە لای زەلامێکەوە بەڵام پەسەند و گرنگ نییە لای کەسانی دیکە.
(١٦٥٩) واتە هەموو منداڵێك و نەوەیەك وەك باوباپیرانی خۆی دەردەچێت.
(١٦٦٠) واتە تەماعی زۆرە بۆ ئەو کارەی کە دەیکات.
(١٦٦١) بە کەسێکی زۆر چروك و ڕەزیل دەوترێت.
(١٦٦٢) بە کەسێکی خۆپەرست دەوترێت نایەوێت نە گەرمای بێت، نە سەرمای بێت. نە کار بکات و نە هیلاك بێت.
(١٦٦٣) لە تەنگانەدا بە پیرەوەهاتن و دڵنەوایی، نرخی خزم و کەست و هاوڕێت بۆ دەردەکەوێت.

گەر کاری چاکمان نەبێت، ناونیشامان ون دەبێت.(١٦٦٤)
گەری بارە ترێ یە.(١٦٦٥)
گەڕۆك یان کوڵ دەهێنێتەوە یان زۆڵ دەهێنێتەوە.(١٦٦٦)
گەز، گەز باڵا دەکات.(١٦٦٧)
گەزۆ بە دەمی تاڵە.(١٦٦٨)
گەزی چی و جاوی چی.(١٦٦٩)
گەورەیی بە تەمەن نییە.(١٦٧٠)
گەورەیی بە عەقڵە، نەك بە ساڵ.(١٦٧١)

---

(١٦٦٤) واتە کاری چاك بۆ مرۆڤ تەنها ناونیشانە دوای مردنی.
(١٦٦٥) لە کۆندا لە هەر بارێك باج سەندراوە، بەڵام خاوەن بار بۆ ئەوەی باجی لیٚ نەسەنن بارە ترێی گۆڕیوە بە شتێك باجی نەبووە.
(١٦٦٦) ئەمە بە زۆری بە ئافرەت وتراوە کە زۆر نەگەڕێت و هەموو شوێنێك نەچێت پارێزگاریی لە خۆی بکات لە سنووری حورمەتدا.
(١٦٦٧) واتە کەوتۆتە ناز و جیازێکی زۆر بێسنوورەوە، لە خۆشیدا نازانی چی بکات.
(١٦٦٨) بە کەسێك دەوترێت گرفت و خەم و پەژارەکەی ئەوەندە خەستە تام لە شیرینیش ناچێژێت.
(١٦٦٩) بەو کەسانە دەوترێت بیرکردنەوە و بەرژەوەندییان زۆر لە یەکتر دوور و جیاوازە.
(١٦٧٠) واتە مەرج نییە کەسێکی بە تەمەن زۆر ژیر بێت، ژیریی مرۆڤ بە کردارە.
(١٦٧١) پایەبڵندیی و گەورەیی مرۆڤ بە ژیرییە، نەك بە ساڵ و تەمەن.

**گەورە ئاو دەڕێژێت و بچووک پێی لیٚ دەخات.**[١٦٧٢]
**گەورە قەدری خۆی بە خۆیەوەیەتی.**[١٦٧٣]
**گەوهەری خۆت مەدۆڕێنە.**[١٦٧٤]
**گەوهەر لەناو قوڕیشدا ون نابێت.**[١٦٧٥]

---

**(١٦٧٢)** واتە گەورە دەبێت کار و کردەوەی جوان بێت، بۆ ئەوەی بچووک بە ڕێڕەوی ئەودا بڕوات و چاوی لیٚ بکات.
**(١٦٧٣)** کەواتە گەورە نابێت کارێك بکات منالٚ گاڵتەی پیٚ بکات، هەموو کردارێك بە پێی تەمەن.
**(١٦٧٤)** مرۆڤ نرخ و گرنگیی و کەسێتیی خۆی بە دەست خۆیەتی لە قسەکردن و هەنگاوەکانیدا دەردەکەوێت.
**(١٦٧٥)** واتە کەسی دانا و زانا و بەنرخ جلەکانی قوڕاویش بێت ناشکێت.

# پیتی (ل)

**لای کوورەوە بیت، پریشکت هەر بەردەکەویت.**[١٦٧٦]
**لات پالەوانی خوا.**[١٦٧٧]
**لخاوی شەیتان کراوە، رەنجی خۆی هیچ پێ نەبڕاوە.**[١٦٧٨]
**لنگە کەوشێکی لە دیوانا هەیە.**[١٦٧٩]
**لووتیم لە بەردی ئەلحەد دا.**[١٦٨٠]
**لووتی خوارە لیمان.**[١٦٨١]
**لووتی لە ئاسمانە.**[١٦٨٢]

---

(١٦٧٦) ئەمە ڕێنماییە بۆ کەسانێك خۆیان هەڵنەقورتێنن لە شەڕ و ئاژاوەی خەڵکیی دیکە.
(١٦٧٧) بە کەسێك دەوترێت لە دنیادا هیچ شك نابات و خاوەنی هیچ شتێك نییە، دنیا و زەمان بە هەر ئاستێکدا بڕوات و ترسی نییە.
(١٦٧٨) بە کەسێك دەوترێت بە درێژایی ساڵ ڕەنج بدات و بە خۆی ڕانەبینێت بیخوات.
(١٦٧٩) بە کەسێك دەوترێت لای کاربەدەستێکی گەورە کەوتووە، کەمێك دەستڕۆیشتووە.
(١٦٨٠) کەسێك بە کەسێکی دیکە دەڵێت وام تەریق کردۆتەوە هەتا هەتایە نەتوانێت بێتەوە ناو کۆڕ و کۆمەڵ.
(١٦٨١) بە کەسێك دەوترێت کە لاری لە کۆمەڵەکەی و هاوڕێکانی خۆی هەیە.
(١٦٨٢) بە کەسێك دەوترێت هیچ کەسێك بە هاوڕێ و هاوسەنگی خۆی نەزانێت.

لووتی لە کورە کاژاوە.(١٦٨٣)
لووتی بگریت رۆحی دەردەچێت.(١٦٨٤)
لووتی گوێژە دەکێڵێت.(١٦٨٥)
لووتی لێی دەخورێت.(١٦٨٦)
لووت بەرز مەبە لە ئاستی زەوی، کاتێ کە مردی خۆراکی ئەوی.(١٦٨٧)
لووتی چۆتە کەشکەلانی فەلەك.(١٦٨٨)
لیرە لە قوڕیشدا دیارە.(١٦٨٩)
لێخورە دەشێتە.(١٦٩٠)
لێدەنێ لە حەوشیگەورە، یا پراخە و دووگی چەورە.(١٦٩١)

---

(١٦٨٣) بە کەسێك دەوترێت لەگەڵ هاورێی و هاوتەمەنیدا مامەڵە ناکات.
(١٦٨٤) بە کەسێك دەوترێت زۆر بێ هێز و لاوازە.
(١٦٨٥) بە کەسێکی نابووت دەوترێت کار لەگەڵ کەسانێك بکات کە ئەو کارە بە کاری ئەو نەشێت.
(١٦٨٦) واتە ئارەزووی هەیە بۆ کارێك.
(١٦٨٧) ئەمە هەم پەندە و هەم هۆنراوەیە و هەم خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەمەرمووێت: (لاتصعر خدك للناس ولاتمشي في الارض مرحاً).
(١٦٨٨) واتە ئەوەندە لووتی بەرزە خۆی لە بیر چۆتەوە کە لەسەر زەوی دەژی.
(١٦٨٩) هەموو شتێکی باش و جوان و بەنرخ لە هەر شوێنێکدا بێت بەهای ناگۆڕێت و ناشێوێت.
(١٦٩٠) واتە برۆ و مەترسە و سڵ مەکەرەوە و هیچ ڕوو نادات.
(١٦٩١) بە کەسانێك دەوترێت کاتێك کارێکی خێریان کرد با بە فراوانیی و چاو نەترسانە و ئازایانە دەستی بدەنێ و خێری خەڵکیشی تێدا بێت.

**لێم چۆتە چەقی لەعنەت.**[١٦٩٢]
**لێم بووە بە مووی لووت.**[١٦٩٣]
**لێم چۆتە دارێ و نایەتە خوارێ.**[١٦٩٤]
**لێو بە ددان دەکرۆژێت.**[١٦٩٥]
**لێی بووە بە کوردە ناموسێ.**[١٦٩٦]
**لە ئاووهەوای خۆیایەتی.**[١٦٩٧]
**لە ئاوی خور مەترسە، لە ئاوی مەنگ بترسە.**[١٦٩٨]
**لە ئاوی مەنگ و پیاوی مۆن بترسە.**[١٦٩٩]

---

(١٦٩٢) کەسێك دەیڵێت کە بەرامبەرەکەی زۆر قینی هەستاوە و یاخی بووە لێی.
(١٦٩٣) کەسێك دەیڵێت بەرامبەری لە کۆڵی نابێتەوە.
(١٦٩٤) کەسێك دەیڵێت بەرامبەرەکەی بە قسەی ناکات و دەیەوێت بە مەرامی خۆی کار بکات، ئەمیش ڕازیی نییە.
(١٦٩٥) بە کەسێك دەوترێت هەڵەیەکی کرد بێت و زۆر پەشیمان بێت و داوای لێبووردنیش ناکات.
(١٦٩٦) بە کەسێك دەوترێت هەڵەیەك بکات و پەشیمانیی خۆی دەرنەخات وا خۆی دەربخات هەر سوورە لەسەر هەڵەکەی.
(١٦٩٧) بە کەسێك دەوترێت هەموو شتێك بە ئارەزووی دڵی خۆیەتی.
(١٦٩٨) واتە لە و کەسانە مەترسە هەڵە و توورەنن لە کەسی مەنگ و بێدەنگ بترسە.
(١٦٩٩) واتە لە ئاوی ڕاوەستاو و پیاوی گرژ و مڕومۆچ بترسە.

**لە ئاش دوا کەوتووە لە ڕێگا پەلە دەکات.**(١٧٠٠)

**لە ئەسپ دابەزیم سواری کەر بووم.**(١٧٠١)

**لە ئەسپی نەبوو، ئاخور هەڵدەبەستێت.**(١٧٠٢)

**لە ئێستریان پرسی، باوکت کێیە؟ وتی: خاڵم ئەسپە.**(١٧٠٣)

**لە بەراز موویەك بێتەوە... هەر باشە.**(١٧٠٤)

**لەبەر خاتری خاتران، چوومە سەر دینی کافران.**(١٧٠٥)

**لەبەر خاتری حانەومانە، ڕیشم دانا لە بەینیانا.**(١٧٠٦)

---

(١٧٠٠) بە و کەسانە دەڵێن پێشتر کار و بەرنامەیان دواخستووە لە ئەنجامی سستی و تەمەڵییان، دوایش دەکەونە پەلەپەل.

(١٧٠١) بە کەسێك دەوترێت کە شانسی یەکەمی چاکتر بووە لە دووەمی، پەشیمانە بۆ یەکەم.

(١٧٠٢) بە پیاوێك دەوترێت دەستنیشانی ژنی نەکردووە پێشوەخت ماڵ و خانوو پێکەوە دەنێت.

(١٧٠٣) ئەمە بۆ کەسێکە لای نەنگ بێت ناوی کەسوکاری بەدناوی خۆی بەرێت... چونکە ئێستر لە جووتبوونی کەر و ئەسب دروست دەبێت! واتە هەموو کەس شانازیی بە کەسی باشەوە دەکات.

(١٧٠٤) بە کەسی دڵڕەق و ڕەزیل دەوترێت کە چاکەیەك یان خێرێکیان لە دەست نابێتەوە و بە زەرەری دەزانن.

(١٧٠٥) بەو کەسانە دەوترێت کە سوور دەزانن ئەو کارەی دەیکەن هەڵەیە بەڵام ناچارن لەبەر خاتری کەسێك دەیکەن کە بەلایەوە گرنگە.

(١٧٠٦) بە کەسێك دەوترێت پەیوەندیی بەهێزی هەبێت لە بەینی دوو دۆستیا و ناتوانێت دەستیشیان لێ بەر بدات و ئامادەیە تەنها خۆی زەرەر بە خۆی بگەیەنێت.

**له بەغداش خورما زۆره.**[1707]

**له بەختانمانه.**[1708]

**له بەختەکەی خۆم وا ڕادەبینم، بچمه سەر سیروان هیچ ئاو نابینم.**[1709]

**له بنی هەمانەکەی دا.**[1710]

**له بەینی دووانا، سەریشی دانا، زۆر پەشیمانه.**[1711]

**له بنی کوولەکەکەی دا.**[1712]

**له پارەوە دوو ساڵه.**[1713]

**له پاش ترێ، خشەی بڕێ.**[1714]

---

(١٧٠٧) واته شتی زۆر و حازربەدەست هیلاکیی تیادا نەبێت و بۆی نەگەڕێت منەتی نییه.

(١٧٠٨) به یەکێك دەوترێت که ڕەنج و تەقەلایەکی زۆری له پێناوی کەسێکی دیکەدا دابێت، هێشتا قسەشی پێ بوترێت لەبری پاداشت.

(١٧٠٩) ئەمه کەسێك دەیڵێت ژیانی سەرتاپا پڕ بوو بێت له ناهەمواریی و تروسکەی ڕووناکیی هیوا له ژیانیدا ڕانەبینێت.

(١٧١٠) واته هیچی تیادا نەهێشتۆتەوه بۆ دوایی.

(١٧١١) کەسێکی ناوبژیکەر دەیڵێت که له ناوبژێکەدا زەرەرمەند بووه و پیاو خراپیشی بۆ ماوەتەوه.

(١٧١٢) واته زۆر به ڕاشکاویی و ڕوون دووا له وتەکەیدا.

(١٧١٣) به کەسێك دەوترێت که ڕاستگۆ نەبێت له ڕووداوی مێژوو و ڕۆژاندا، بۆ ئەوەی به تەمەن گەوره نەناسرێت.

(١٧١٤) واته دوای هەڵه و تاوان، تەنها لێبوردن بەس نییه به کۆتایی شتەکه.

**لە پاش مردن رەحمەت چاکە.[1715]**
**لە پەنجەی ساغ کرم دەردەهێنێت.[1716]**
**لە پردی نامەرد مەپەڕەرەوە، جەردە رووتت کات با لەم بەرەوە.[1717]**
**لە پرێ، نابێت بە کوڕێ.[1718]**
**لە تاو پلاو ترش دەکاتە ئاو.[1719]**
**لە تاو نەوس، کەوتە حەوز.[1720]**
**لە تەڕ دەخوات و لە وشك دەنوێت.[1721]**
**لە تۆ حەرەکەت، لە خوا بەرەکەت.[1722]**
**لە جێی سنگان، قوزەڵقورتە.[1723]**

---

(1715) واتە هەموو کەس کە دەمرێت و هەموو کەسێکیش بە مردوو دەوێرێت، ئەوە ئازایەتی نییە، (ڕەحمەت بوو لە مردوو).
(1716) بە کەسێك دەوترێت زۆر وریا و زیرەك و بلیمەت بێت.
(1717) واتە مرۆڤ بە زەرەرمەندی خۆی ڕازی بێت، نەك چاوشۆڕ بێت لەبەر پێی نامەردا.
(1718) واتە هەموو کەسێك بە ڕەنج و کۆششی بەردەوام پێ دەگات و دەگات بە ئامانج، نەك کتوپڕ.
(1719) بە کەسێك دەوترێت کە تامەزرۆی شتێك بێت نەیبێت و بە شتێکی دیکە دڵی خۆی خۆش دەکات.
(1720) بە کەسێکی نەفس نزم و نەوسن دەوترێت کە خۆی دانێت لەپێناویدا.
(1721) بە یەکێکی تەمەڵ و بێ ویژدان و ئیشنەکەر دەوترێت لەسەر شانی ئەم و ئەو بژی.
(1722) واتە مرۆڤ بیەوێت کار بکات و بجووڵێت نائومێد نابێت.
(1723) واتە پادداشتی خراپە هەر خراپەیە.

لە جێیەك شینە و لە جێیەك شایی.[1724]
لە جێیەك نانوێت ئاو بچێتە ژێری.[1725]
لە چاوی خۆیەوە سەیر دەکات.[1726]
لە حەوت ئاوی داوە قولەپێی تەڕ نەبووە.[1727]
لە خراپەی ئەوە بترسە کە چاکەی لەگەڵ دەکەیت.[1728]
لە خشەی گەڵا دەترسێت.[1729]
لە خۆشیانا پێی ناکەوێتە سەر ئەرز.[1730]
لە خۆشیانا گەشکە دەیگرێت.[1731]
لە دەرگاوە دەچێتە ژوورەوە.[1732]

---

(١٧٢٤) واتە شین و شایی لە هەموو شوێنێکە و بۆ هەموو کەسێکە.
(١٧٢٥) بە یەکێك دەوترێت زۆر بە ئاگا و دووربین بێت.
(١٧٢٦) بە یەکێك دەوترێت کە کەسێکی خۆش بوێت یان خوشی نەوێت.
(١٧٢٧) واتە زۆر شارەزای ژیان و دنیایە و کارامەیە.
(١٧٢٨) کە رابێت ئەوەی چاکەی لەگەڵ بکەیت و بەرامبەر چاکە خراپەت دەرهەق بکات زۆر مەترسیدارە.
(١٧٢٩) بە کەسێکی دوژمندار دەوترێت دوژمنایەتیی کۆنی هەبوو بێت.
(١٧٣٠) ئەمە بۆ کەسێکە بگات بە ئاواتێکی چاوەڕواننەکراو، لە خۆشیانا تووشی گەشکە بێت.
(١٧٣١) بە یەکێك دەوترێت کتوپڕ خەبەرێکی خۆشی بدەنێ جێی سەرسوورمان بێت.
(١٧٣٢) بە یەکێك دەوترێت داوایەك یان خوازبێنی کچێك بکات بە ڕێگای خواست ئیزن وەرگرتنەوە بچێتە پێشەوە.

لە دەرگای هەر کەسێك بدەیت، لە دەرگاکەت دەدرێتەوە.(١٧٣٣)
لەدوای تەنگانە خۆشییە.(١٧٣٤)
لەدوای باران کە پەنك.(١٧٣٥)
لە دز وایە هەموو کەس دزە.(١٧٣٦)
لە رقی دراوسێ منداڵەکەی خۆی دەکوژێت.(١٧٣٧)
لەر بێت و ماڵی خۆم بێت.(١٧٣٨)
لە زۆر زۆر و لە کەم کەم.(١٧٣٩)
لەژێر داری شکستا مەنو.(١٧٤٠)
لە سایەی گوڵەگەنمێك، هەزار گوڵەمرۆر ئاو دەخواتەوە.(١٧٤١)

---

(١٧٣٣) واتە داوێن پیسیی و ڕەوشت نزمیی لەگەڵ هەر کەس بکەیت، ڕوو بە ڕووی دەرگا و ماڵەکەی خۆت دەبێتەوە.

(١٧٣٤) واتە هیچ کەسێك تاسەر لە تەنگانەدا نامێنێتەوە.

(١٧٣٥) بە کەسێك دەوترێت دوای ڕوودان و بەسەرهاتێك، پاساو بهێنێتەوە و پەشیمان بێتەوە.

(١٧٣٦) واتە دز لە عەقڵ و چاوی خۆیەوە خەڵکیی دەبینێت و تەماشا دەکات.

(١٧٣٧) بەو مرۆڤانە دەڵێن ڕێگای قسەکردنیان لاوازە، تەنها هێز بەکار دهێنن بۆ نەهێشتنی گرفت.

(١٧٣٨) بە کەسێك دەوترێت بە بەشی خۆی ڕازی بێت و چاو نەبڕێتە ماڵی خەڵکیی.

(١٧٣٩) واتە هەموو شتێك بە ئەندازەی حاڵ زیادەڕۆیی تیایدا نەکرێت.

(١٧٤٠) واتە شتێك نەچوو بە عەقڵتا متمانەی پێمەکە.

(١٧٤١) واتە لە سایەی پیاوێکی گەورە و پایەبڵند چەندەها پیاوی بوودەڵە و لێنەهاتوو دەحەسێتەوە.

لەسەر خۆش گەرێیت، بۆ خۆی دەکەوێت.[١٧٤٢]
لەسەر مالم، دەدات لە بالم.[١٧٤٣]
لە سێبەری خۆی بە شکە.[١٧٤٤]
لە سەگی در، لە ئافرەتی دەمشر بترسە.[١٧٤٥]
لە سوژن بێکەسترە.[١٧٤٦]
لە شەرا شەریکم، لە خێرا تەریکم.[١٧٤٧]
لە شەرا هەر ناوبژیکەر تیاچووە.[١٧٤٨]
لەشی ساغ پاشایەتییە.[١٧٤٩]
لە شیری بەری دایکی حەلالترە.[١٧٥٠]

---

(١٧٤٢) بەکەسێکی بێ هۆش و بێ ئاگا دەوترێت، سزای خۆی بە کردەوەی خۆی وەردەگرێت.
(١٧٤٣) واتە دوای یارمەتیدان و دەستگرتن خراپیشم بۆ دەهێلێتەوە.
(١٧٤٤) بەو کەسانە دەوترێت دوای خراپەکاریی و دوژمنایەتیی ترسیان لێ نیشتووە.
(١٧٤٥) سەگی در و ئافرەتی دەمشر وەك بەلای ناگەهان وانە.
(١٧٤٦) بە کەسێك دەوترێت هیچ کەس نەوێرێت هاورێیەتی و کەسایەتی لەگەلدا ببەستێت لەبەر زەرەرمەندیتی.
(١٧٤٧) واتە کەسێك کاتێك تووشی شەر دەبێت هانا دەبات بۆ خەلکانێك بەلام کاتێك خێری دەستگیر دەبێت پشت دەکاتە خەلکیی.
(١٧٤٨) واتە شەری شەرکەرانە و ناوبژیکەر مالوێرانە، چەپۆکی هەر دوو لای بەر دەکەوێت.
(١٧٤٩) واتە سەروەت و سامانی مرۆڤ لە ژیاندا تەندروستییە.
(١٧٥٠) بە رەنجێك دەوترێت زۆر پاك و بێ غەش بێت.

**لە شێر ترسان عەیب نییە.**(١٧٥١)
**لە عەرشەوە تا قورش، کەس بە دۆی خۆی ناڵێت ترش.**(١٧٥٢)
**لە عەزرەت پڵاو ترش دەکاتە ئاو.**(١٧٥٣)
**لە قەلانیش بوو لە کۆترانیش.**(١٧٥٤)
**لە قور تۆز هەڵناستێت.**(١٧٥٥)
**لە کاتی راودا گووی دێت.**(١٧٥٦)
**لە کاکلانیش بوو لە تویکلانیش.**(١٧٥٧)
**لە کەری تۆپیو دەگەڕێت، ناڵەکەی لێ بکێشێتەوە.**(١٧٥٨)
**لە کوردەی هەردوو جەژنە بوو.**(١٧٥٩)
**لە کەر وایە هەموو کەس کەرە.**(١٧٦٠)

---

(١٧٥١) واتە لە مرۆڤی دڕندە و زاڵم بێ ویژدان خۆلادان عەیب نییە.
(١٧٥٢) هەموو کەس لە کار و کرداری خۆی رازییە، بە خراپە ناوی نابات.
(١٧٥٣) واتە بە تەمای شتێکە ناچارە دڵ بە شتێکی دیکە خۆش بکات.
(١٧٥٤) واتە دوو هیوای هەبوو هەردووکیانی لە دەستچوو.
(١٧٥٥) لە نەبوو هیچ شتێك نابینرێت و دەستگیر نابێت.
(١٧٥٦) بە کەسێك دەوترێت کار و ڕەفتاری لە شوێنی خۆیدا نییە.
(١٧٥٧) بە یەکێك دەوترێت کە لە شتە باشەکە و خراپەکەش بێبەش بووبێت.
(١٧٥٨) بە کەسێك دەوترێت ڕووت و ڕەجاڵ و نەدار و هەژارە.
(١٧٥٩) بە کەسێك دەوترێت بە هیوا و تەمای دوو شت بوو! بۆی نەبوو.
(١٧٦٠) مرۆڤی بێ هۆش و بێ عەقڵ وا هەست دەکات هەموو کەسێك بە قەد ئەو دەزانێت.

لەگەڵ گورگا گۆشت دەخوات و لەگەڵ مەردا شین دەکات.[١٧٦١]
لەگەڵ ناچیزە بچێت کایە، ڕەنجی چەند ساڵەت دەچێت بە بایا.[١٧٦٢]
لەگەڵ ئەسڵ هەموو فەسڵ، لەگەڵ نائەسڵ هیچ فەسڵ.[١٧٦٣]
لەگەڵ بەرخ بنوو، لەگەڵ چۆلەکە هەستە.[١٧٦٤]
لەگەڵ تری خۆیدا شەر دەکات.[١٧٦٥]
لەگەڵ شیردا خواردوویەتی.[١٧٦٦]
لەگەڵ کچم بۆ کوێ بچم، لەگەڵ کورم کێو دەبڕم.[١٧٦٧]
لەگەڵ یەکدا دانویان ناکوڵێت.[١٧٦٨]

---

(١٧٦١) بە کەسێك دەوترێت بە دڵی تۆش و دوژمنەکەشت بێت، خۆی سوودمەند بکات لە هەر دوولا.
(١٧٦٢) واتە لەگەڵ مرۆڤی بێ ئەسڵ و فەسڵ ڕەنج و هاوڕێیەتیی بە خەسار دەچێت.
(١٧٦٣) لەگەڵ بن و بنچینە دیار هەموو کات دەتوانیت هاوڕێیەتی و متمانە ببەستیت بەڵام لەگەڵ نائەسڵ و نادیاردا پەشیمانیت.
(١٧٦٤) ئەمە بۆ باری تەندروستییە شەو زوو بنوویت و بەیانیی پێش هەڵهاتنی ڕۆژ هەستیت لە خەو فریای هەوای پاك بکەویت.
(١٧٦٥) بە کەسێکی زۆر تووڕە و هەڵەشە دەوترێت.
(١٧٦٦) بە کردەوە و خوویەك دەوترێت بە ئاسانیی ڕزگاری نەبێت.
(١٧٦٧) لەم پەندە کچەکانیان بەبێ دەسەڵات دەزانن و کوڕەکانیان بەتوانا و بەهێز پیشان دەدەن.
(١٧٦٨) بە دوو کەس دەوترێت زۆر ناکۆك بن و بە یەکەوە ڕێك نەکەون.

**لە گوڵ پاکترە.**[1769]
**لە گوڵ کەمتر پێ ناڵێم.**[1770]
**لە گولیان پرسی بۆ وا جوانی؟ وتی: باخەوانەکەم مەردە.**[1771]
**لە گوێی گادا نووستووە.**[1772]
**لە گرێژەنە دەرچووە.**[1773]
**لە گەنجیی بۆ پیریی لە پیریی بۆ مردن.**[1774]
**لە لیفەی باوکیا نەتریوە.**[1775]
**لە ماڵی جوولەکە بخۆ، لە ماڵی مەسیحی بنوو.**[1776]
**لە منداڵ و لە شێت ڕاستیی وەرگرە.**[1777]

---

(١٧٦٩) واتە ئەوە هێمایەکە بۆ باسکردنی هەموو مرۆڤێکی خەسڵەت بەرز.
(١٧٧٠) واتە مامەڵەیەکی جوانی لەگەڵدا دەکەم.
(١٧٧١) بە کەسێك دەوترێت بەرپرسیاری کەسێك یان شتێك بێت زۆر بە پاك و پوخت و جوان خزمەتی بکات.
(١٧٧٢) بە کەسێك دەوترێت زۆر بێ ئاگا بێت لە هەموو گۆڕانکارییەکانی دەوروپشتی.
(١٧٧٣) بە کەسێك دەوترێت کەوتبێتە هەڵەوە و چارەسەری نەما بێت.
(١٧٧٤) ئەمە ڕەوتی ژیانە.
(١٧٧٥) بە کەسێك دەوترێت لە دەرگا و کوچە و کۆڵان گەورە بوو بێت و لە خۆی گۆڕا بێت و خۆی زل پیشان بدات.
(١٧٧٦) واتە جوولەکە زەنگینن خواردنی باشیان هەیە بەڵام مەسیحی هەژارن و ئەمینن.
(١٧٧٧) ئەم دووانە فرتوفێڵ نازانن، چۆن قسە وەردەگرن، هەر واش دەیڵێنەوە.

**لەم ئەرزە چەنەوەریێك هەڵكەنە.**[١٧٧٨]
**لەم گوێوە دەچێت و لەو گوێوە دەردەچێت.**[١٧٧٩]
**لە مەنجەڵێکا گۆشتیان بکولێت ئێسقانیان جیا دەبێتەوە.**[١٧٨٠]
**لە مارەبییەکەی دایکی خۆش بێت، لە مافی خۆی خۆش نابێت.**[١٧٨١]
**لە ناعیلاجی بە ناحەزیش دەڵێم باجی.**[١٧٨٢]
**لە نەبوو هیچ ناکرێت.**[١٧٨٣]
**لە نەزان وایە هەمووی نەزانە.**[١٧٨٤]
**لە هەر لا ئاشە، کەچەڵ فەراشە.**[١٧٨٥]
**لە هەزار ئاوی داوە پاژنەی تەڕ نەبووە.**[١٧٨٦]

---

(١٧٧٨) واتە لە نەبوو هیچ شتێك دەستگیر ناکرێت.
(١٧٧٩) بە کەسێك دەوترێت بە قسەی کەس ناکات و قسەی کەس وەرناگرێت.
(١٧٨٠) ئەمە بە دوو ناحەز دەوتریت قەت ڕێنەکەون لەگەڵ یەکتردا.
(١٧٨١) بە کەسێك دەوترێت زۆر حەقانی بێت.
(١٧٨٢) بە کەسێك دەوترێت کارێکی گرنگی بکەوێتە دەست ناحەزێك و لێی بپاڕێتەوە، تا بۆی جێبەجێ بکات.
(١٧٨٣) واتە کەسێك پارەی نەبێت هیچ هەنگاوێکی بۆ نانرێت لە ژیانیدا.
(١٧٨٤) واتە لە تێنەگەیشتوو وایە کەس هیچ نازانێت.
(١٧٨٥) بە کەسێك دەوترێت خۆی بکوتێتە شوێنی شایی و شین و هەموو لایەك.
(١٧٨٦) واتە دنیا زۆر گەڕاوە و زەرەرمەند نەبووە.

لە هەزار ئاش دەکات، ئاشێك ناماڵێتەوە.[1787]
لە هەق مەترسە، هەق لە سەروو هەموو شتێکەوەیە.[1788]
لە هەموو دیزەیەکدا ئەسکوێیە.[1789]
لە هەموو کەوتنێکا بەختێك هەیە.[1790]
لە هەموو هەورێك باران نابارێت.[1791]
لە هەولێر کۆنترە.[1792]
لە هایەك هوویەك دەکاتەوە.[1793]
لەوە بترسە لە خوا نەترسێت.[1794]

---

(١٧٨٧) ئەمە بە کەسێکی زۆر چەنەباز دەوترێت هەموو جۆرە قسەیەك بکات هیچی بەسەر هیچەوە.
(١٧٨٨) واتە پێویستە مرۆڤ لە ئاستی هیچ مافێکدا بێدەنگ نەبێت، خوا حەقی پێ خۆشە و هیچ شتێك لە حەق بەرزتر نییە.
(١٧٨٩) بە کەسێك دەوترێت خۆی بکوتێتە هەموو کاروبارێکی خەڵکییەوە.
(١٧٩٠) واتە هەموو گرفت و کەوتنێك ئەزموونێکت دەداتێ و بیر لە سەرکەوتنێکی تازەتر دەکەیتەوە.
(١٧٩١) واتە مەرج نییە هەموو جارێك هیوا و مەبەست بە دەست بێت بەڵکو مرۆڤ پێی بەهرەمەند دەبێت.
(١٧٩٢) بە شتێکی کۆنی بەنرخ دەوترێت یان بە کەسێکی پیری بە ئەزموون دەوترێت.
(١٧٩٣) بە کەسێك دەوترێت زۆر گیر و ئابوورییناسە و منەتی کەس هەڵناگرێت.
(١٧٩٤) واتە ئەو کەسانەی ترسی خوا لە دڵیاندا نییە هەموو خراپەیەکیان لە دەست دێت.

**له وه‌لیان ده‌بێت په‌ریان، له په‌ریان ده‌بێت وه‌لیان.**[١٧٩٥]
**له‌و جێیه‌ی ئاوی هه‌یه، زه‌وی نییه، (له‌و جێیه‌ی زه‌وی هه‌یه، ئاوی نییه).**[١٧٩٦]
**له نالیش ده‌دات و له بزماریش ده‌دات.**[١٧٩٧]
**له ناعیلاجیدا سه‌ر به ماڵی دوژمندا ده‌کات.**[١٧٩٨]
**له ناعیلاجیدا به جووله‌که ده‌ڵێت: به ڕیشی مه‌ردانه‌ت قه‌سه‌م.**[١٧٩٩]

---

(١٧٩٥) مرۆڤی چاك و له خواترس نه‌وه‌ی چاك ده‌هێنێته به‌رهه‌م و له دایکی چاکیش نه‌وه‌ی چاك ده‌بێته‌وه.

(١٧٩٦) واته ئه‌م دنیایه به کامی دڵی که‌س نییه.

(١٧٩٧) به که‌سێك ده‌وترێت باشیش ده‌ڵێت و خراپیش ده‌ڵێت.

(١٧٩٨) واته له بێ دۆست و خزمدا و له ناهه‌مواریی ژیاندا په‌نا بۆ ناحه‌زی خۆی ده‌بات.

(١٧٩٩) واته جاران په‌نا بۆ جووله‌که بردن نه‌نگ بوو به لای ئیسلامه‌کانه‌وه.

# پیتی ( م )

**مار سیری نەدەویست، سیر دەرگای پێ گرت.**[1800]
**مار کاژی فڕێ دەدات خوو فڕێ نادات.**[1801]
**مار لە کوێ پەپکە دەخوات، پونگە لەوی شین دەبێت.**[1802]
**مار دەکوژێت و توولەمار بەخێو دەکات.**[1803]
**مارانگاز لە خشتەی گەلاش دەترسێت.**[1804]
**مارانگاز لە گوریسی ڕەش و سپی دەسڵەمێتەوە.**[1805]
**ماری مارخۆریش هەیە.**[1806]

---

(١٨٠٠) بە کەسێك دەوترێت قینی لە زەلامێك بێت بەلام زوو زوو بەر لووتی بگرێت.
(١٨٠١) بە کەسێك دەوترێت کە گفتوگۆ و شێوە دەتوانێت بگۆڕێت بەلام سروشتی خوو ڕاهێنانی لەسەر شتێك پێ ناگۆڕێت.
(١٨٠٢) واتە هەموو شتێك لە بار و ئارەزووی مرۆڤ نابێت.
(١٨٠٣) بە یەکێك دەوترێت گەورەکان و باوکانی منداڵ لەناو بەرێت، بەلام وەچە و نەوە و منداڵەکانی بەخێو بکات.
(١٨٠٤) بە و کەسانە دەوترێت لە ژیانیاندا زۆر زەرەرمەند بوو بن ئەو مەترسییەیان تیایاندا هەر بەردەوامە.
(١٨٠٥) واتە جەربەزەی ڕۆژگار ترس و هەستیاریی هەر لە دەروونی مرۆڤدا بەجێ دەهێڵێت.
(١٨٠٦) واتە لە زاڵم زاڵمتر هەیە.

ماری کلك قرتاو، کلکی له بیر ناچێتەوە.[١٨٠٧]
ماری سکی خۆی خواردوویەتی.[١٨٠٨]
ماست تا نەیژەنیت کەرە نادات.[١٨٠٩]
ماست نییە بە لێویەوە دیار بێت.[١٨١٠]
ماستی مەیوو هەوێنی ناوێت.[١٨١١]
ماستاو سارد دەکاتەوە.[١٨١٢]
ماستاوچییە!.[١٨١٣]
ماستاوی بۆ دەکات.[١٨١٤]
ماسی لە دەریادا سەوا ناکرێت.[١٨١٥]
ماسی لە سەریەوە بۆن دەکات.[١٨١٦]

---

(١٨٠٧) واتە کەسێك زلەی ڕۆژگار زەرەرمەندی کردبێت بیری ناچێتەوە.
(١٨٠٨) بە کەسێکی بێ گرفت دەوترێت گشت کات خەمبار و نەخۆش بێت.
(١٨٠٩) هەموو شتێك تا پێوەی هیلاك نەبیت بەرهەمی جوان نابێت.
(١٨١٠) بە کەسێکی سپڵە و بێ وەفا دەوترێت کە چاکەی لەگەڵ بکرێت و پێی نەزانێت.
(١٨١١) واتە مرۆڤی عاقڵ و سالار ڕێنمایی ناوێت.
(١٨١٢) واتە خەریکی مەراییە.
(١٨١٣) واتە مەراییکەرە.
(١٨١٤) مەرایی بۆ دەکات و ڕۆن لە بەر پێی دەدات.
(١٨١٥) واتە هیچ شتێك لە گۆترە ناکرێت.
(١٨١٦) هەموو کۆمەڵێك لە گەورەکان و سەرۆکەکانەوە بۆگەن و گەندەڵ دەبێت.

**ماسی گەورە لە تاڤگەدا ناگیرێت.**[١٨١٧]
**ماسی بێ کێردە.**[١٨١٨]
**ماڵ بە میوانەوە ئاوەدانە.**[١٨١٩]
**ماڵ بە خاوەن ماڵ حەڵاڵە.**[١٨٢٠]
**ماڵ بێ خاوەنەکەی حەرام نییە.**[١٨٢١]
**ماڵ لە ماڵخۆ نەچێت حەرامە.**[١٨٢٢]
**ماڵ ماڵی منە و ماڵئاوای خەڵك.**[١٨٢٣]
**ماڵ لە هەواران، قنگ لە کۆچەکان.**[١٨٢٤]
**ماڵ مەڕ و مریشکی تیا بێت، مەگەر قەزا لای خوا بێت.**[١٨٢٥]

---

(١٨١٧) مرۆڤی بەهێز بە ئاسانیی بە تایبەتیی ئەگەر بڵند و پایەدار بێت.
(١٨١٨) ماسی ئەرکی لە ڕووی سەربڕینەوە کەمە.
(١٨١٩) واتە ماڵی بێ میوان کپ و داخراوە و خواردن و کردن و جووڵەی تێدا نییە.
(١٨٢٠) واتە خاوەن ماڵ و ڕەنجی خۆیەتی.
(١٨٢١) واتە لە ئەنجامی ڕەنج و هیلاکیی خۆی پێکهاتووە.
(١٨٢٢) واتە ماڵی هەژار سروشتی هەژاریی پێوە دیارە بەپێی ڕەنجەکەی.
(١٨٢٣) یەکێك دەیڵێت کە یەکێکی دیکە خاوەن ماڵی بکات، ئەم بەلاوە نرێت.
(١٨٢٤) بە یەکێك دەوترێت جێگیر نەبێت، خۆی لە لایەك بژی و ماڵەکەی لە لایەکی دیکە بێت.
(١٨٢٥) ئەمە کۆنەکان وتوویانە، ئەگەر قەزا و بەڵایەکیش بێتە خوارەوە بۆ ئەو ماڵە، دەکەوێت لە ئاژەڵ و باڵندەی ماڵەکە، نەك ئەندامی خێزانەکە.

مالّی با به با دەچێت.(١٨٢٦)
مالّی بوو بە سەر بەشی مالاّن.(١٨٢٧)
مالّت چووە مالاّن، چوو بە تالاّن.(١٨٢٨)
مالّت لە شووشە بوو، بەرد مەگرە پەنجەرەی خەلّکیی.(١٨٢٩)
مالّی پرە لە رازیانە، بە دلّ ئیشە دەمریت.(١٨٣٠)
مالّی چاو لە دو خێر ناداتەوە.(١٨٣١)
مالّی حەلاّل لە دەست ناچێت.(١٨٣٢)
مالّی خۆنەخۆر، بۆ چەکمە بۆر.(١٨٣٣)

---

(١٨٢٦) واتە مالّێك بە خۆرایی و بەلاش دەستکەویت، زوو لە دەست دەچێت.
(١٨٢٧) ئەمە لە کەسێکی وەجاخ کوێر روو دەدات.
(١٨٢٨) واتە متمانە بە کەس مەکە مالّ و نەختینە و نەهێنیی خۆتی پێ بسپێری.
(١٨٢٩) واتە خۆت خاوەن حورمەت و کچ و کوڕ و خێزان بوویت، قسەی ناشیرین و پەنجەی سووکیی بۆ کەس رامەکێشە.
(١٨٣٠) بە کەسێك دەوترێت نەپەرژێتە سەر خۆی یان لە خۆی رانەبینێت کە سوود لە رەنجی خۆی ببینێت، یان زانایییەکەی بۆ خۆی بەکار نەهێنێت.
(١٨٣١) ئەمە زیاتر بە مالّی وەرەسە دەوترێت کەسێکی بەتوانا لە خێزانەکەیدا دەستی بەسەردا دەگرێت، ئەوانی دیکە لە ترسا چاوەزەقییانە.
(١٨٣٢) واتە مالّێك بە عارەقەی ناوچەوان دروست بووبێت خۆشەویستە کەس ناتوانێت داگیری بکات.
(١٨٣٣) بە مالّی کەسێك دەوترێت زۆری رەنج دابێت و لە خۆی رانەبینێت بیخوات، دوای خۆی کەسێکی دیکە بە هەوانتە سەرفی دەکات.

**ماڵی خەلیل و ماڵئاوایی جەلیل.[1834]**
**ماڵی خۆت توند بگرە، سەگی دراوسێ بە دز مەگرە.[1835]**
**ماڵی خۆت توند بگرە، کەس بە دز مەگرە.[1836]**
**ماڵی خەڵکیی لەگەڵ خەڵکدا دەخورێت.[1837]**
**ماڵ لە خۆیدا نەبوو، میوانیش رووی تێکرد.[1838]**
**ماڵە خەزوور و نۆ مەن خوێ.[1839]**
**ماڵی سپی بۆ رۆژی رەش.[1840]**
**ماڵی بەفرە کچان، ئاو نییە لە گۆزان.[1841]**
**ماڵی قەلب سەر و بەرۆکی خاوەنەکەی دەگرێتەوە.[1842]**

---

(١٨٣٤) واتە ماڵی کەسێکە و ماڵئاوایی لە کەسێکی دیکە دەکرێت.
(١٨٣٥) پێویستە هەموو کەس بە ئاگا بێت بۆ ماڵی خۆی بەربڵاو نەبێت.
(١٨٣٦) بە کەسێك دەوترێت ئاگای تەواوی لە پارە و ئاڵتوون و نەختینە و نەهێنیی خۆی بێت هیچ کەس زەفەری پێ نەبات.
(١٨٣٧) واتە ماڵێك رەنجی پێوە نەکێشا بێت بە خەیاڵتا نایەت لەناو چێت.
(١٨٣٨) بە کەسێك دەوترێت زۆر هەژار و بێ دەرامەت بێت، ئەوەندەی نەبێت تێر بخوات میوانیش دەچێتە سەری.
(١٨٣٩) واتە تاڵاو و سوێراوی ماڵە خەزوور زۆرە بۆ بووك.
(١٨٤٠) واتە لە رۆژانی هەوڵ و تین توانات پاشەکەوت بکە بۆ رۆژانی پیریی و نەخۆشیی و بێکاریی، واتە پارە و رەنجت بە هەدەر مەدە.
(١٨٤١) واتە هەر یەکێك لەو کچانە چاوەروانی ئەوی دیکە دەکات بیکات.
(١٨٤٢) کەوابێت ئەگەر کور و کچەکەت جوان پەروەردە نەکەیت دەیگەرێننەوە بۆ خۆت کەس پێیان رازی نابێت.

**ماڵی زیایە سەر ناشکێنێت.**[1843]
**ماڵی گەش بۆ ڕۆژی ڕەش.**[1844]
**ماڵی نییە و شەڕ دەکات، ژنی نییە و گەڕ دەکات.**[1845]
**ماڵی وا بە کۆڵییەوە.**[1846]
**ماڵێکی ئاوەدان، لە سەد ماڵی وێران چاکترە.**[1847]
**ماڵیان کرد بە ماڵێك، خەڵەیان کردە چاڵێك.**[1848]
**ماڵمان یەك ماڵیی، کیسەمان جیایی.**[1849]
**ماڵمان پشتاوپشت، شیری کاکم لە پشت.**[1850]
**ماڵا مرێ، لە خۆیەوە دەکرێ.**[1851]
**ماڵی دزێتی مەگەر شەو بکرێت بە خۆدا.**[1852]

---

(١٨٤٣) واتە ئەوەندە ڕەنج بدە کە بە فراوانیی بیخۆیت.
(١٨٤٤) واتە ماڵی خۆش و گەش و فراوان و بوون بۆ تەنگانە باشە.
(١٨٤٥) بە کەسێك دەوترێت هیچ بەرنامەیەکی نییە لە ژیانیدا، دەیەوێت ماڵیش و ژنیش لەسەر ڕەنج و شانی خەڵك دروست بکات.
(١٨٤٦) بە کەسێکی ئاوارەی بێ جێگا و ڕێگا دەوترێت.
(١٨٤٧) واتە هەڵپە و ڕەنجی بێسنوور سەرلێشێواندن دەهێنێت.
(١٨٤٨) بە دوو کەس دەوترێت ڕەنج و دڵیان یەکخەن و وەك یەك بژین.
(١٨٤٩) بە دوو کەس دەوترێت بەیەکەوە بژین بەڵام هەر یەك بۆ گیرفانی خۆی ڕەنج بدات.
(١٨٥٠) واتە ئەگەر کەسوکارت دەورت بدەن وەکو شمشێرێکت بەستبێت وایە.
(١٨٥١) بە ماڵێکی هەژار دەوترێت هیچ فەنتازی تێدا نەکرێت و زوو تەواو بێت.
(١٨٥٢) فەلسەفەی ئەم پەندە واتە دزێتی هەر شەرمەزاریی و تاوانە.

**ماڵسووتاو بە ماڵ دەبێت، سکەرۆ بە ماڵ نابێت.**(١٨٥٣)
**مانگ لە چواردەیا پەنجەی ناوێت.**(١٨٥٤)
**مانگ قەدری نییە تا دەگاتە شەو.**(١٨٥٥)
**مانگە شەو سەر لە ئێوارە دیارە.**(١٨٥٦)
**مانگی شەرمییەتی.**(١٨٥٧)
**مانگا مردوو دۆ برا.**(١٨٥٨)
**مانگا بە دزییەوە کەڵ دەگرێت، بە ئاشکرا دەزێت.**(١٨٥٩)
**مانگا نییە بمژێت، مێرد نییە بکوژێت.**(١٨٦٠)

---

(١٨٥٣) واتە زەرەرمەند زوو هۆش دەهێنێتەوە بەرخۆی بەڵام نەوسن و چڵێس هەر هەوڵی ورگی دەدات.
(١٨٥٤) واتە هەموو شتێکی ڕوون و ئاشکرا و ڕووناك پێویست بە چەند و چوون ناکات.
(١٨٥٥) هەموو شتێك تا پێویست پێی نەبێت و لەسەری دانەمێنێت قەدری نازانێت.
(١٨٥٦) هەموو کەسێك و هەمو شتێکی خراپ لە سەرەتای کردەوە و کردارەکانییەوە دیارە، یان بە ڕەنگ و ڕوودا دیارە.
(١٨٥٧) ئەمە بە بووك و زاوا دەوترێت لە مانگی هەنگوینیدا.
(١٨٥٨) واتە ئەو خێر و بەرەکەتە نەما کە کۆن لەسەری دەژیان.
(١٨٥٩) بە کارێکی ناپەسەند دەوترێت کە بە دزییەوە دەکرێت و دوایی ئاشکرا دەبێت.
(١٨٦٠) بە کەسانێك دەوترێت کە سەردانی کەسوکار نەکەن و گلەییان لێ بکرێت.

**مایەی سەفەر سەلامەتییە.**[١٨٦١]
**مایەی بوو بە مایەی پیازفرۆش.**[١٨٦٢]
**مرخی لیٚ خۆشکردووە.**[١٨٦٣]
**مرۆڤ ڕێزی خۆی بە خۆیەوەیەتی.**[١٨٦٤]
**مرۆڤ گا نییە تا سەر لە پێستیکا بێت.**[١٨٦٥]
**مردن لە مووی لووت نزیکترە.**[١٨٦٦]
**مردن لەگەڵ ئاوەڵاندا جەژنە.**[١٨٦٧]
**مردن مردنە لنگەفرتیٚ چییە.**[١٨٦٨]

---

(١٨٦١) واتە گرنگیی لە دوورکەوتنەوە و گەڕانەوە لە سەفەردا سەلامەتییە.
(١٨٦٢) واتە ئەنجامی ئیشەکەی سەری نەگرت و پووچ دەرچوو.
(١٨٦٣) بە کەسێك دەوترێت لە دوورەوە تەماع گرتبێتی و خۆی مات دابێت بۆ بەدەستهێنانی شتێك بەلایەوە گرنگە.
(١٨٦٤) هەموو مرۆڤێك لەبەر خاتری کەسێتیی و ڕێزگرتنی خۆی ڕێز لە خەڵکیی دەگرێت، ڕێزیش لە کار و کردەوەدا دیارە.
(١٨٦٥) واتە مرۆڤ تا سەر نە هەژارە نە ساماندارە نە نەخۆشە نە لەش ساغە واتە ژیانی مرۆڤ هەمیشە لە گۆڕاندایە.
(١٨٦٦) پێویستە مرۆڤ هۆشیار بێت لە کار و کردەوەیدا چونکە دەزانێت مردن هەیە و کاتی مردنیش نامۆیە.
(١٨٦٧) واتە هەموو شتێك لەگەڵ کۆمەڵدا خۆشە و نامۆ نییە.
(١٨٦٨) کەسێك دەیڵێت لە کارێك بسڵەمێتەوە و دووایش ئازایانە بچێتە پێشەوە و بیکات.

**مردن هەر جاریکە.[١٨٦٩]**
**مردوو شەیتان دەستی لێ هەڵدەگریت.[١٨٧٠]**
**مردوو بەبێ کفن لە ماڵ دەرناچیت.[١٨٧١]**
**مردوو و زیندوو بە ئاو پاك دەبیتەوە.[١٨٧٢]**
**مردوو بە شیوەن زیندوو نابیتەوە.[١٨٧٣]**
**مردوو لەمە چاکتر ناشۆریت.[١٨٧٤]**
**مردووی ئەسفەهان نابریتە کاشان.[١٨٧٥]**
**مردووی بەشی زیندووخۆر.[١٨٧٦]**
**مریشك باری خست نیشانەی میوان هاتنە.[١٨٧٧]**
**مریشك خۆی خۆڵ نەکات بەسەری خۆیدا، کەس ناتوانیت خۆڵی**

---

(١٨٦٩) کەسیك دەیڵیت گرفتیکی گەورە یان نەشتەرگەرییەکی بۆ بکریت و بترسیت یان کار و ڕیگایەکی سامناکی لەبەردەمدا بیت.
(١٨٧٠) واتە ڕەحمەت بۆ مردوو باشە، ئیتر باسی خراپیی نەکریت.
(١٨٧١) منداڵ و دایکی مافیان هەیە بیبەش نەبن لەو ماڵەی تییدا ژیاون.
(١٨٧٢) واتە ئاو تەنها ڕیگایە بۆ پاکژیی مردوو و زیندوو.
(١٨٧٣) بە کەسیك دەوتریت تا خەم بۆ ڕابردوو و لە دەستچوو نەخوات.
(١٨٧٤) بە کاریك دەوتریت هەلیکی چاکی بۆ هەڵکەوتبیت و لە دەست نەچیت.
(١٨٧٥) کە وابیت لە هەموو شوینیك لیقەوماو و هەژار هەیە، مرۆڤ خیر لە شوینی خۆیدا بکات. (خیر بۆ خویش، نەك بۆ دەرویش).
(١٨٧٦) ئەمە بە مرۆڤیکی بێ کەڵك و بێ توانا دەوتریت.
(١٨٧٧) ئەم پەندە بیرۆکەیەکی کۆنەو تاقیکراوەتەوە.

**بە سەردا بکات.**[1878]

**مریشك نابێت لاسایی قاز بکاتەوە.**[1879]

**مریشك هێلکەش دەکات و ڕیقنەش دەکات.**( ١٨٨٠ )

**مریشکی ڕەش هێلکەی سپی دەکات.**[1881]

**مزگەوت ڕووخاوە و میحرابی ماوە.**[1882]

**مزگەوت بێ مەلا نابێت.**[1883]

**مزگەوتێك بۆ شقارتەیەك دەسووتێنێت.**[1884]

**مشتێك نموونەی خەرمانێکە یان خەروارێکە.**[1885]

---

(١٨٧٨) واتە مرۆڤ خۆی پەسەند و ڕەوشت بەرز بێت، کەس ناتوانێت قسەی خراپی دوا بخات.

(١٨٧٩) بە کەسێك دەوترێت زیاد لە توانای گیرفانی خۆی خەرج بکات، لاسایی خاوەن سەروەت و سامان بکاتەوە.

(١٨٨٠) بە دایکێك دەوترێت دوو منداڵی هەبێت یەکێکیان باش هەڵکەوتووە و ئەوی دیکەیان خراپ هەڵکەوتووە.

(١٨٨١) بە کەسێکی نا پەسەند دەوترێت منداڵێکی ڕەوشت بەرز و پەسەند بخاتەوە، یان کەسێکی ناشیرین شێوە منداڵێکی جوان بخاتەوە یان کارێکی خێر و باش بکات.

(١٨٨٢) بە کەسێك دەوترێت بە گەنجیی زۆر جوان بووە، کاتی پیریش شێوەی هەر جوان بێت.

(١٨٨٣) هیچ شوێنێك بەبێ گەورە و سەردار کاری ناڕوات ڕەواجی نییە.

(١٨٨٤) بەو کەسانە دەوترێت زۆر خۆپەرستن، سوودی خۆیان بەلاوە پەسەندترە وەك لە سوودی گشتیی.

(١٨٨٥) واتە مشتێك لە هەموو شتێك خەسڵەتی ڕێژە زۆرەکەی تێدایە.

**مشتەی ناو هەمانەکە کوشتوومی.**(١٨٨٦)
**مشکی کوێر لە ماڵیا نمەك ناکات.**(١٨٨٧)
**مشك لە ماڵیا کلکی چەور نابێت.**(١٨٨٨)
**ملی لە تیغ دەسووێت.**(١٨٨٩)
**ملی بە نۆ تەور نابڕێتەوە.**(١٨٩٠)
**مل لە چەقۆ دەسووێت.**(١٨٩١)
**ملوانکەی دراوسێ مەگەر شەو بکرێتە مل.**(١٨٩٢)
**من منم... تۆ کێیت؟**(١٨٩٣)
**من چاك لە فیکەی خۆم دەگەم.**(١٨٩٤)
**من ئاغا و تۆ ئاغا، کێ جێگامان بۆ داخا.**(١٨٩٥)

---

(١٨٨٦) بە کردەوەیەك دەڵێن بە ڕووکەش هیچ ڕوون و ئاشکرا نەبێت بەڵام بە ناوەخن قورس و گران و بە ئازار بێت
(١٨٨٧) بە کەسێکی ڕەزیل و چروك دەوترێت.
(١٨٨٨) بەو کەسە ڕەزیلانە دەوترێت خێریان نییە بۆ کەس.
(١٨٨٩) بە شەڕفرۆشێك دەوترێت کە شەڕ لە توانایدا نەبێت تەنها دەمی گەرمە بۆ شەڕنانەوە.
(١٨٩٠) بە کەسێك دەوترێت هیچی لەبارا نییە و لە دەستی نایەت تەنها دانیشتووە دەخوات و قسەی زل دەکات.
(١٨٩١) بە کەسێك دەوترێت حەز بە شەڕ و ئاژاوە دەکات و هیچی لەبارا نییە.
(١٨٩٢) واتە دزیکردن لە دراوسێ ناشارێنەوە هەر دەردەکەوێت.
(١٨٩٣) ئەمە کەسێکە زۆر پەسندێتی بدات بە خۆی و نرخ بۆ کەس دەنەنێت؟
(١٨٩٤) هەموو کەس قسە و هەڵەی خۆی دەناسێتەوە.
(١٨٩٥) دوو کەس بە یەکتر دەڵێن کە بچووکیی یەکتریان قبووڵ نەبێت.

**من به ئاگریك گەش نەبمەوە؟ بۆ بە دوكەڵی ڕەش ببمەوە.**[1896]
**من بۆ تۆمە...؛ تۆ بۆ كێتە؟.**[1897]
**من ڕازی و تۆ ڕازی، داری بە قنگی قازی.**[1898]
**من بۆ تۆ مردووم، تۆ من بە هیچ نەگرتوو.**[1899]
**من بۆم دانا ناو، ئەو بۆی دانام داو.**[1900]
**من بووم بە تۆ، تۆ بووی بە من، من بووم بە جن، تۆ بووی بە ژن.**[1901]
**من لە شام و ئەو لە شیراز، مەحاڵە ببین بە هاوڕاز.**[1902]

---

(١٨٩٦) یەكێك دەیڵێت كە لە شتێكدا قازانج و سەركەوتنی بۆ نەبێت و نایەوێت زەرەرمەندیش بێت.
(١٨٩٧) كەسێك دەیڵێت كە سەركەوتنی بۆ بەرامبەرەكەی بوێت. بەڵام بەرامبەرەكەی چەواشە بووە و نازانێ چی دەكات.
(١٨٩٨) لە كارێكی دوو لایەنیدا بە متمانەی یەكتر، گوێ لە هیچ كەسێكی دیكە نەگرن.
(١٨٩٩) كەسێك دەیڵێت زۆر دڵسۆز و لە خزمەت بەرامبەرەكەیدا بێت بەڵام بەرامبەرەكەی هیچ حسابی بۆ نەكات.
(١٩٠٠) بە كەسێك دەوترێت زۆر بەرگری لە هاوڕێیەكەی بكات بەڵام هاوڕێكەی داوی بۆ دەنێتەوە بیخات.
(١٩٠١) ئافرەتێك دەیڵێت كە زۆر چاكە و ڕێنمایی باشی هەبوو بێت بۆ ناكەسبەچەیەكی هاوڕێی.
(١٩٠٢) كەسێك دەیڵێت كە بیر كردنەوە و بەرژەوەندییان دوور بێت لەگەڵ كەسێكی دیكەدا و ڕێكەوتن مەحاڵ بێت لە بەینیاندا.

من دەڵێم سیر، ئەو دەڵێت پیاز.[1903]
من دەلێم نێرە، ئەو دەلێت بیدۆشە.[1904]
من مردوو، تۆ زیندوو.[1905]
منێك وا بە خنەخن، چیم داوە لە ماڵ و ژن.[1906]
منداڵی بێگانە گوێرەسار دەپچرێت.[1907]
منداڵ لە منداڵییەوە دیارە.[1908]
منداڵ تاجی لەسەری شا داگرتووە.[1909]
منداڵی دەرمانان، ناگاتە سەربانان.[1910]

---

(١٩٠٣) بە کەسێك دەوترێت لەسەر هەڵەی خۆی سوور بێت و قسەی کەس وەرنەگرێت.
(١٩٠٤) بە کەسێك دەوترێت قسەی کەس کەس وەرنەگرێت و بە هەڵەی خۆیدا بڕوات.
(١٩٠٥) ئەمە وەکو وەسیەتێك وایە کە بەرامبەرەکەی عەقڵی بەو کارە نەشکێت یا بڕوای نەبێت.
(١٩٠٦) کەسێك دەیڵێت متمانەی بە خۆی نەبێت بۆ جێبەجێکردنی پڕۆژەکانی خۆی.
(١٩٠٧) واتە ڕەنج لە منالی بێگانە و بەخێوکردنی بێ سوودە چونکە هەڵدەگەڕێتەوە و منەت نازانن.
(١٩٠٨) واتە سروشت و کردنەوەی منداڵ لە بچووکییانەوە دەر دەکەوێت.
(١٩٠٩) واتە زۆر بەربەرەکانی منداڵ مەکە، با هەڵەی گەورە نەکات.
(١٩١٠) بەو منداڵە نەخۆشانە دەوترێت کە بەرگرییان کەمە بە دەرمان بەندن یان ئەوانەی هەموو کات گرفتیان هەیە و ئەنجامیان باش نییە.

**موو بە بەینیاندا ناچێت.**[1911]
**موو و ماست لێك جیا دەكاتەوە.**[1912]
**موویەك لە بەراز بێتەوە هەر چاكە.**[1913]
**موویەك لەم ناو مشتە هەڵكەنە.**[1914]
**مووروی دزێتی مەگەر شەو دەرخرێت.**[1915]
**مووروی كوندار پەكی ناكەوێت.**[1916]
**مۆم دەڵێ بسووتێم، نەك بتووێمەوە.**[1917]
**مۆمێك بۆ تاریكیی زۆرە.**[1918]
**مێش لە دەمی خۆی دەر ناكات.**[1919]
**مێش میوانی نییە.**[1920]

---

(1911) واتە زۆر ڕێكەوتوون و تەبان.
(1912) بە كەسێك دەوترێت زۆر وریا و بلیمەت بێت و هەستیار بێت.
(1913) بە كەسێكی زۆر ڕەزیل و بێ خێر دەوترێت.
(1914) واتە عەیب لە مرۆڤی بێ عەیب دەرنایەت.
(1915) واتە دزێتی گەورە بێت یان بچووك كارێكی ترس و خەجاڵەتە.
(1916) واتە ئافرەت بە پێی خۆی خواستی خۆی هەر هەیە.
(1917) واتە مرۆڤ بە ئاسایی بژی وەكو مۆم ڕووناكیی دەدات بە چواردەوریدا بە توانەوە بەبێ سووتان واتە مردن و فەوتان.
(1918) كەوابێت یارمەتیی كەمیش بێت بۆ كاتی نەبوونی جێ دەگرێت و گرنگە.
(1919) بە كەسێكی زۆر بێ دەسەڵات و داماو دەوترێت.
(1920) بە كەسێك دەوترێت زۆر سروشت كز و خاو و دەماخ سارد بێت.

**مێشووله كۆمەڵ بێت، فیل یخ دەدات.**[1921]
**مێرد نەتكات خەرۆ، بە كەس نابێت ترۆ.**[1922]
**میراتی كەر، كورتانەكەیەتی.**[1923]
**میراتی كەر بۆ كەمتیارە.**[1924]
**میوان بە دیارییەوە دیارە.**[1925]
**میوان دیاری خوایە.**[1926]
**میوان ئازیزە.**[1927]
**میوان نان دەخۆیت؟.**[1928]

---

(١٩٢١) واتە كۆمەڵی بچووك گەورە بێزار دەكات و ڕاونێت بە یەكگرتووی و یەكبوون.
(١٩٢٢) واتە ئەگەر كەسێكی زۆر نزیك ناوت بە خراپ نەبات كەس ناتوانێت ناتوانێت لە گوڵ كاڵترت پێ بڵێت.
(١٩٢٣) واتە كەسی بێ عەقڵ و بێ هۆش و هیچ نەزان هیچ شتێك و بەرهەمێك لە دوای خۆیەوە بەجێ ناهێڵێت.
(١٩٢٤) ئەمە لە ڕووی گاڵتەجاریی و سووكردنی میراتەوە دەوترێت.
(١٩٢٥) واتە میوان بە دەستی بەتاڵ نەڕوات بێ دیاری، دیاری پێویستە بۆ یادگاریی.
(١٩٢٦) میوان خۆشەویستیی و هاوڕێیەتی و پەیوەندیی و كەسایەتی بەهێز دەكات.
(١٩٢٧) واتە میوانداریێتی خۆشەویستیی و پەیوەندیی تازە دەكاتەوە.
(١٩٢٨) ئەمە لە كوردەواریدا بە نەنگ ناودەبرێت. چونكە میوان شەرم دەكات پێویستە خاوەن ماڵ دڵی بۆ بكاتەوە و ڕێزی لێ بگرێت.

**میوان هات خاوەن ماڵی دەرکرد.**[١٩٢٩]
**میوانی ساتێك، جاسووسی ساڵێك.**[١٩٣٠]
**میوانی درەنگ وەخت، گلەیی لەسەر خۆیەتی.**[١٩٣١]
**مەبە بە مقاشی دەستی دوژمن.**[١٩٣٢]
**مەتەڵی زانایەك بە هەزار نەزان هەڵ نایەت.**[١٩٣٣]
**مەچۆرە ژێر داری شکستەوە.**[١٩٣٤]
**مەحکەمە ماڵی باوکی کەس نییە.**[١٩٣٥]
**مەرد ئەو کەسەیە گوڵ بلاوێنێت، نەك دڵی ژن و منداڵ بشکێنێت.**[١٩٣٦]

---

(١٩٢٩) بە میوانێك دەوترێت کە چووە ماڵێك خاوەن ماڵی بکات.
(١٩٣٠) کەوابێت میوان زۆر هەستیارە لە ساتێکی کەمدا کۆمەڵێك کۆ دەکاتەوە و شت تێدەگات.
(١٩٣١) واتە میوانێك لە درەنگ وەختدا بە رێکەوت و بێ زانیاریی رووی کردە شوێنێك نابێت گلەیی بکات و دەبێت بە هەموو شتێك رازی بێت.
(١٩٣٢) بە قسەی دوژمن و ناحەز هەڵمەسووڕێ لەبری کەس شەڕ مەکە.
(١٩٣٣) واتە گوێگرتن لە مرۆڤی زانا هەر باشە.
(١٩٣٤) مەچۆرە ژێر باری کارێکە و کە شکستت پێ بێنێت و زەرەرمەندت بکات.
(١٩٣٥) واتە یاسا سەروەرە بۆ تاونبار و بێ تاوان.
(١٩٣٦) بەو کەسانە دەوترێت ماڵ و منداڵی خۆیان لاخستووە بۆ ئارەزوومەندی خۆیان یان توانای خێزان بەڕێوەبردنیان نییە.

مەردی هۆشیار دەست بە کونێکدا ناکات دووجار.[1937]
مەرگ لەگەڵ ئاوەڵاندا جەژنە.[1938]
مەروانە ڕەگی سوورم، تێبگە لە دڵی تەنوورم.[1939]
مەڕ بە پێی خۆیی و بزن بە پێی خۆی هەڵدەواسرێت.[1940]
مەڕ لە دوور گاگەل گورگ دەیخوات.[1941]
مەروانە سەری تاسی، بڕوانە بەختی خاسی.[1942]
مەکە فەخر، لەگەڵ کەس ناچێتە قەبر.[1943]

---

(١٩٣٧) بە کەسێك دەوترێت کە زەرەرمەند بوو جارێك عەییار دەبێت و بۆی دەبێتە ئەزموونی کە دووبارەی نەکاتەوە.
(١٩٣٨) واتە هیچ گیروگرفتێك و بەسەرهاتێك لەگەڵ کۆمەڵدا زۆر قورس و ناخۆش نییە.
(١٩٣٩) بە کەسێك دەوترێت ڕەنگ و ڕووی هیچ خەم و پەژارەی پێوە دیار نییە.
(١٩٤٠) هەموو مرۆڤێك بە پێی تاوانی خۆی سزا دەدرێت.
(١٩٤١) هەموو مرۆڤێك لە خێڵ و نەتەوەی خۆی دوور کەوێتەوە بە گورگان خواردوو دەچێت و دەپچڕێت و دەبێتە نامۆ.
(١٩٤٢) بە ئافرەتێکی کەچەڵ دەوترێت کە شوویەکی باشی کردبێت یان پیاوێکی کەچەڵ و ئەسڵەع ژنێکی زۆر جوان و چاکی هەبێت.

(١٩٤٣) واتە ئەوەی بە لووت بەرزییەوە شانازیی بەخۆیەوە بکات و گاڵتە بە گیروگرفت و ناتەواوی خەڵك بکات، خوای گەورە ئەویشی لێ بەدەر ناکات.

**مەل هەیە گۆشتی دەخوریت، مەل هەیە گۆشت دەخوات.[1944]**
**مەلا بەزێنە و سنوور پەرێنە.[1945]**
**مەمرە و مەژی، بۆ خۆی دەژی.[1946]**
**مەمشۆ بە ئاوی گواوی، نامەویت خاسیتی دواى.[1947]**
**مەنجەڵ تلبۆوە، سەرقاپی خۆی دۆزیەوە.[1948]**
**مەنجەڵ بوو بە مەنجەلۆکە، ئاغاژن بوو بە جنۆکە.[1949]**
**مەنجەڵی مەردان بە چل ساڵ دیتە جۆش.[1950]**
**مەنزڵ پاك دەبیرێت.[1951]**

---

(١٩٤٤) واتە کەسانێك هەن لە ژێر باری کار و خزمەتدا هیلاکن و کەسانێکیش پاڵیان داوەتەوە و خزمەت دەکرێن.
(١٩٤٥) بە کەسێك دەوترێت قسە هەر قسەی خۆی بێت بەبێ سنوور رێز بۆ قسەکانی مەجلیسەکە دانەنێت.
(١٩٤٦) بە کەسێك دەوترێت تەنها دەتوانێت خۆی بەخێو بکات و ڕازی کات نا توانێت لە خۆی زیاتر کەس ڕاگرێت.
(١٩٤٧) واتە دواى زویربوون، پاساوی دوایی سوودی نییە.
(١٩٤٨) بە کەسێك دەوترێت بیەوێت ژن بێنێت یا شوو بکات، کەسێکی تووش بێت لە هەموو روویەکەوە هاوشانی خۆی بێت.
(١٩٤٩) بە ماڵێکی قەڵەباڵغ بوو دەوترێت کە دوایی ژمارەیان کەم بۆتەوە و سامانیان کەوتبێتە کەمیی ئیتر چێشتی کەم لە مەنجەڵی بچووکدا لێ دەنێن.
(١٩٥٠) واتە مرۆڤی عاقڵ و دانا و مەرد زۆر کەم و درەنگ تووڕە دەبێت.
(١٩٥١) هەموو کات مرۆڤی بێ تاوان و پاك سەرکەوتوو دەبێت.

مەیموون خۆی جوان بوو، ئاوەڵەشی دەردا.[1952]
مەیموون لە بەرچاوی دایکیا ئاسکە[1953]

---

(١٩٥٢) بە کەسێك دەوترێت ڕەنگێکی هەبووبێت و ڕەنگێکی دیکەیشی بەسەردا هاتبێت.

(١٩٥٣) واتە هەموو کەس منداڵی خۆی خۆشی دەوێت و لە دڵیا شیرینە و ئەگەر شێوەشی ناشیرین بێت هەر لای جوانە.

## پیتی ( ن )

**نان و دۆ بە خوڵق و خۆ.** [١٩٥٤]
**نان بدە بە سەگ، مەیدە بە سپڵە.** [١٩٥٥]
**نان بۆ نانەوا گۆشت بۆ قەساب.** [١٩٥٦]
**نان بۆ خۆم و جۆ بۆ کەرەکەم.** [١٩٥٧]
**نان ئەو نانەیە، ئەمڕۆ لە خوانە.** [١٩٥٨]
**نان و تف دەخوات.** [١٩٥٩]
**نانخۆری سفرە دڕ.** [١٩٦٠]
**نانی بێ خوێ دەخوات و تڕی سوێر دەکەنێت.** [١٩٦١]

---

(١٩٥٤) بە کەسێك دەوترێت ئەگەر خواردنی باشیشی نەبێت بۆ میوان داینێت پێویستە ڕووی خۆش و خوڵقی جوان بێت و زمانی شیرین بێت.
(١٩٥٥) لەبەر ئەوەی سەگ بە وەفایە بەڵام مرۆڤی سپڵە پێ نەزانە.
(١٩٥٦) واتە هەموو کەسێك بە پێی شارەزایی و ئەزموونی خۆی دەست بداتە کار.
(١٩٥٧) بە کەسێك دەوترێت کە مشووری خۆیی و هاودەمی بخوات.
(١٩٥٨) بە کەسێك دەوترێت کۆن هیچی نەبووە و ئەمڕۆ بە هۆی دەوڵەت و بوونەکەیەوە هاتبێتە ڕوو و حورمەتی پەیدا کردبێت.
(١٩٥٩) بە کەسێکی زۆر ڕەزیل و چروك دەوترێت.
(١٩٦٠) بە کەسێکی سپڵە دەوترێت دوای نانخواردن منەت نەزانێت.
(١٩٦١) بە کەسێك دەوترێت خۆی لە سفرە و نانی خۆڕازی نییە بەڵام کە هەستایە سەرپێ خۆی زۆر هەڵدەکێشێت.

**نانی جوولەکە بخۆ، لە ماڵی گاور بنوو.**[١٩٦٢]
**نانی جۆ و دۆی ترش، دەخۆیت بخۆ ناخۆیت چش.**[١٩٦٣]
**نانی نییە و چاو دەڕێژێت، خەمی دڵی خۆی دەنێژێت.**[١٩٦٤]
**نانی هاری گرتووە بە دەمەوە.**[١٩٦٥]
**نابێت هەرچی گا کردی، گا بیخوات.**[١٩٦٦]
**ناتورێنێت بە گیای بەهاردا.**[١٩٦٧]
**ناتوانێت تر بدۆڕێنێت.**[١٩٦٨]
**نانت جۆ بێت و خولقت گەنم بێت.**[١٩٦٩]

---

(١٩٦٢) جوولەکەی دەوڵەمەند خواردنیان زۆرە بەڵام گاور ئەمینە شەو بمێنیتەوە.
(١٩٦٣) ئەمە بۆ پیر و نەخۆشە بە زۆر و نابەدڵی دەبێت بیخۆن لەبەر تەندروستییان.
(١٩٦٤) واتە هەژار و سك برسی چاو دەڕێژێت خۆی جوان دەکات بۆ پۆشینی نەبوونییەکەی نەشکێن لە ناو خەڵکدا و کەم سەیر نەکرێن.
(١٩٦٥) واتە یاخی بووە و چاوەڕوانی کەتنێکی لێ دەکرێت.
(١٩٦٦) واتە نابێت مرۆڤ ئەوەندە خۆپەرست بێت ڕەنجی تەنها بۆ خۆی بێت.
(١٩٦٧) بە کەسێك دەوترێت نەخۆش و لەش بەبار بێت و تەندروستیی لە دەستدابێت و هیوای ژیانی نەمابێت.
(١٩٦٨)واتە زەلامێکی کەسێتیی لاواز و ترسنۆك و بوودەڵەیە.
(١٩٦٩) کاتێ میوان ڕووی تێکردی خوانیشت ئامادە نەبوو زمان شیرین و ڕووخۆش بە، زۆر بەلای میوانەکەوە خۆشترە.

نان کەرت بوو، خۆی ناگرێتەوە.[١٩٧٠]
نانێکم خواردووە بەو ڕۆنە، دەچم بەو ڕێ و شوێنەوە.[١٩٧١]
نانی کەوتۆتە ڕۆنەوە، دەڕوات بەو پێ و شوێنەوە.[١٩٧٢]
نانی ناوچەوانی خۆی دەخوات.[١٩٧٣]
نازانم ڕەحەتی گیانم.[١٩٧٤]
نازانێت هەڵپەڕێت، دەڵێت حەوشەکەی خوارە.[١٩٧٥]
ناز بە ئەندازە.[١٩٧٦]
ناعیلاجی سەر بە ماڵی دوژمندا دەکات.[١٩٧٧]

---

(١٩٧٠) واتە کوڕ ژنی هێنا و چووە ماڵی خۆی و کچ شووی کرد لە ماڵی باوکی شووی کرد لە ماڵی باوکی چووە دەرەوە کاتێك گەڕایەوە بۆ ماڵە باوك ئەو پەیوەندیی و متمانە کۆنەیان نامێنێت.
(١٩٧١) کەسێك دەیلێت ڕێی کەوتبێتە شوێنێك سوودمەند بووبێت، حەز دەکات جاری دیکەش سەر لەو شوێنە بداتەوە و دەستی لێ هەڵناگرێت.
(١٩٧٢) بە کەسێك دەوترێت دەست لەو شوێنە هەڵنەگرێت کە بەرژەوەندیی تیایدا بێت.
(١٩٧٣) واتە شانس شتێکە و بڕوا پێکراوە و لە خواوەیە.
(١٩٧٤) کەسێك دەیلێت کە خۆی دوور بخاتەوە لە هەموو بەرپرسیارییەك و زەرەرمەندییەك.
(١٩٧٥) بە کەسێکی نەزان و نەشارەزا دەوترێت کە خۆی ناشکێنێت و خەتا دەخاتە سەر کەسێکی دیکە.
(١٩٧٦) واتە ناز بۆ گەورە و بچووك لە سنووری خۆیدا وەکو دەڵێت منداڵی نازدار یان شێتە یان هار.
(١٩٧٧) بە کەسێك دەوترێت زۆر داماو بێچارە بێت هانا بۆ ناحەز و دوژمن بەرێت.

ناعیلاجی حەرام حەڵاڵ دەکات.[١٩٧٨]
ناکەم لۆمە، هەر بۆ خۆمە.[١٩٧٩]
نمەکیماڵی کردووە، ئێستاش پشتی تێ کردووە.[١٩٨٠]
ناوبژیکەر دڵی فراوانە.[١٩٨١]
ناوی بە کۆڵەکەی ئاشدا چێت.[١٩٨٢]
ناوی هەیە و ناوکی نییە.[١٩٨٣]
ناوی گەورە و دێی وێران.[١٩٨٤]
ناوێکی گران و ماڵێکی وێران.[١٩٨٥]
نۆکێك بە نۆ نانەوە دەخوات.[١٩٨٦]

---

(١٩٧٨) ئەمە بۆ کەسێکە زۆر بێ دەسەڵات بێت و لە تەنگانە بژی و زۆر داماو بێت.
(١٩٧٩) بە کەسانێك دەوترێت کە باسی خێزان و خزم و کەسوکاریان بکەن بە خراپە خۆیانی پێ دەشکێن.
(١٩٨٠) ئەمە بە کەسێکی سپڵە و نمەك بە حەرام دەوترێت.
(١٩٨١) لەبەر ئەوەی خۆی چمکی شەڕەکە نییە و تاوانی شەڕەکە ناخرێتە سەر شانی بە دڵ لەگەڵ هیچیان نییە.
(١٩٨٢) واتە ناوی نەبرێت و کوێر بێتەوە لە ئێستا بە دواوە.
(١٩٨٣) بە کەسێك دەوترێت تەنها بە ناو مرۆڤن کرداریان نییە، لێهاتوو نین.
(١٩٨٤) بە کەسێك دەوترێت تەنها بە ناو زلە و گەورەیە، شوێن شێواو و هیچ لەبارا نەبوو و لە دەست نەهاتوو.
(١٩٨٥) بە کەسێك دەوترێت ناونیشانێکی زۆر گەورەی پێوە بێت وەکو شێخ و ئاغا و بەگ و حاجی و مەلا بەڵام ماڵ شێواو و وێرانە ماڵ.
(١٩٨٦) بە کەسێکی ڕەزیلی پیسکەی چروك دەوترێت.

نقوومبوو پەنا بۆ پوشێك دەبات.[١٩٨٧]
نوێ هات کۆنە خەڵاتە.[١٩٨٨]
نۆی بمرێت لە باوان، کلی نابڕێ لە چاوان.[١٩٨٩]
نوێژ لەسەر داوێنی بکە.[١٩٩٠]
نوێژکەر نورینە، فەرمانبەر شیرینە.[١٩٩١]
نێچیری خۆت لە دەست مەدە.[١٩٩٢]
نە ئاگر نە دوو، هیچیان نابن بە شوو.[١٩٩٣]
نە دار نە پەردوو، لەعنەت لە هەردوو.[١٩٩٤]

---

(١٩٨٧) مرۆڤ لە کاتی تەنگانەدا پەنا بۆ هەموو شتێك دەبات.
(١٩٨٨) هەموو مرۆڤێك شتێکی تازەی بۆ ڕەخسا کۆنەی بەلاوە گرنگ نییە یان دەیبەخشێت یان بەلاوەی دەنێت.
(١٩٨٩) بەو کەسانە دەوترێت کە کەسیان بە خەیاڵدا نایەت و کەسیان بەلاوە گرنگ نەبێت و خەم نەخۆن هەر لەگەڵ فەنتازی خۆیان خەریکن.
(١٩٩٠) واتە متمانەت پێی بێت و سەری پێ بسپێرە.
(١٩٩١) واتە نوێژکەر دڵ خاوێن و ڕووخاوێن و بەرگ خاوێنن و فەرمانبەریش کار ڕاپەڕێنن و دڵی خەڵکیی ڕازی دەکەن و دڵی لە دڵی خەڵکیدا شیرینن.
(١٩٩٢) واتە ئەو شانسەی بۆت ڕەخساوە قەدری بزانە و بیپارێزە.
(١٩٩٣) دەگێڕنەوە کچێك جلەکانی بە باران تەڕ دەبێت، لەبەردەمی براکەیدا ناتوانێت جلەکانی داکەنێت و وشکی بکاتەوە ئەو قسەیە دەکات و دوایش براکە ئاشت دەکاتەوە و دەڵێت: (خۆشە ئاگر خۆشە دوو، برا خاسە، نەوەك شوو).
(١٩٩٤) ئەمە بە دووکەسی خراپ دەوترێت کەسیان لە کەسیان چاکتر نەبێت.

نه ئەرز قووتی دام، نه ئاسمان هەڵیکێشام.[1995]
نه ئەوەنده وشك بە بشكێیت، نه ئەوەنده تەڕ بە بگوشرێیت.[1996]
نه بای دیوه نه باران، هەڵدەبەزێت وەك جاران.[1997]
نه بۆ کوێر هەڵپەڕە، نه بۆ کەڕ گۆرانیی بڵێ.[1998]
نه بووکی نزیك باوان، نه کوندەی نزیك ئاوان.[1999]
نەبوونی شورەیی نییه بۆ کەس.[2000]
نه بەرگ بۆ کوێر، نه خواردن بۆ تێر.[2001]
نه بە زەردەخەنەی زاڵم باوەڕ بکە، نه بە خۆشی زستان.[2002]

---

(1995) کەسێك دەڵێت زۆر تەریق بووبێتەوه یان خەجاڵەت بووبێت.
(1996) واته مامناوەندیی له هەموو شتێکدا باشه و خەسڵەتی موسڵمانه.
(1997) بە کەسێك دەوترێت کارێك بکات خۆی لێ گێل بکات و گوێی خۆی لێ کەڕ بکات و خۆی نەکات بە خاوەنی کارەکەی.
(1998) واته ئەوەی ناتبینێت و لێت تێ ناگات خۆتی بۆ هیلاك مەکە.
(1999) واته فریای ماڵ و حاڵ و منداڵی خۆی ناکەوێت لەبەر هاتوچۆی ماڵی باوکی و کوندەی نزیك ئاوانیش زوو زوو ئاوی دەگۆڕن.
(2000) واته مرۆڤ بە شەرم شکۆوه جوانه، بەڵام له ڕووی هەموو جۆره کارێکەوه بۆ ژیان عار نییه بۆ مرۆڤ بیکات بۆ بژێوی خۆی.
(2001) واته کوێر نابینا هەست بە جوانیی پۆشاکی ناکات، تێریش لەزەت له خواردن نابینێت تا هەڵپەی بۆ بکات بە حەزەوه.
(2002) واته هەردووکیان کاتییه زۆر نامێنێتەوه وەکو هەڵخەڵەتاندن وایه.

**نە بە بەرخی تێر شیر بووم، نە بە کاوری تێر گیا.**[2003]
**نە بخۆیت نە بکەیت، تەماشای سای گەردنی بکەیت.**[2004]
**نە پێڵاوی تەنگ، نە خانەی بە جەنگ.**[2005]
**نە پێت هەڵکەویت لە مێخ، نە بچۆ بۆ لای شێخ.**[2006]
**نە پیاوی کەس بە، نە کەس پیاوتبێ، مەهێڵە کەسیش بە ماڵت فێر بێ.**[2007]
**نە ترە دەنگی بێت و نەتسە بۆنی بێت.**[2008]
**نە خانووی سەرشیو، نە ئاغاژنی کچەتیو.**[2009]
**نەخێر، بەوێر، نە تەکلیف لە کوێر.**[2010]

---

(٢٠٠٣) کەسێك دەیڵێت نە بە منداڵیی خێروخۆشی لە دایك و باوکی دیوە و نە بە گەورەیی لە ماڵ و منداڵ.
(٢٠٠٤) بە کەسێکی زۆر جوان و شیك دەوترێت کە جێگای سەرسوڕمان بێت.
(٢٠٠٥) واتە ئەو دوو شتە مرۆڤ زۆر بێزار دەکات و هیوای پێ نامێنێت.
(٢٠٠٦) واتە نە هەڵە بکە و نە ڕوو بکەرە چارەسەری.
(٢٠٠٧) واتە کەسێتیی خۆت بپارێزە و خۆت بە کەم مەزانە لە ئاستی هیچ کەسێك هیچ کەسێکیش بە کەمتر سەیر مەکە و ئاگات لە ماڵ و منداڵت بێت.
(٢٠٠٨) بە کەسێك دەوترێت لە هیچ ڕوویەکەوە کەڵك و سوودی نەبێت.
(٢٠٠٩) واتە خانووی سەرشیو پشتی پێ نابەسترێت و ئاغاژنی کچەتیویش هەروەها.
(٢٠١٠) خێرکردن بەوێر خێری پێ ناڵێن و تەکلیفیش لە کوێر ناکرێت.

**نەخۆش میوانی خوایە.[2011]**
**نە دیاری عەرەب نە شیری حوشتر.[2012]**
**نەدیوبدی هیچی نەدی.[2013]**
**نە دەرزیە بشکێت، نە دەزووە بپچرێت.[2014]**
**نە رەنج بۆ ناکەس، نە شین بۆ مردوو.[2015]**
**نەزان بە یەك پێ، زانا بە دوو پێ تێ دەکەوێت.[2016]**
**نە سێبەری بەردان، نە بەقای مێردان.[2017]**
**نەسرەوتن تا سەرکەوتن.[2018]**
**نە سەربانی لێژ نە بانگوشی گێژ.[2019]**

---

(٢٠١١) واتە زۆر لە نەخۆش نەکرێت بۆ خواردن.
(٢٠١٢) نە میوانداریتیی عەرەب نە دیارییەکەی.
(٢٠١٣) بە کەسێك دەوترێت کە دەبێتە خاوەنی شتێك زۆر لە خۆی دەگۆرێت.
(٢٠١٤) واتە ئەوەندە لاوازە کەڵکی ژیانی نەماوە.
(٢٠١٥) واتە خۆت بۆ نائەسڵ هیلاك مەکە، وەك ئەوە وایە شین بۆ مردوویەك بکەیت و نەیەتەوە و زیندوو نەبێتەوە.
(٢٠١٦) واتە ئەگەر نەزان لە نەزانی خۆی بەیەك پێ تیێ بکەوێت. زانا زۆر لە عەقڵی خۆی رازییە بە دوو پێ تێ دەکەوێت.
(٢٠١٧) واتە زۆر بڕوات نەبێت بە مانەوەی مێرد چونکە بەراورد کراوە بە مانەوەی سێبەری بەردێك کە کەم دەمێنێتەوە.
(٢٠١٨) واتە جموجوڵ و تێکۆشان لە ژیاندا سەرکەوتن بە دەست دێنێت.
(٢٠١٩) واتە هاوڕێیەتی کەسێك مەکە جێی متمانە و دڵنیایی نەبێت و هاوڕێیەتی کەسانی گێژ و گەمژەڵ مەکە.

نه سەلکی سیریت، نه قچکی پیاز.[2020]
نه سێ ماین له دۆلێك، نه سێ ژن لەسەر مۆلێك.[2021]
نه شیش بسووتێت نه کەباب.[2022]
نه شین بۆ بێکەس، نه ڕەنج بۆ ناکەس.[2023]
نه کالەك خۆریت نه بێستان ڕن.[2024]
نەمام به خواری گەوره بێت، به پیری ڕاست نابێتەوه.[2025]
نه وەك مووی سەر، نه وەك کلکی کەر.[2026]

---

(۲۰۲۰) به کەسێك دەوترێت خۆی هەڵقورتێنێته کارێك و کەسیش بەهای بۆ دانەنێت.
(۲۰۲۱) واته سێ ماین تێر ناخۆن لەسەر یەك ئاخوڕ و سێ ژنیش ڕێك ناکەون یەك سەرداریان هەبێت.
(۲۰۲۲) به دوولا دەوترێت کارێکی خێریان به دەستەوه بێت که هیچ لایەکیان پەلپ و گوشاریان نەبێت بۆ سەر ئەوی دیکه کەسیان زەرەرمەند نەبن.
(۲۰۲۳) واته شین بۆ بێکەس به هیلاك چوونه وەك وەك ئەو ڕەنجه وایه بۆ ناکەسبەچەی بکەیت به خەسار بچێت.
(۲۰۲٤) به کەسێك دەوترێت خۆی هەڵقورتێنێت له شتێك و هیچ پەیوەندیی نەبێت و سوودمەندیش نەبێت
(۲۰۲٥) واته پەروەردەی منداڵ له سەرەتاوه چاکه بیری لێ بکرێتەوه.
(۲۰۲٦) واته مرۆڤ پێویسته له هەموو کار و کردەوەیەکدا مامناوەند بێت.

# پیتی (و)

**وا وەیلای پیکەوتووە.[٢٠٢٧]**
**واز لە سەرخۆش بێتیت خۆی دەکەوێت.[٢٠٢٨]**
**واز لە مارەیکەی دایکی بێتیت، واز لە مافی خۆی ناهێنێت.[٢٠٢٩]**
**وتیان بۆ دەتریت..؟ وتی پاژنەم قلیشاوە.[٢٠٣٠]**
**وتیان نێرە..؟ وتی بیدۆشە.[٢٠٣١]**
**وتیان ڕێوی خوا غەزەبت لیٚ بگرێت. وتی بمکات بە ئاسک..؟؟[٢٠٣٢]**
**وتیان لە کویٚ زەمی خۆت بیست؟ وتی لە ماڵە دراوسیٚ؟[٢٠٣٣]**

---

(٢٠٢٧) بە کەسێك دەوترێت دوای تووشبوونی بە گیروگرفتێك چارەسەری بۆ نەکرێت و هاواری لیٚ هەڵسابێت.
(٢٠٢٨) واتە کەسی بیٚ هۆش و بیٚ ئاگا خودی خۆی ڕوو لە کەوتنە، پێویست ناکات کەس خۆی پێوە خەریك بکات.
(٢٠٢٩) بە کەسێك دەوترێت زۆر سەرسەختی بکات لەسەر مافی خۆی.
(٢٠٣٠) واتە خەتا تاڵە کەس نایخاتە سەرخۆی.
(٢٠٣١) واتە کەسێك کەللەڕەق و تێنەگەیشتوو بێت بە کەس ڕازی ناکرێت.
(٢٠٣٢) واتە مرۆڤی فێڵباز و فرتوفێڵاویی بە ساختە و کەڵەکەکانی ماوەتەوە و نایەوێت قەت بە پاکیی بڕوات نەوەکو زەرەرمەند بێت.
(٢٠٣٣) کەوابێت چاوی کامێرای دراوسیٚ هەموو شتەکان وەکو خۆی دەبینێت.

**وتیان ڕێوی خورما دەخۆیت یان مێوژ؟ وتی خورمیش.**[٢٠٣٤]
**وتیان حوشتر بۆ ملت درێژە؟ وتی دوور بینی پێ دەکەم.**[٢٠٣٥]
**وتیان شێتە بۆ شێتی؟ وتی بۆم دەلوێت بۆیە شێتم.**[٢٠٣٦]
**وتیان ئێستر باوکت کێیە؟ وتی خالم ئەسپە.**[٢٠٣٧]
**وتی ڕۆستەم نێربوو؟ یان مێ؟**[٢٠٣٨]
**وتی بێتە مەلا، وتی ئەستەغفرەڵا، وتی هانێ مەلا.. وتی بارەکەڵا.**[٢٠٣٩]
**ورگ دراوە، وشك و شێواوە.(٢٠٤٠)**
**وێری من و پارەی تۆ.**[٢٠٤١]

---

(٢٠٣٤) بە کەسێکی فێڵباز و دز دەوترێت کە دەیەوێت لە هەمووی بخوات.
(٢٠٣٥) واتە مرۆڤ پێویستە هەموو دەم دووربینیی دوارۆژی بکات.
(٢٠٣٦) بە کەسێك دەوترێت هەر داوا بکات بۆی بلوێت و بکرێت.
(٢٠٣٧) واتە مرۆڤ بە کەسێکەوە شانازیی دەکات کەسێتیی جوان بێت.
(٢٠٣٨)دەگێڕنەوە چیرۆکی ڕۆستەمی زاڵیان گێڕاوەتەوە بۆ زەلامێك. لە بەر ئەوەی زەلامەکە بە دڵی نەبوو و بێدەنگی بکات دەپرسێت ڕۆستەم نێر بوو یا مێ؟
(٢٠٣٩) بەراورد بە ئێستا مەلا موچەی نەبووە لە کۆندا لە مزگەوتەکاندا پێشنوێژی و ڕێنمایی خەڵکییان کردووە. پیاوە دەوڵەمەندەکانی گەڕەك یارمەتیان داون.
(٢٠٤٠).بە کەسێك دەوترێت هەرچی پەیدای دەکات دەیکاتە ورگییەوە گوێی نەداوەتە پۆشتە و پەرداخی خۆی لەناو خەڵکدا.
(٢٠٤١) بە کەسێك دەوترێت پیاوچاکیی بکات بە مەرجێك خۆی هیچی لە کیس نەچێت.

**ویژدان سەرچاوەی ئیمانە.**[٢٠٤٢]
**وەك ئاگری بن کا وایە.**[٢٠٤٣]
**وەك ئەسپێی کراس کۆن وایە.**[٢٠٤٤]
**وەك بەرزەکی باران بۆی دەرچوو.**[٢٠٤٥]
**وەك پیازی عەوالان خواردنی هەیە و بردنی نییە!**[٢٠٤٦]
**وەك پەشتەمالی حەمام، هەر رۆژەی بە بەر یەکێکەوەیە.**[٢٠٤٧]
**وەك پشیلە وایە پشتی ناکەوێت لە زەوی.**[٢٠٤٨]
**وەك تانجی ڕاو، لە کاتی ڕاودا گووی دێت.**[٢٠٤٩]

---

(٢٠٤٢) بە کەسێك دەوترێت ئەگەر ویژدانی بێت لە هەرچی دینێك بێت ئیماندارە.
(٢٠٤٣) بە کەسێك دەوترێت ژێر بە ژێر ئاژاوە بنێتەوە و ئاگر خۆشکات.
(٢٠٤٤) واتە زۆر بە گران مرۆڤ ڕزگاری دەبێت لێی.
(٢٠٤٥) بە کەسێك دەوترێت بەزمێك بنێتەوە و بۆی دەرچێت بەشداریی لەو شەڕ و ئاژاوەیە نەکات کە ناوییتیەوە.
(٢٠٤٦) هەندێك کەس ئەو پەندەی کردووە بە دروشمی ماڵەکەی، حەز دەکات لە ماڵیان خواردن بخورێت بەڵام هیچ نە بەخشێت.
(٢٠٤٧) بە کەسێکی بێ کارە و سووك دەوترێت کە بیەوێت نانی بەلاش و خزمەتکاریی بخوات ..
(٢٠٤٨) بە کەسێکی تەماعکار دەوترێت هەر خەریکی قاچ و قوچ حەرەمخۆرییە و نایەڵێت زەرەرمەندیش بێت و بکەوێت.
(٢٠٤٩) بە کەسێك دەوترێت شتی ناوەختی بۆ دێتە پێشەوە هیوا و نێچیرەکەی لە دەست بدات و نەپەرژێتە سەری.

**وەك تەڵەی تەقیوی لێهاتووە.**(٢٠٥٠)

**وەك تری پن گۆم رۆی.**(٢٠٥١)

**وەجاخ کۆڵە خۆی نییە لە گەڵت بگەرێت.**(٢٠٥٢)

**وەجاخ زادە هانینی گرانە، ڕاگرتنی ئاسانە.**(٢٠٥٣)

**وەك چرا ڕووناکیی بۆ دەوری و تاریکیی بۆ ژێری.**(٢٠٥٤)

**وەك چرا وایە شەوقی بۆ ژێر خۆی نییە.**(٢٠٥٥)

**وەك خەنجەری دەبان لە کەلانا ناوەستێت.**( ٢٠٥٦ )

**وەك زاواکەمان کوێرە، بووگەکەشمان بێ خێرە.**(٢٠٥٧)

---

(٢٠٥٠) واتە توانای قسە و بەرگری نەماوە لە خۆی بکات.

(٢٠٥١) بە کەسێك دەوترێت زۆر بە ناحەق ڕۆیشتوو گۆڕی گومبوو.

(٢٠٥٢)واتە وەجاخ کار و کردەوە و ڕەوشتی بەرز ناخی مرۆڤی گرتووە.

(٢٠٥٣)وەجاخزادە خۆی بە هاوشان و هاودەمی هەموو کەس نازانێت بە هەموو کەس ڕازی نابێت. کە شووی کرد کەموکورتیش ئاشکرا ناکات لەبەر کەسێتیی خۆی.

(٢٠٥٤) بە کەسێك دەوترێت خێر بداتەوە بۆ دەوروبەر و بەردەمی بەڵام خۆی لە هیلاکیی و تاریکیی و تەنگانەدا بێت.

(٢٠٥٥) بە کەسێك دەوترێت خێر و بەرەکەتی بۆ هەموو کەس بێت بەڵام بیر لە خۆی نەکاتەوە.

(٢٠٥٦) بە کەسێکی ئازا و بەجەوهەر دەوترێت بیەوێت لە کۆمەڵدا سەر دەرهێنێت.

(٢٠٥٧) واتە خێزانێکن لە هەموو لایەکەوە زەرەرمەندن.

**وەستای قسانە و کوڵەواری دەستانە.**[2058]
**وەك سوێنەی چەور ئاو ناگرێتە خۆی.**[2059]
**وەك سەگ بە مانگەشەو بوەرێت وایە.**[2060]
**وەك سەگی پێ سووتاو وایە.**[2061]
**وەك شێری کولاو هەڵدەچێت.**[2062]
**وەك کەلەشێری ناوەخت وایە.**[2063]
**وەك کەو چووە.**[2064]
**وەك کەری دێز تۆپینی خۆی و زەرەری خاوەنی دەوێت.**[2065]
**وەك کەری ناو جۆگە، لە هەردوولا دەخوات.**[2066]

---

(٢٠٥٨) بە کەسێك دەوترێت بە قسەی زل هیچی نەهێشتۆتەوە بەڵام هیچ کارێکی لە دەست نایەت و لێنەهاتووە.
(٢٠٥٩) واتە کەسێکی بێعار و چاو قایمە.
(٢٠٦٠) بە کەسێك دەوترێت قسەی خراپ و جنێو بدات بەڵام هیچ کار ناکاتە سەر بەرامبەرەکەی، یان جنێو بە پیاوێکی گەورە بدات.
(٢٠٦١) بە کەسێك دەوترێت پیشەی گەڕۆکی بێت بە هەموو کونێکەوە بێت.
(٢٠٦٢) بە یەکێك دەوترێت زۆر تورە و تڕۆ بێت و هیچ تێ نەگات و دوایش کە دامردەوە پەشیمان بێتەوە.
(٢٠٦٣) بە کەسێك دەوترێت کار و کردەوەی لە کاتی خۆیدا نەبێت و بێزار کەر بێت.
(٢٠٦٤)بە کەسێك دەوترێت هیچ پێ نەمابێت و بۆی نەکرێت و حەپەساو بێت.
(٢٠٦٥) بە کەسێك دەوترێت قێزەوەند بووبێت حەز بە لەناوچوونی خۆی دەکات ئەگەرچی خاوەنەکەشی زەرە مەند بێت.
(٢٠٦٦)بە کەسێك دەوترێت بۆ سوودمەندی خۆی دڵی هەردوولای ڕاگرتووە.

**وەك گای عەلی خۆی دەلیسێتەوە.**[٢٠٦٧]

**وەك گەنمی قەندەهاری وایە.**[٢٠٦٨]

**وەك گوو وایە تاچیلکەی تێوە دەیت بۆنی دێت.**[٢٠٦٩]

**وەك گوریسی ناو هەمانە وایە.**[٢٠٧٠]

**وەلی لە پەریان دەبێت و پەری لە وەلیان دەبێت.**[٢٠٧١]

**وەلی وەلی دەناسێت.**[٢٠٧٢]

**وەڵامی دوور درۆیە.**[٢٠٧٣]

**وەڵام هەر شەق نییە.**[٢٠٧٤]

**وەك مشتەی ناو هەمانەکە وایە.**[٢٠٧٥]

**وەك مار مەکانی نییە.**[٢٠٧٦]

**وەك ماری بێ ئیجازە وایە.**[٢٠٧٧]

---

(٢٠٦٧) بە کەسێکی بێ ئیش و بێکار دەوترێت هەر بخوات و بنوێت.

(٢٠٦٨) واتە کەسێکی جوان و ڕاست و بە بەهایە.

(٢٠٦٩)وەك کەسێك وایە تابیدوێنێیت هەڵە دەکات و بێزارت دەکات.

(٢٠٧٠)واتە کەسێکە دەروون ئاڵۆزە و هەڵنایەت بە کەس.

(٢٠٧١) واتە ئەوەی چاك ئافرەتی چاك دەیخاتەوە و کچی چاکیش نەوەی پیاوی چاکە.

(٢٠٧٢) خواناس و پیاو چاك یەکتر دەناسن و شارەزای یەکن.

(٢٠٧٣) لە بەر ئەوەی دەماودەم دەکەوێت و قسەکان گۆڕینیان تێ دەکەوێت.

(٢٠٧٤) واتە بۆ عاقل ئیشارەتێك بەسە.

(٢٠٧٥) واتە لە ڕوو هیچ ناڵێت بە نهێنیی بە توانج و پلارە.

(٢٠٧٦) بەوانە دەوترێت بێ دەنگ و بێ خشپە بە هەموو شوێنێکەوەن.

(٢٠٧٧) بەو کەسانە دەوترێت لە ناکاو خەڵك زەرەرمەند دەکەن.

**وەك مامە خەمە وايە.**[٢٠٧٨]
**وەك میزی حوشتر وايە.**[٢٠٧٩]
**وەك ماستی مەيووڕ وايە.**[٢٠٨٠]
**وەك نیسكێتە هەڵدەچێت.**[٢٠٨١]
**وەك نیسك بەر و پشتی بۆ نییە.**[٢٠٨٢]
**وەك هەویر هەموو شتێكی لێ دروست دەكرێت.**[٢٠٨٣]

---

(٢٠٧٨) بە كەسێك دەوترێت هەموو كات خەم و بێدەنگیی دایگرتووە.
(٢٠٧٩) واتە مرۆڤێكە تواناى پێشكەوتنى نییە هەر بەرەو دواوە دەڕوات.
(٢٠٨٠) بە كەسێك دەوترێت جووڵەی لە خۆی بڕی بێت و نقە نەكات.
(٢٠٨١) نە كەسێك دەوترێت بە پەلەپیتكەیەك تووڕە بێت.
(٢٠٨٢) بە كەسێك دەوترێت لە هەموو بابەتێك بلێت و دوو ڕوو بێت و مرۆڤ كەم هەست بە دووڕووییەكەی بكات.
(٢٠٨٣) واتە زۆر سادە و ساكارە و هەژار عەقڵە.

# پیتی ( ه )

**هانام کرده دەمت.**[٢٠٨٤]
**ها نەکەم، را نەکەم، ئەی قوری کویَ بە سەرما بکەم.**[٢٠٨٥]
**هالاویَك خۆشترە لە پلاویَك.**[٢٠٨٦]
**هاوسێ لە هاوسێ، دەگریَت سەراسێ.**[٢٠٨٧]
**هاورێ و دۆستی تەنگانە، دەگمەنە.**[٢٠٨٨]
**هاوڕێیەکی باش لە هەزار برای خراپ باشترە.**[٢٠٨٩]
**هەتا تاڵیی نەبینینت، تامی خۆشی ناچیژیت.**[٢٠٩٠]
**هەتا جوانی مەستی، کە پیر بوویت سستی، کەی خوا دەپەرستی.**[٢٠٩١]

---

(٢٠٨٤)بە کەسێك دەوترێت کە مژدەیەکی خۆش بدات بە بەرامبەرەکەی .
(٢٠٨٥) کە سێك دەیڵێت خرابیتە ژێر گوشارێکی گەورەوە.
(٢٠٨٦)کاتێك مرۆڤ زۆری سەرما بێت بیر لە خۆ گەرمکردنەوە دەکات، نەك پلاو خواردن.
(٢٠٨٧) واتە دراوسێ خووی دراوسێ دەگرێت.
(٢٠٨٨) واتە کەم کەس هاوڕێی تەنگانەیە.
(٢٠٨٩) واتە ئەگەر برا بێت و خراپ بێت با هەر نەبێت.
(٢٠٩٠) مرۆڤ تا ڕەنج نەدات و هیلاك نەبێت، تامی خۆشی ژیان ناچێژێتن
(٢٠٩١) بە کەسێك دەوترێت تا گەنجە سەرقاڵی هەندێك کاری دنیاییە تا لەمانە دەبێتەوە دەکەوێتە تەمەنەوە و دوایی بیر لە مردن و قیامەت دەکاتەوە.

**هەتا جوزردان، سەد پاشا گەردان.**[2092]
**هەتا خاوەن ماڵ دزی گرت، دز خاوەن ماڵی گرت.**[2093]
**هەتا خۆم بووم بە بانانەوە، بەرتیلیان دەدا و دەپاڕانەوە.**[2094]
**هەتە درێخی مەکە، نیتە قەرز مەکە.**[2095]
**هەتا قەلەرەش ڕێنیشاندەرت بێت، دەبێت گەورەمان هەر دەربەدەربێت.**[2096]
**هەتاکو جوانیت کارت پەسەندە، بە پیریش ناڵێن کەرت بە چەندە.**[2097]
**هەتا گندۆرە بوو قەوم و قیلەمان زۆر بوو.**[2098]

---

(٢٠٩٢) واتە تا دنیا بمێنێت زەمان لە گۆڕیندایە و هەزاران بەسەرهاتی دیکە ڕوو دەدات.
(٢٠٩٣) بە کەسێك دەوترێت گلەیی بەسەرەوە بێت بەڵام پێش دەمکردنەوەی ئەم ئەوی دیکە گلەیی خۆی تەواو کرد.
(٢٠٩٤) واتە هەتا مرۆڤ گەنج و جوان و بە هێز و لێهاتووە هەموو کەس بە دەوریا دێت و دەچێت و هیوای پێیەتی بەڵام کە ئەو تەمەنەی بەجێهێشت کەس ئاوڕی لێ ناداتەوە.
(٢٠٩٥) واتە کە بووت خێر و چاکە و پیاوەتی بکە. کاتێك نەشت بوو خۆت مەخەرە ژێر باری قەرزەوە.
(٢٠٩٦) واتە هەتا کەسێکی خراپ و ناڵەبار و دوژمن بە میللەت بمانبات بەڕێوە، دەبێت پیاو چاکمان دەربەدەربێت خاکبەسەر بێت.
(٢٠٩٧) واتە تا گەنج و جوانیت کارت پەسەند و دەڕوات بەڵام لە پیریا کەس لێت ناپرسێتەوە و گوێت لێ ناگرێت.
(٢٠٩٨) واتە تا دەوڵەمەند بیت و خواردن و کردن هەبێت کەسوکار لەگەڵت دەخۆن.

## پیتی (ه)

**هانام کرده دەمت.[٢٠٨٤]**
**ها نەکەم، را نەکەم، ئەی قوری کویْ بە سەرما بکەم.[٢٠٨٥]**
**هالاویك خۆشترە لە پلاویك.[٢٠٨٦]**
**هاوسێ لە هاوسێ، دەگریت سەراسێ.[٢٠٨٧]**
**هاورێ و دۆستی تەنگانە، دەگمەنە.[٢٠٨٨]**
**هاورێیەکی باش لە هەزار برای خراپ باشترە.[٢٠٨٩]**
**هەتا تالیی نەبینینت، تامی خۆشی ناچیژیت.[٢٠٩٠]**
**هەتا جوانی مەستی، کە پیر بوویت سستی، کەی خوا دەپەرستی.[٢٠٩١]**

---

(٢٠٨٤)بە کەسێك دەوترێت کە مژدەیەکی خۆش بدات بە بەرامبەرەکەی .
(٢٠٨٥) کە سێك دەیڵێت خرابێتە ژێر گوشارێکی گەورەوە.
(٢٠٨٦)کاتێك مرۆڤ زۆری سەرما بێت بیر لە خۆ گەرمکردنەوە دەکات، نەك پلاو خواردن.
(٢٠٨٧) واتە دراوسێ خووی دراوسێ دەگرێت.
(٢٠٨٨) واتە کەم کەس هاورێی تەنگانەیە.
(٢٠٨٩) واتە ئەگەر برا بێت و خراپ بێت با هەر نەبێت.
(٢٠٩٠) مرۆڤ تا رەنج نەدات و هیلاك نەبێت، تامی خۆشی ژیان ناچێژێتز
(٢٠٩١) بە کەسێك دەوترێت تا گەنجە سەرقاڵی هەندێك کاری دنیاییە تا لەمانە دەبێتەوە دەکەوێتە تەمەنەوە و دوایی بیر لە مردن و قیامەت دەکاتەوە.

**هەتا جوزردان، سەد پاشا گەردان.**[2092]
**هەتا خاوەن ماڵ دزی گرت، دز خاوەن ماڵی گرت.**[2093]
**هەتا خۆم بووم بە بانانەوە، بەرتیلیان دەدا و دەپاڕانەوە.**[2094]
**هەتە درێخی مەکە، نیتە قەرز مەکە.**[2095]
**هەتا قەلەرەش ڕێنیشاندەرت بێت، دەبێت گەورەمان هەر دەربەدەربێت.**[2096]
**هەتاکو جوانیت کارت پەسەندە، بە پیریش ناڵێن کەرت بە چەندە.**[2097]
**هەتا گندۆرە بوو قەوم و قیلەمان زۆر بوو.**[2098]

---

(٢٠٩٢) واتە تا دنیا بمێنێت زەمان لە گۆڕیندایە و هەزاران بەسەرهاتی دیکە ڕوو دەدات.
(٢٠٩٣) بە کەسێك دەوترێت گلەیی بەسەرەوە بێت بەڵام پێش دەمکردنەوەی ئەم ئەوی دیکە گلەیی خۆی تەواو کرد.
(٢٠٩٤) واتە هەتا مرۆڤ گەنج و جوان و بە هێز و لێهاتووە هەموو کەس بە دەوریا دێت و دەچێت و هیوای پێیەتی بەڵام کە ئەو تەمەنەی بەجێهێشت کەس ئاوڕی لێ ناداتەوە.
(٢٠٩٥) واتە کە بووت خێر و چاکە و پیاوەتی بکە. کاتێك نەشت بوو خۆت مەخەرە ژێر باری قەرزەوە.
(٢٠٩٦) واتە هەتا کەسێکی خراپ و نالەبار و دوژمن بە میللەت بمانبات بەڕێوە، دەبێت پیاو چاکمان دەربەدەربێت خاکبەسەر بێت.
(٢٠٩٧) واتە تا گەنج و جوانیت کارت پەسەند و دەڕوات بەڵام لە پیریا کەس لێت ناپرسێتەوە و گوێت لێ ناگرێت.
(٢٠٩٨) واتە تا دەوڵەمەند بیت و خواردن و کردن هەبێت کەسوکار لەگەڵت دەخۆن.

**که گندۆره بەسەرچوو قەوم و قیلەش بۆی دەرچوو.**[2099]

**هەتا مابووم پێڵاوێك نەبوو لە پام، کە مردیشم هەزار جووت جێما لە دوام.**[2100]

**هەتا ماڵ وەستابێت، بە مزگەوت حەرامە.**[2101]

**هەتا مرد کراسێك نەبوو لە بەریا، کە مرد ئاڵایان دەکرد بە سەریا.**[2102]

**هەتا من وتم بیسمیلا، ئەو وتی ئەلحەمدو لیللا.**[2103]

**هەتا هەتە، عالەم کەستە.**[2104]

**هەتیو مەیلی هەتاو دەکات.**[2105]

**هەتیوچە بە دەنکە جۆیەك زەرپینی دێت.**[2106]

---

(٢٠٩٩)واتە کەوتیتە نەبوونی هەژاریی کەس ئاورت لێ ناداتەوە.

(٢١٠٠) مرۆڤ لە ژیانیدا تا گەنجە فریای خۆی ناکەوێت یا بەری ناکەوێت لەبەر ماڵ و منداڵ، کاتێك لێ دەکەوێت خاوەنی زۆر شتە و دڵی پێی خۆش نییە و بە کاری ناهێنێت.

(٢١٠١) تا ماڵەکەی خۆت پێویستی پێت بێت مەیدە بە کەس.

(٢١٠٢) واتە زۆر کەس لە ماڵی خۆیدا بە هەژاریی دەژی و دەمرێت بەڵام لە ماتەم و تەرم بەرێکردنیا رێورەسم و سیمیناری بۆ ساز دەکەن..

(٢١٠٣) بە کەسێك دەوترێت زۆر بەپەلە نان بخوات و هیچ ئەتەکێتێکی خواردن فێر نەکرابێت.

(٢١٠٤) واتە تا مرۆڤ هەبوو بێت جێگای شانازیی و نزیکبوونەوەی کەسوکارێتی و هەموو کەس بە گرنگ تێی دەروانێت.

(٢١٠٥) واتە رووتورەجاڵ و هەژار پەنا دەبەن بۆ پەنا گەرمە سروشتییەکان.

(٢١٠٦) لەبەر ئەوەی پێشتر زۆر بە کەم خۆی دیوە.

**هەسان دەدات لە بنی پێی.**[2107]
**هەشت بێ و لە مشت بێت، نەك نۆ بێ و نەبێت.**[2108]
**هونەرمەند لە هیچ لایەك پەكی ناكەوێت.**[2109]
**هەنگوین بە دەمی تاڵە.**[2110]
**هی خۆم بۆ خۆم، هی تۆش دەخۆم.**[2111]
**هەر با سیر بخوات و زورنا لێدات.**[2112]
**هەر پیاوێكە هەزار پیاو دەهێنێت.**[2113]
**هەر پەنجەیەك خوێنی خۆی لێ دێت.**[2114]

---

(٢١٠٧) بە كەسێك دەوترێت كە یەكێك هانی بدات بۆ كارێكی خراپ و هەڵیخزێنێت بەرەو مەرامێك.
(٢١٠٨) بە شتێك دەوترێت كە ڕێژەكەی كەمیش بێت لە دەست خۆیدا بێت، نەك زۆر بێت بە دەست ئەم و ئەو بێت.
(٢١٠٩) واتە هونەرمەند دڵی زۆر پاكە و خۆشی هەموو لایەكی دەوێت.
(٢١١٠) بە كەسێك دەوترێت ژیانی زۆر ناخۆش بێت و لە لەزەتی دنیا بە دووربێت.
(٢١١١) بە كەسێكی زۆردار و چاوبرسی دەوترێت كە چاوی بڕیوەتە شتی خەڵك.
(٢١١٢) بە كەسێك دەوترێت كە هەر دەڵێت و خۆی هیلاك دەكات، كەس ڕازی نابێت بەوەی ئەو دەیەوێت و دەیڵێت.
(٢١١٣) واتە یەك پیاوی پیاوانە و عاقڵ و ئازا گرفتی هەزار پیاوی بێ عەقڵ چارەسەر دەكات.
(٢١١٤) واتە هەر منداڵێك خۆشەویستیی و یادگاری خۆی هەیە لای دایك و باوكی. لە بەسەرهاتیانە هەریەك ژانی خۆی هەیە بۆیان.

**هەر جارێك بە زستان دەڵێن ساردە.[٢١١٥]**
**هەر چەند بارم لارە، راوێژم سوارە.[٢١١٦]**
**هەر چیایەك دۆڵی خۆی هەیە.[٢١١٧]**
**هەر چەندە پیرە، کۆنە بگیرە.[٢١١٨]**
**هەرچی غەم بێت، میوانی نییە.[٢١١٩]**
**هەرچی لە دیزایە، بە ئەسکوێ دەدەرێ.[٢١٢٠]**
**هەرچی بترسێت ناخەلەسێت.[٢١٢١]**
**هەرچی بچێتە شاری کوێران، دەبێت دەست بە چاوەوە بگرێت.[٢١٢٢]**

---

(٢١١٥) واتە وشەی زستان بە مانای سارد، پێویست ناکات دووبارە بکرێتەوە واتە مرۆڤێك خراپ بوو یەکجار بەسە، بوترێت خراپە.
(٢١١٦) کەسێك دەیلێت هەژار و لێقەوما و بارکەوتوو بێت بەلام قسەزان و ژیر و خاون بیرە و خەلکیی لێی‌تێ دەگات.
(٢١١٧) واتە هەموو بەرزبوونەوەیەك نشێوی و هاتنەخوارەوەی بە دوایا دێت.
(٢١١٨) مرۆڤ چەند پیر بێت و بەرەو تەمەن بڕوات، ئەزموونی زیاتر و قسەی ڕەواتر دەبێت.
(٢١١٩) بە کەسێك دەوترێت یا عەقڵی بە ژیان نەشکێت یان گوێ نەداتە هیچ یان شێت بێت.
(٢١٢٠) ئەمە بە دوو کەس دەوترێت شارەزای نەنگی یەکتر بن هەریەکە هەڕەشەی ئاشکرا بوونی نەنگی ئەوی دیکە بکات.
(٢١٢١) ترس بۆ مرۆڤ کارێکی باش نییە. دەبێتە سەرلێشێواندن و تووشبوون، ئازایەتی و یەك بڕیار ناهێڵێت.
(٢١٢٢) هەر کەسێك ڕوو بکاتە ناو هەر هۆز و میللەتێکەوە دەبێت وەکو ئەوان هەڵسوکەوت بکات.

**هەرچی بیتە پیشم، پیا دەکیشم.**[٢١٢٣]
**هەرچی ڕیشی بوو سۆفی نییە.**[٢١٢٤]
**هەرچی ڕیشی سوور بوو هەمزاغایە.**[٢١٢٥]
**هەرچی لە مشك بیت جەواڵ دەدرێت.**[٢١٢٦]
**هەرچی بەرز بفرێت پیا دەترێت.**[٢١٢٧]
**هەرچی دەیخەیتە سەرسینی، بیخەرە سەرپشتی سینی.**[٢١٢٨]
**هەر خوایان یەکە.**[٢١٢٩]
**هەر خوا خوایە، دنیا کا و بایە.**[٢١٣٠]

---

(٢١٢٣) بە کەسێك دەوترێت بەزۆرداریقلەوپایە بە دەست بێنێت و داگیری بکات.
(٢١٢٤) واتە وانییە و نابێت وابێت.
(٢١٢٥) نەخێر، ئەمە بڕیارێکی ناپەسەندە، خەتا و شێوەی کەس، نە کەس پەسەند دەکات، نە تاوانبار ، نە کەس گەورە دەکات.
(٢١٢٦) بە پیاوێکی خراپ دەوترێت وەچەکەشی وەك خۆی خراپ بێت.
(٢١٢٧) بە کەسێك دەوترێت خۆی لە ئاستی خەڵکیدا لووت بەرز بگرێت و خۆی بە زیاتر بزانێت دواییش ترۆکردن و شکاندن ئەنجامی بێت.
(٢١٢٨) بە کەسێك دەوترێت بە کارە ئاساییەکانی خەڵکیی خستبێتە ژێر منەتی خۆیەوە و هەڕەشە بکات لەوە دوا بۆیان نەکات، ئەوانیش بۆیە دەڵێن: (بیخەرە سەر پشتی سینی بۆ ئەوەی قلْپ بێتەو و نەمانگاتێ).
(٢١٢٩) بە دوو مرۆڤ دەڵێن کە لە هەموو ڕوویەکەوە جیاوازییان هەبێت بەڵام جێی سەرسوڕمانە چۆن یەککەوتون و گونجاون.
(٢١٣٠) واتە تەنها خوا بە گەورەیی خۆی دەمێنێتەوە هەمووی کەسێك دەمرێت و دەڕوات وەکو بابردە.

هەر دەوەنە دەبێت بە دار.[٢١٣١]
هەر دارێك نەرم بێت كرم دەیخوات.[٢١٣٢]
هری لە بری ناكاتەوە.[٢١٣٣]
هەرزان بەها بێ مەلامەت نییە.[٢١٣٤]
هەر سەنگە نرخی خۆی هەیە.[٢١٣٥]
هەر سەرەی سەودایەك.[٢١٣٦]
هەر شتەی چێژی خۆی هەیە.[٢١٣٧]
هەر عەقڵەی لە خەسارەیەك.[٢١٣٨]
هەر كەس بانی فرەترە، بەفری زۆرترە.[٢١٣٩]

---

(٢١٣١) بە كەسێكی كەم و بچووك و بوودەڵە دەوترێت لە پاشەڕۆژدا پێ بگات و پلە و پایە وەرگرێت ببێتە سایە و سێبەر خەڵكیی بحەسێتەوە لەژێریدا.
(٢١٣٢) كەوابێت مرۆڤ لەپاڵ پیاوەتیی و چاكیدا بەرگریش لە خۆی بكات و زۆر نەرم نەبێت بفەوتێت.
(٢١٣٣) بە كاربەدەستێكی نەشارەزا دەوترێت هیچ لە كارەكەی نەزانێت.
(٢١٣٤) مرۆڤ شتی خراپ و بێ كەڵك بەزەرەریش بێت لە كۆڵ خۆی دەكاتەوە.
(٢١٣٥) واتە نرخی هەموو شتێك بە قەوارە نییە بە بەها و بە جۆرە، ئاڵتون نرخی جیاوازی لەگەڵ زیودا، واتە مرۆڤیش بە پێی كرداریان سەنگ دەكرێن.
(٢١٣٦) هەر مرۆڤێك سروشت و بیركردنەوەی خۆی هەیە.
(٢١٣٧) واتە هەموو شتێك لە سوودبەخشین و هاوڕێیەتیدا وەك یەك نین.
(٢١٣٨)دوای بە هەڵەچوون و زەرەر وانە وەردەگریت و دەبێتە خاوەن ئەزموون.
(٢١٣٩) بە كەسێك دەوترێت تا ماڵ و منداڵی زیاتر بێت ئەرك و هیلاكیی زیاترە.

هەر کەس زۆر بگەڕێت، زۆر دەبینێت.(٢١٤٠)
هەر کەس زۆر بخوات زۆر نازێ.(٢١٤١)
هەر کەس کەر بێت ئەو کورتانە.(٢١٤٢)
هەر کەس رۆی سەلا لە چاوی خۆی.(٢١٤٣)
هەر کەس لە ماڵی خۆیدا سەری شا دەبڕێت.(٢١٤٤)
هەر کەس نانی ناوچەوانی خۆی دەخوات.(٢١٤٥)
هەر کەس لە خۆی بگرێتەوە، خواش لەو دەگرێتەوە.(٢١٤٦)
هەر کەس لە ماڵی خۆیدا جنێو بە شا دەدات.(٢١٤٧)
هەر کەس لە کراسی خۆیدا پیاوە.(٢١٤٨)

---

(٢١٤٠) واتە هەر کەسێك بە شاران و وڵاتاندا بگەڕێت زۆر عاقڵ و دنیادیدە دەبێت و دەبێتە مرۆڤێکی دانا و خاوەن ئەزموون.
(٢١٤١) خواردی زۆر و هەراشی دەبێتە هیلاکیی کۆئەندامی هەرس و تێکچوونی سەنگەکان و قەڵەوبوون و پیربوون و مردن.
(٢١٤٢) بەو کەسانە دەوترێت حەز بە هاوڕێیەتی مرۆڤی بێ عەقڵ و سادە بکەن و دوای بکەون.
(٢١٤٣) واتە هەر کەس بمرێت خۆی دەڕوات و کەس لەدوای کەس نامرێت.
(٢١٤٤) هەموو مرۆڤێك لە ماڵی خۆیدا سەربەستە هەرچی بڵێت و بیکات.
(٢١٤٥) واتە شانس و بەخت لای خوای گەورەیە.
(٢١٤٦) واتە ئەو ڕەنجەی مرۆڤ دەیدات با لەپێشا خۆی تێری لێ بخوات چونکە لە هەموو کەس زیاتر بە خۆی حەڵاڵە.
(٢١٤٧) واتە مرۆڤ لەماڵی خۆیدا سەربەستە و ئازادە هەرچی دەیکات و دەیڵێت.
(٢١٤٨) کەوابێت هەموو کەس هەر جۆرێك بێت خۆی بە پیاو دەزانێت.

**هەر کەسەی بە کەسێك دەگیرێت.[٢١٤٩]**
**هەر کەسەی دەست بۆ دەمی خۆی دەبات.[٢١٥٠]**
**هەر کەسەی بە پێی عەقڵی بیدوێنە.[٢١٥١]**
**هەر کەسەی گوێز لە باری خۆی دەژمێرێت.[٢١٥٢]**
**هەر کێو بە کێو ناگات.[٢١٥٣]**
**هەر گوێرەکەیە دەبێت بەگا.[٢١٥٤]**
**هەر لە عەرشەوە هەتا قوورش، کەس بە دۆی خۆی ناڵێت ترش.[٢١٥٥]**
**هەر گاڵتەیەك مەبەستێکی لە دواوەیە.[٢١٥٦]**

---

(٢١٤٩) بچیتە بنجوبناوانی هەر کەسێك دەتوانیت مامەڵەی بکەیت و ڕازی بکەیت.
(٢١٥٠) هەر کەس ڕەنج بۆ خۆی دەدات و بۆ خۆی دەگری.
(٢١٥١) بۆ ئەوەی هیلاك نەبیت بەکەسەوە شێت و زانا و پیاوی کەر بە پێی عەقڵیان لەگەڵیان بدوێ و مامەڵەیان لەگەڵ بکە.
(٢١٥٢) واتە هەموو کەسێك بە پێی سوودمەندی خۆی دەدوێت.
(٢١٥٣) واتە مرۆڤ دەبێت ئاگای لە زمان و کاروکردەوەی خۆی بێت مرۆڤ نەمرێت دەگاتەوە بە مرۆڤ.
(٢١٥٤) هەموومان دەبێت وریا و بە ئاگابین و بە خزمەت بین بۆ منداڵە وردەکانمان، ڕۆژێك دێت گەورە و بە توانا بین.
(٢١٥٥) لەم سەری دنیاوە تا ئەو سەری دنیا کەس دان بە نەنگ و کەموکورتیی خۆیدا نانێت.
(٢١٥٦) واتە گاڵتەکردن بە کەسێك تیرێکی ناڕاستەوخۆیە و ڕاستییەکی لە پشتەوە مەبەستە.

**هەر هەمان تاس و حەمامە.** [٢١٥٧]
**هەزاری بمرێت لە باوان، کلی نابرێت لە چاوان.** [٢١٥٨]
**هەزار تەڵەی بە کلك تەقاندووە.** [٢١٥٩]
**هەزار دۆست، نەك یەك دوژمن.** [٢١٦٠]
**هەزار دۆست کەمە، دوژمنێك خەمە.** [٢١٦١]
**هەژاری بەرگی ئاگرینە.** [٢١٦٢]
**هەزار ساڵ بکەیت بێگانە پەرستیی، دوایی هەر دێتیت نوشستیی.** [٢١٦٣]
**هەزار فاکم بە فیکیکی.** [٢١٦٤]
**هەزار قەزوان بە گوێزێك نابێت.** [٢١٦٥]

---

(٢١٥٧) واتە هیچ گۆڕانکارییەکی تێ نەکەوتووە و هەمان ئامرازی هەیە.
(٢١٥٨) بە کەسێك دەوترێت لە خۆی زیاتر کەسی بە خەیاڵدا نەیەت و خەم بۆ کەس نەخوات، هەر خەریکی تیفتیفەی خۆی بێت.
(٢١٥٩) بە کەسێکی خوێڕی و فێڵباز و کەڵەکباز دەوترێت.
(٢١٦٠) واتە دۆست تا زۆر بێت کەمە و دوژمنێك خەمە.
(٢١٦١) واتە تا دۆست زۆر بێت دڵنیایی بۆ ژیانت زیاتر دەبێت بەڵام یەك دوژمن دوور بێت یا نزیك مرۆڤ دەخاتە پەژارەوە.
(٢١٦٢) هەژاریی ئەوەندە گرانە، نەك ڕوو بسووتێنێت ناخی مرۆڤ دەبرژێنێت.
(٢١٦٣) چاکە کردن لە گەڵ بێگانە ئەنجامی نییە و خۆ هەڵخەڵەتاندنە چونکە دوور کەوێتەوە هیچتان لە هیچ.
(٢١٦٤) واتە من درەقەتی ئەو فێڵبازی ساختەچییە نایەم .
(٢١٦٥) هەزار هەرزەکار و منداڵ ڕۆڵی پیاوێکی گەورە نابینن.

**هەزار قور و چڵپاوی پیا هەڵپڕژاوە.**(٢١٦٦)

**هەزار گوناهو یەك تۆبە.**(٢١٦٧)

**هەموو جارێك گۆزەی لە کانیی بە ساغی ناگەڕێتەوە.**(٢١٦٨)

**هەموو جوانیەك درۆیە، هەر شەرت چاو و برۆیە.**(٢١٦٩)

**هەموو چاشی کەرێکن.**(٢١٧٠)

**هەموو خورپییەك ئاو نییە، هەموو چنراوێك جاو نییە.**(٢١٧١)

**هەمووی دەڵێیت پشقلی بزنێکن.**(٢١٧٢)

**هەموو دەردێك دەرمانی هەیە گەوجی نەبێت.**(٢١٧٣)

**هەموو زەردێك ئاڵتون نییە.**(٢١٧٤)

---

(٢١٦٦) واتە قاڵ بووە و دنیا دیبدەیە.

(٢١٦٧) مرۆڤ چەندین هەڵە بکات، کە تۆبەی کرد واتە پەشیمان دەبێتەوە جێگای متمانەی دەوروبەری و خوای گەورەش لێی وەردەگرێت.

(٢١٦٨) مرۆڤ هەموو جارێك قازانج و سەرکەوتن بە دەست ناهێنێت و ژیان زەرەریشی تێ دەکەوێت.

(٢١٦٩) واتە ئەگەر چاو و برۆ جوان بوو ئەو مرۆڤە بە ناشیرین ناو نابرێت.

(٢١٧٠) بە خێزانێك دەوترێت هەموویان یەك پەروەردە و سروشت بن.

(٢١٧١) هەموو ئاوات و مەبەست و خوازێك بوو کەس نەچۆتە سەر.

(٢١٧٢) بە خێزانێك دەوترێت هەموو منداڵەکانیان لە شێوەدا وەك یەکبن ناشیرین و کورت و ڕەش بن.

(٢١٧٣) واتە خوا دەرمانی بۆ هەموو دەردێك تەرخان کردووە تەنها بۆ خۆ گەوجکردن و خۆ هەڵخەڵەتانن نەبێت.

(٢١٧٤) واتە هەموو جوانێك پەسەند و سەنگین نییە.

هەموو سەرە و ژووریك، سەرە و خوارووبەكی هەیە.(٢١٧٥)
هەموو شت لە باریكیدا دەپچریت، میرد لە قایمیدا.(٢١٧٦)
هەموو شت لە بوون دەكریت.(٢١٧٧)
هەموو شت لە باریكیی دەپچریت، تەنها زولم نەبیت.(٢١٧٨)
هەموو شتیك بە خوی، خویش بە مانا.(٢١٧٩)
هەموو شتیك لە تاما خوشە.(٢١٨٠)
هەموو شتیك بە شانس و ناوچەوانە.(٢١٨١)
هەموو شتیكم لە كوڵە، نورەی زورنا و دەهوڵە.(٢١٨٢)
هەموو كەس هەرزانیی و گرانیی لە ماڵی خویایەتی .(٢١٨٣)

---

(٢١٧٥) هەموو سەركەوتنیكی ژیان كەوتنیكی بەدوادا دیت.
(٢١٧٦) هەموو شتیك لە چروكی و بی هیزیدا كوتایی دیت، میرد لە بەكارهینانی هیزدا ژنەكەی لە دەستی رادەكات و بەجیی دەهیلیت.
(٢١٧٧) كەوابیت لە نەبوونیی هیچ ناكریت.
(٢١٧٨) واتە كەس نایەویت ژەهراوی زولم بچیژیت دەكەویتە بەرهەلستی بو كوتایی پیكهینانی.
(٢١٧٩) واتە هەموو كار و كردەوەیەك لە تاما خوشە، لە تام دەرچوو بە كەس هەرس ناكریت و ناخوریت.
(٢١٨٠) واتە شتی بی تام قیزەونە و دەبیت بریشیتەوە ئەو كەسە.
(٢١٨١) واتە ئەوەی دیتە دنیاوە شتیك لە ناوچەوانی نووسراوە وەكو لە قورئانی پیروزدا دەفەرموویت: (قل لن یصیبنا إلا ما كتب الله لنا)
(٢١٨٢) بە كەسیك دەوتریت ئەركی زور لەسەر بیت كە ئیتر توانای هیچ ئەرك و هیلاكیەكی‌دیكەی نەمابیت كە بو ئەو نەشیت ئیتر.
(٢١٨٣) هەموو كەس دەبیت بوون و نەبوونی خوی بزانیت دەست بەسەر

**هەموو کەس دەزانیت ئاڵی کەچەڵە.**[٢١٨٤]
**هەموو کەس عەیبی خۆی نابینیت.**[٢١٨٥]
**هەموو کەس بەشی خۆی دەزانیت**[٢١٨٦]
**هەموو کەس نانی خۆش دەویت، کەس وەك شوان نایگریت بەسەر دڵیەوە.**[٢١٨٧]
**هەموو کەسێك گۆشت خۆرە هەر ناوی گورگ بەدناوە.**[٢١٨٨]
**هەموو کاتێك عەقڵ میوان نییە.**[٢١٨٩]
**هەموو گیای مردنین.**[٢١٩٠]
**هەموو لەشی پێ دەکەنیت.**[٢١٩١]

---

ماڵی خۆیدا بگریت و ئاگاداری بیت دەست لە نامەرد پان نەکاتەوە.

(٢١٨٤) واتە توخمی کەسێك مەکەون کە هەموو کەسانێك بە خراپی دەزانن و بە ناوبانگە لای عالەم.

(٢١٨٥) سروشت و گونجاندنی مرۆڤ لەگەڵ شێوە و کاروکردەوەی خۆیدا و پاڵ پێوەنانی باری دەرونیشی هەرچی بکات خۆی لێی ڕازییە و لای خۆی پەسەندە.

(٢١٨٦) خوا عەقڵی داوە بە هەموو کەس بە پێی حاڵ بەکاری دەهێنێت.

(٢١٨٧) بە کەسێك دەوترێت زۆر شت خۆشەویست بێت و شتی خۆی بەهەند بگرێت و نەیەڵێت دەست کەس بکەوێت.

(٢١٨٨) واتە هەر کەسێك دەسەڵاتی ببێت دەبێتە ستەمکار و زۆردار.

(٢١٨٩) واتە مرۆڤ جاروبار دەکەوێتە هەڵەوە چەند عاقڵیش بێت.

(٢١٩٠) ئەمە قسەیەکە لە هەموو تەعزییەکدا دەوترێت بۆ سەرەخۆشیی کردن لە کەسی مردووەکە.

(٢١٩١) بە کەسێك دەوترێت بکەوێت بە خۆشییەکدا کەسێتیی خۆی بیربچێتەوە.

**هەموو مامۆستايەك باوكە، هەموو باوكێك مامۆستا نييە.**[2192]
**هەموو ملۆزمێك خوا ملۆزمێكی بۆ دەنێرێت.**[2193]
**هەموو مەلێك هەنجیر خۆر بووایە، هەنجیر بە دارەوە نەدەما.**[2194]
**هەمەوەند نەگبەتی بوو، ئەحەی رابی تاقیب كەری بوو.**[2195]
**هێلكەی ئەمرۆ لە جووجەڵەی سبەینێ باشترە.**[2196]
**هێلكە بێ زەردێنە دەفرۆشێت.**[2197]
**هێلكەی شكاو پینە دەكات.**[2198]

---

(٢١٩٢) بەڵێ هەموو مامۆستايەك ڕۆڵی باوكیش دەبینێت بەڵام هەموو باوكێك ناتوانێت مامۆستا بێت لە وانەیە نەخوێندەوار بێت.
(٢١٩٣) واتە زۆر مرۆڤی شەڕانیی و ئاڵۆز و سەركێش هەیە هیچ كەس دەرەقەتی نایەت و هەموو كەس خۆی لێ دەپارێزێت بەڵام ڕێكەوتی ملۆزمتر دەكات لووتی بشكێنێت.
(٢١٩٤) یەكێك بە یەكێكی دیكە دەڵێت ئەگەر هەموو كەسێك كارمەند و كارزان كار پوخت بووایە ئیش بۆ دوای ئەو نەدەما بیكات.
(٢١٩٥) بە هۆزێكی ئازا و لێهاتوو دەوترێت كە كابرایەكی هیچ و پووچ بكەوێتە ناویانەوە بۆ سیخوڕیی و ئازاردانیان.
(٢١٩٦) چونكە هێلكەی ئەمرۆ لە دەستدایە دەتوانیت سوودی لێوەرگریت، بەڵام مەرج نییە سبەینێ ببێتە جووجەڵە بۆ تۆ.
(٢١٩٧) بە كەسێكی فرت و فێڵاوی ساختەچی كاسب دەوترێت.
(٢١٩٨) بە كەسێكی فرۆشیار دەوترێت فێڵ و كەڵەك و چاوبەست دەكات لە خەڵكیی.

**هێلکە لە مریشکە و مریشك لە هێلکەیە.**[٢١٩٩]
**هێشتا خێر و شەر بەش نەکراوە، گەیشتە سەرم.**[٢٢٠٠]
**هێشتا لە کوێتە، نیوەی ڕێتە.**[٢٢٠١]
**هێشتا کفنەکەی زەرد نەبووە.**[٢٢٠٢]

---

(٢١٩٩) بە کەسێك دەوترێت خێروبەرەکەت و نەوەی چاك بخاتەوە و دووایش هەمووی دەرگای خۆی بگرێتەوە..
(٢٢٠٠) بە کەسێك دەوترێت لە ناوەختدا بچێتە سەر مالان بە میوانیی.
(٢٢٠١) بە کەسێك دەوترێت کە خەم و ئازار بچێژێت بە دەست منداڵەکەی یان بە ڕێکەوت تووشی ساختەچییەك بووبێت. سەرەتای کار و هاوڕێیەتییان بێت.
(٢٢٠٢) بە کوڕێکی بێ وەفا دەوترێت کە باوکی بمرێت دەست بخاتە سامانی باوکییەوە و هەمووی لە ناوببات و کوێری بکاتەوە.

# پیتی (ی)

یا به هیمەت یا بە قیمەت.[٢٢٠٣]
یا به خەربار، یا بە مسقاڵ.[٢٢٠٤]
یا پراغە و دووگی چەورە، لێیدەن لە حەوشی گەورە.[٢٢٠٥]
یا خوا ئەم دەست موحتاجی ئەو دەست نەبێت.[٢٢٠٦]
یاخوا بە دارەکەی قەراغ بێت.[٢٢٠٧]
یاخوا پیر و خەڕۆ بن.[٢٢٠٨]

---

(٢٢٠٣) بە زۆری لە ڕێکەوتنی کچ خواستن یان گۆڕینەوی شتێکدا دەوترێت بە مانای یان بەخشین یان نرخێکی بۆ دانرێت.
(٢٢٠٤) بە کەسێك دەوترێت یان بەبێ سنوور دەبەخشێت یان زۆر دەست دەگرێتەوە و هیچی لە دەست نابێتەوە.
(٢٢٠٥) واتە هەموو گەرەکێك حەوشەیەکی گەورەی هەبووە و شایی و هەڵپەڕکێیان تیایدا جێبەجێ کردووە و چێشت و نانی زۆریان تیایدا ئامادە کردووە هەموو کەسێك بۆی هەبووە بەشدار بێت لە گەڵیان.
(٢٢٠٦) ئەوە نزایەکی باشە، کەس پێویستی بە کەس نەبێت، هەموو کەس خۆی هەیبێت .
(٢٢٠٧) واتە نەوە و وەچەی چاك بخاتەوە و خەڵکیی لە ژێر سایە و سێبەریدا بحەسێتەوە و ناونیشانی لە دنیادا دەنگ بداتەوە.
(٢٢٠٨) واتە تەمەن بە خۆشی بەرنە سەر (بە بووك و زاوا دەوترێت).

**یاخوا تونچی نەبێت نەبێت بە حەمامچی.**[٢٢٠٩]
**یاخوا سوالکەر نەبێت نەبێت بە شت.**[٢٢١٠]
**یا گاڵ دێتت یا پەموو.**[٢٢١١]
**یان لە منداڵ یان لە شێت.**[٢٢١٢]
**یا لەگەڵ دایکی منداڵان، یا لەگەڵ بووکی گەورە ماڵان.**[٢٢١٣]
**یەکەم بەخت و یەکەم تەخت.**[٢٢١٤]
**یەکێك بە گەورەیی فێری پڵاوخواردن بێت، دەست بۆ لووتی دەبات.**[٢٢١٥]
**یەك پارچە ڕۆحی منیت.**[٢٢١٦]
**یەکێك پۆڵا، یەکێك ئاسن، هەتا هەن یەکتر ناناسن.**[٢٢١٧]

---

(٢٢٠٩) واتە مرۆڤی کەم و نانەجیب نەبێتە جێگری پیاوی گەورە.
(٢٢١٠) واتە مرۆڤی نەبوو بێ دەرامەت کە دەوڵەمەند بوو خۆی لێ دەگۆڕێت و دەبێتە خاوەنی دەعیە و فیز و خۆهەڵکێش دەردەچێت.
(٢٢١١) بە هەنگاوێك دەوترێت لە پرۆژەیەکدا نەزانرێت ئەنجامی چییە.
(٢٢١٢) تەنها ئەو دووانە درۆ ناکەن.
(٢٢١٣) واتە دایکی منداڵ و بووکی گەورە ماڵان بنەی ماڵیان گرتووە و زۆر ناچنە دەرەوە، میوانداریتییان خۆشە.
(٢٢١٤) بە ئافرەتێك دەوترێت ئەگەر یەکەم شوو بەخت نەهێنێت شێر بە گوێ بگرێت لای کەس نانوێنێت.
(٢٢١٥) واتە هەموو کارێك مرۆڤ لە منداڵییەوە فێر بێت و لەگەڵی ڕابێت چاکترە، چونکە دەقی پێوە دەگرێت و ئاساییە لە گەورە بوونیدا.
(٢٢١٦) کەسێك بە کەسێکی دیکە دەڵێت کە بە قەد ڕۆحی خۆشی بوێت.
(٢٢١٧) ئەگەر دوو کەس ژیانیان پەیوەند بێت بەیەکەوە نابێت توندوتیژ بن

**یەکجار دەڵێین ئاڵی کەچەڵە.** (۲۲۱۸)
**یەکێك خانووی لە شووشە بێت، بەرد نەگرێتە ماڵی کەس.** (۲۲۱۹)
**یەکساڵە دووساڵە دەخلەتێنێت.** (۲۲۲۰)
**یەك شەویلەی قنگ قەویلە.** (۲۲۲۱)
**یەك کەمە، دوو خەمە، سێ خاتر چەمە.** (۲۲۲۲)
**یەك لە مردن بوو، یەك لە تیکەگرتن بوو.** (۲۲۲۳)
**یەك و دووی لێ مەکە.** (۲۲۲٤)
**یەك یەك دەخات، یەك یەك دەخوات.** (۲۲۲٥)

---

بەڵکو دەبێت نەرم و نیان بن و ڕۆحی لێخۆشبوونیان هەبێت.
(۲۲۱۸) واتە کەسێك ناسرا و ناوبانگی پیاوخراپی دەرکرد دەبێت هەموو کەس خۆی لێ بپارێزێت.
(۲۲۱۹) واتە ئەگەر خۆت خاوەنی حورمەت و کچ و کوڕ و خێزان بیت، توانج و قسەی ناشیرین و ناپەسەند مەگرە خەڵکیی. دوایش بە تۆش دەوترێت.
(۲۲۲۰) بە هەرزەکارێك دەوترێت کە بیەوێت پیاوێکی عاقڵ و بە تەمەن هەڵخەڵەتێنێت.
(۲۲۲۱) ئەمە بەو کەسانە دەوترێت پێشوەخت منداڵیان دەبێت.
(۲۲۲۲) ئەوانەی یەك منداڵیان هەیە دەترسن بمرێت و بۆیان نەمێنێت و ئەوەی دوو منداڵی هەیە زۆر هیلاکن بە دەستیانەوە.
(۲۲۲۳) واتە کەس ئازاری کەس هەڵناگرێت و هەریەك بۆخۆی دەژی و دەمرێت و یان پەلەی خواردن و کڕینێتی.
(۲۲۲٤) واتە کاری خێر زوو ڕاپەڕێنە.
(۲۲۲٥) بە خێزان یان کۆمەڵێکی هەڵوەشاو دەوترێت هەوڵی کەوتنی یەکتر بدەن و یەکتر بکوژن.

# زنجیرەی چاپكراوەكانی ساڵی (٢٠١١)ی

# بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوكردنەوەی سلێمانی

| ژ | ناوی كتێب | ناوی نووسەر | بابەت | زنجیرە |
|---|---|---|---|---|
| ١ | دەروازەیەك بۆ تەكنەلۆژیای نانۆ | محەمەد ساڵح فەرەج دوكانی | زانستیی | ٧٧١ |
| ٢ | سروود و گۆرانیی نیشتیمانیی و بەرەنگاریی كوردی لە كرمانجی خواروودا(١٩٣٥-١٩٩١) | عەبدولواحید ئیدریس شەریف | لێكۆڵینەوە | ٧٧٢ |
| ٣ | سێبەری تلیاك | لوقمان سیوەیلی | لێكۆڵینەوە | ٧٧٣ |
| ٤ | مانشێت لە رۆژنامەوانیی كوردی و كاریگەرییەكانی (حیزبی و ئەهلی) | محەمەد مێرگەسۆری | لێكۆڵینەوە | ٧٧٤ |
| ٥ | درامایەك لە پاركێكدا | و. عەبدوڵڵا قادر (دانساز) | چیرۆك | ٧٩١ |
| ٦ | پاراستنی دەم و ددان | د. هەڵگورد ساڵح | تەندروستی | ٧٧٦ |
| ٧ | وێنەیەكی دەگمەنی فرانز كافكا | و. ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل | چیرۆك | ٧٧٧ |
| ٨ | باڵندەكانی شەو | ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی | چیرۆك | ٧٧٨ |
| ٩ | منارەی ئاوەدانیی | كاروان كاكە سور | چیرۆك | ٧٧٩ |
| ١٠ | هونەر و فیگەرە جوانەكانی خەون | ناڵە حەسەن | لێكۆڵینەوە | ٧٨٠ |
| ١١ | بیبلۆگرافیای گۆڤاری هەنار | مارف ناسراو | بیبلۆگرافیا | ٧٨١ |
| ١٢ | چەند نووسینێكی ئەكادیمی كۆمەڵناسیی لەسەر هەوییەی كورد | سیاوەش گۆدەرزی | لێكۆڵینەوەی كۆمەڵناسی | ٧٨٢ |

| ١٣ | مێژووی گریان | سەلاح حەسەن پاڵەوان | لێکۆڵینەوە | ٧٨٣ |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| ١٤ | روانین لە دەق | د. تاهیر محەمەد عەلی<br>د.قومری سەعید<br>عەزیز | لێکۆڵینەوە | ٧٨٤ |
| ١٥ | عاشقێك گۆرانی دەڵێت | لەتیف فاتیح فەرەج | شیعر | ٧٨٥ |
| ١٦ | دەروازەکە | و. عەلی حسێنی | شیعر | ٧٨٦ |
| ١٧ | پەیکەرێك لە تۆزی دەباشیر | جەبار جەمال غەریب | رۆمان | ٧٨٧ |
| ١٨ | شلۆمۆکوردە و من و رۆژگار | و. جەلیل کاکەوەیس | رۆمان | ٧٨٨ |
| ١٩ | کێشەی زمانی ستانداردی کوردی | عەلی سدیق | دیدار | ٧٨٩ |
| ٢٠ | گفتوگۆ | و. شۆڕش محەمەد | دیدار | ٧٩٠ |
| ٢١ | کەرەستەی گەندەڵیی | رەسوڵ بۆسکێنی | لێکۆڵینەوە | ٧٧٥ |
| ٢٢ | دمیان | و. عیسا چیایی | رۆمان | ٧٩١ |
| ٢٣ | نزای بەرخەکان | و. رەفعەت موڕادی | رۆمان | ٧٩٢ |
| ٢٤ | هاوشێوەکانی سەلیم جەوودەت | مەحمود نەجمەدین | کۆمەڵە<br>چیرۆك | ٧٩٣ |
| ٢٥ | پەراوێزی بیرکردنەوە | رەزا عەلی پوور | وتار | ٧٩٤ |
| ٢٦ | ئابشوران | و. مەجید ساڵح | چیرۆك | ٧٩٥ |
| ٢٧ | ڕموزنبوون | و. پێشەوا فەتاح | رۆمان | ٧٩٦ |
| ٢٨ | "گونتەر گراس" پێنج باڵندەکەو<br>چەند چیرۆکێکی دیکەی ئەڵمانی | و. دڵنیا عەبدوڵلا | چیرۆك | ٧٩٧ |
| ٢٩ | یەشار کەمال سەبارەت بەخۆی<br>دەدوێت | و. بەکر شوانی | دیدار | ٧٩٨ |
| ٣٠ | گیلۆتین | و. سامان عەلی<br>حامید | لێکۆڵینەوە | ٧٩٩ |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٣١ | بازرگانییەکی کوشندە | و. محەمەد عەبدوللا | کۆمەڵە چیرۆک | ٨٠٠ |
| ٣٢ | دواین ئێوارە | کوێستان عومەر زادە | شیعر | ٨٠١ |
| ٣٣ | باڵانسی ژن لە نێو کاریزمای نووسیندا | شیرین تاهیر | وتار | ٨٠٢ |
| ٣٤ | پرانسیپەکانی ئەدەبناسیی بەراورد | و. د. ئەنوەر قادر محەمەد | لێکۆڵینەوە | ٨٠٣ |
| ٣٥ | دەروازەیەك بۆ رێنمایی دەروونی و پەروەردەیی | نازەنین عوسمان محەمەد | لێکۆڵینەوە | ٨٠٤ |
| ٣٦ | هەڵەبجە زنجیرە لێکۆڵینەوەیەکی مێژووییە | عادل سدیق عەلی | لێکۆڵینەوە | ٨٠٥ |
| ٣٧ | مەحوی لە نێوان حەزی دنیایی و عیشقی خوداییدا | عەتا قەرەداخی | لێکۆڵینەوە | ٨٠٦ |
| ٣٨ | مێژووی چاپخانە لە شاری کەرکوك و رۆڵی محەمەد ئەمین عەسری لە پێشکەوتنیدا | هەڵۆ کاکە وەیس | لێکۆڵینەوە | ٨٠٧ |
| ٣٩ | سانسۆری رۆژنامەگەریی لە هەرێمی کوردستاندا | کارزان محەمەد | لێکۆڵینەوە | ٨٠٨ |
| ٤٠ | تێکستی ژنان لە دەفتەرەکانی یارساندا | نامق هەورامی | لێکۆڵینەوە | ٨٠٩ |
| ٤١ | لەسەر شاباڵی دەریا دەنووسم | پەری شێخ ساڵح | شیعر | ٨١٠ |
| ٤٢ | منیش چێ گیڤارام | و. دلاوەر قەرەداغی | چیرۆک | ٨١١ |
| ٤٣ | یادگیری زبان کردی قدم به قدم | عدنان عبدالرحمان سجادی | زمان | ٨١٢ |
| ٤٤ | ئەستێرە گەشەکان... سی و دوو خوێندنەوە بۆ سی و دوو فیلمی سینەمایی | سیروان رەحیم | خوێندنەوەی فیلم | ٨٢٠ |

| ٤٥ | کەشکۆڵی زانست و تەکنیك | جەمال محەمەد ئەمین | زانستی | ٨١٤ |
|---|---|---|---|---|
| ٤٦ | دەرکەوتەی دڵخوازی مەرگ | سەعید سلەیمانی | لێکۆڵینەوە | ٨١٥ |
| ٤٧ | سیماو خەسڵەتی کارەکتەر لە کورتەچیرۆکی کوردی نێوان ١٩٢٥-١٩٥٠ دا | د. مەریوانی عومەر دەوڵەت | لێکۆڵینەوە | ٨١٦ |
| ٤٨ | تێڕوانینێکی نوێ بۆ سینۆنیم لە زمانی کوردیدا | شیروان حسەین حەمەد | لێکۆڵینەوە | ٨١٧ |
| ٤٩ | مەم و زین | تەڵعەت سامان | شانۆگەری | ٨١٨ |
| ٥٠ | چوونە ناو سوری مانا | تەڵعەت تاهیر | کۆمەڵە وتار | ٨١٩ |
| ٥١ | کۆمەڵێك پەند و ئیدیۆمی کوردی | زەکیە رەشید محەمەد | کەلەپوور | ٨١٣ |